چاپی دەیەم

پڕفرۆشترین کتێبی ساڵی ٢٠٢٣

# مەملەکەتی شەیتان

کتێبی دووەم

ماکوان کەریم





بسم الله الرحمن الرحیم

# مەملەکەتی شەیتان

## کتێبی دووەم

نووسین: ماکوان کەریم

پێداچونەوە و خاڵبەندی: شەوبۆ جەلال



کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی

بەڕێوەبەری گشتی: موحەممەد خضر ئەحمەد 07824671394 - 07504671394

بەڕێوەبەری هونەری: موستەفا موحەممەد کوردی 07509998182

فەیسبووک: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی/ M.Ktebxana

ئینستگرام: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی/ M.Ktebxana

لقی یەکەم: بەرانبەر دەرگای قەڵا - بازاڕی ڕۆشنبیری

لقی دووەم: چوارڕیانی شێخ مەحمود - بەرانبەر مزگەوتی مەحمود عەلاف

ئیمێل: mdmaktaba@gmail.com

نەخشەسازی ناوەوە: موستەفا موحەممەد کوردی

نەخشەسازی بەرگ: توانا ئەحمەد

چاپی دەیەم: ٢٠٢٤

پێوانە: ١٤*٢١

تیراژ: ١٥٠٠

لاپەڕە: ٣٥٨

لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان

ژمارە سپاردنی (١٨٨٤)ی ساڵی (٢٠١٦) پێدراوە

پڕفرۆشترین کتێبی ساڵی ٢٠٢٣

کتێبی ژمارە (١٤) لە بڵاوکراوەکانی بزاڤی نوێ

# مەملەکەتی شەیتان

## کتێبی دووەم

نووسینی:
ماکوان کەریم

چاپی دەیەم:
٢٠٢٤

ویستن بەتەنهایی هیچ کارێکت بۆ ناباتە پێشەوە
ویستن دەبێت لەگەڵیدا هەنگاو هەڵبێنیتەوە

## بەناوی خوای کارزان و کاربەجێ

بسم الله الذي لا يضر مع اسمه شيء في الأرض ولا في السماء وهو السميع العليم أللهم صل و سلم و بارك على سيدنا محمد رسول الله و على آله و صحبه أجمعين

## پێشەکی:

ئەم ڕووداوانەی کە لە شـێوەی نۆڤێل دا نووسراوەتەوە کار لەسـەر چوار تەوەری سیحر و جادوو دەکات، ئەوانیش ئەوانەن کە چۆن بزانین سیحرمان لێکراوە و چۆن ئەیدۆزینەوە و خۆمانی لێ ڕزگار دەکەین.

## جادووی یەکەم:

هەر کات ئافرەتێك چووە چێشـتخانەی ماڵەکەی و هەسـتی بە تەمەڵی و لاشـەی لاواز کردو زەوقی نەبوو لەگەڵ خواردن دروسـت کردنـدا، دوای دروستکردنی چێشـت ونانەکەی، بۆماوەی ڕۆژێك تا سـی ڕۆژ لەسەر جێگادا دەمێنێتەوە و ماندوو دەبێیت، ئەشـێت لەگەڵ ئەم حاڵەتەدا جۆرە کرم و قالۆنچەیەکی زۆر ببینرێت، یاخود شارە مێرولە لەناو چێشتخانەکەدا هەبێت، ئەمەش بەڵگەیە لە سەر بوونی سیحر.



## جادووی دووەم

زیاتر لە پیاو ڕوو ئەدات لە ناو ماڵەکەی خۆیدا ژیانی قورسـەو زۆر نائارامەو هەست بە دڵ تەنگی دەکات، بەهیچ شێوەیەك حەز بە هاتنەوەی ناکات بۆ ماڵەکەی خۆی. پێچەوانەکەشـی ئەوەیە لەدەرەوەی ماڵی خۆیدا زۆر ئارام و لە خۆشـی و شادیدایە وەك ئەوە وایە هیچ ڕووی نەدابێت، ئەمەش جۆرێکی ترە لە جادووی جادووبازان، بۆ ئافرەتیشە بە هەمان شێوە واتا لە ماڵی خۆیدا هەمیشە لە خەمۆکی و کەئابەو نارەحەتیدایە، هەموو ماڵەکە بەچواردەوریدا دەسـوڕێتەوە، لەدەرەوەی ئەوماڵەی کەتێیدا نیشـتە جێیە هیچ خەمۆکییەك تووشی نابێت و زۆر ئاسایی و دڵخۆشە.

## جادووی سێیەم

لە وڵاتی ئێمەدا کەم ڕووئەدات، مەگەر جادووباز و سـاحیرە ئێرانییەکان بیکەن، ئەویش ئەوەیە لە ناو خانەوادەکەتدا شـتی سـەیر و سـەمەرە ڕووئەدات، لەپڕ تارماییەك دەبینی ڕادەکات، دەنگی قابلەمە و قاپ وقاچاخ دێـت یـان مـاڵ پـاك دەکەیتەوە و مـاڵەکەت پیس دەبێتەوە، یـاخود جلی ماڵەکەت هەڵ دەڕێژرێت، ناتوانیت ماڵەکەت کۆکەیتەوە هەمیشـە پەرشـو بڵاوە.

## جادووی چوارەم

کاتی گەڕانەوەت بۆ ناو ماڵەکەت هەسـت بە بۆنی ناخۆش دەکەیت، یاخود لە پڕ بۆنی دووکەڵ یان سـووتاوی دێت و بەپەلە رادەکەیت تەماشـای

ژوورەکان و غازو بۆری نەوت و زۆپاو..هتد دەکەیت هیچ ڕووی نەداوە یاخود لە ژوورێکدا دەخەویت هەمیشە خەوی ناخۆش دەبینیت کە جێگاکەت دەگۆڕیت هیچ کێشەت نامنێت، یاخود ژوورەکە دەگۆڕیت ئاسایی دەبێتەوە، ئەوەش مانای وایە سیحر لەو ماڵە کراوە.

جا بۆ ئەوەی خوێنەر تووشی ترس و دڵە ڕاوکێ نەبێت، لەدوای خوێندنەوەی پێشەکی و جۆرەکانی سیحر، بۆیە لێرەدا چارەسەریش باس دەکەین تا تۆی خوێنەر ئەگەر هاتوو، نیشانەکانی سیحر وجادوو کە لەسەرەوە ئاماژەمان پێداوە بینی لەخۆت یاخود یەکێك لە نزیکان و ئەندامانی خێزانەکەت بتوانیت خۆت سیحرەکە بەتاڵ بکەیتەوە، ئەویش بە خوێندنی ئایەتەکانی بەتاڵ کردنەوەی سیحر.

سورەتی ئەعراف[الأعراف]:

﴿۞وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ أَلْقِ عَصَاكَ ۖ فَإِذَا هِىَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ ﴿١١٧﴾ فَوَقَعَ ٱلْحَقُّ وَبَطَلَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١١٨﴾ فَغُلِبُوا۟ هُنَالِكَ وَٱنقَلَبُوا۟ صَٰغِرِينَ ﴿١١٩﴾ وَأُلْقِىَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ ﴿١٢٠﴾﴾ [الأعراف]

ئێمەش نیگامان نارد بۆ موسا کە دارعەساکەت فڕێ بدە، جا دەستبەجێ (هەر کە فڕێیدا) ئەو فڕو فێڵەی کە دەیانکرد هەمووی هەڵلووشی﴿١١٧﴾.ئەوسا ئیتر حەق چەسپاو دەرکەوت و پووچەڵیش بووەوە ئەوەی ئەوان دەیانکرد﴿١١٨﴾.ئیتر لەو گۆڕەپانەدا (فیرعەون و دارودەستەکەی) شکستیان پێهێنراو بەسەر شۆڕیی و شەرمەزاری گەڕانەوە﴿١١٩﴾. (کاتێک دڵنیابوون ئەوە

موعجیزەیەو لەدەسەڵاتی ئادەمیزادا نیە) جادووگەران خران بهڕوودا سوژدەبەر بوون بۆ خوا﴿١٢٠﴾.

سوڕەتی یونس[یونس]

﴿وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ ٱئۡتُونِي بِكُلِّ سَٰحِرٍ عَلِيمٖ﴿٧٩﴾ فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ قَالَ لَهُم مُّوسَىٰٓ أَلۡقُواْ مَآ أَنتُم مُّلۡقُونَ﴿٨٠﴾ فَلَمَّآ أَلۡقَوۡاْ قَالَ مُوسَىٰ مَا جِئۡتُم بِهِ ٱلسِّحۡرُۖ إِنَّ ٱللَّهَ سَيُبۡطِلُهُۥٓ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُصۡلِحُ عَمَلَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ﴿٨١﴾ وَيُحِقُّ ٱللَّهُ ٱلۡحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُجۡرِمُونَ﴿٨٢﴾﴾ [یونس]

(ئینجا فیرعەون فەرمانیداو) وتی: ئادەی هەرچی جادووگەری زاناو شارەزا هەیە بۆم بێنن و بۆم کۆ بکەنەوە﴿٧٩﴾.کاتێ کە جادووگەران هاتن و (بڕیاردرا جادوگەریی خۆیان بنوێنن و (معجزة)ی حەزرەتی موسا بەتاڵ بکەنەوە) موسا پێی وتن: دەی چیتان هەیە بیخەنە ڕوو﴿٨٠﴾! ئەوسا (جادووگەران، جادووی خۆیان نواند) موسا وتی هەرچی کردوتانە و نیشانی ئەو خەڵکەتان داوە هەمووی جادووە و هیچی تر، بێگومان خوا دوای تاوێکی تر پووچی دەکاتەوە، بەڕاستی خوا کردەوەی خراپەکاران چاک و سەرکەوتوو ناکات﴿٨١﴾.بەڵکو خوا حەق و ڕاستی دەچەسپێنێت بە فەرمان و ویستی خۆی هەرچەندە تاوانکارو تاوانباران پێیان ناخۆش بێت﴿٨٢﴾.

لە کۆتاییدا سورەتی طه[طه]

{قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ إِمَّآ أَن تُلۡقِيَ وَإِمَّآ أَن نَّكُونَ أَوَّلَ مَنۡ أَلۡقَىٰ ﴿٦٥﴾ قَالَ بَلۡ أَلۡقُواْۖ فَإِذَا
حِبَالُهُمۡ وَعِصِيُّهُمۡ يُخَيَّلُ إِلَيۡهِ مِن سِحۡرِهِمۡ أَنَّهَا تَسۡعَىٰ ﴿٦٦﴾ فَأَوۡجَسَ فِي نَفۡسِهِۦ
خِيفَةٗ مُّوسَىٰ ﴿٦٧﴾ قُلۡنَا لَا تَخَفۡ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡأَعۡلَىٰ ﴿٦٨﴾ وَأَلۡقِ مَا فِي يَمِينِكَ تَلۡقَفۡ مَا
صَنَعُوٓاْۖ إِنَّمَا صَنَعُواْ كَيۡدُ سَٰحِرٖۖ وَلَا يُفۡلِحُ ٱلسَّاحِرُ حَيۡثُ أَتَىٰ ﴿٦٩﴾} [طه]

(ئەوسا جادووگەران) وتیان: ئەی موسا یا تۆ دەستبەکاربەو (گۆچانی خۆت فڕێ بدە) یا ئێمە سەرەتا دەست پێ دەکەین﴿٦٥﴾؟ (موسا) وتی: (نەخێر) ئێوە دەست پێ بکەن، (کە دەستیان پێ کرد) پەت و گوریس و گۆچانەکان لەبەرچاویان کەوتنە جووڵە (وەک مار) ﴿٦٦﴾.موسا لەدڵی خۆیدا (کەمێك) ترس دایگرت﴿٦٧﴾. (نیگامان بۆ کردو) وتمان: مەترسەو دڵنیابە کە هەر تۆ بەرزو بڵندو سەرکەوتوو دەبی﴿٦٨﴾.ئەوەی کە لە دەستی ڕاستایە (واتە گۆچانەکەت) فڕێی بدە، هەرچی ئەوانە کردوویانە دەیماشێتەوەو قوتی دەدات، چونکە ئەوەی کە کردوویانە فێڵ و تەڵەکەی جادووگەرە، جادووگەریش بۆ هەرکوێ بچێت و (هەرچی بکات) سەرکەوتوو نابێت﴿٦٩﴾.

ئەگەر کرا بە ئاو بپرژێنە بە ماڵەکەدا و بەو ژورانەی کە گومانی سیحری لێدەکرێت بە پشتیوانی خوا، بە ئەمری پەروەردگار بە تاڵ دەبێتەوە.

ئەمە پوختەیەك بوو لە کتێبی دووەمی مەملەکەتی شەیتان.

جێگای خۆشییەتی لێرەوە سوپاسی ئەو ستافە بەڕێزە بکەم کە هاوکارم بوون لەکاتی لە چاپدانو کۆکردنەوەو بڵاوکردنەوەو دیزاینی، بەتایبەت کاك

جوتیارو بنەماڵە بەڕێزەکەیان‌و کاک ســـەردار، کاک ڕێکان، کاک ڕێباز، کاک حەیدەر و کاک کۆویست، کاک فەرمایش.

هەروەها لەسـەر ئەرکی خوشـکی بەڕێزمان هەتاو عادل گۆران لە چاپدراوە، خوای گەورە بیخاتە سەر تەرازووی چاکەکانی.

پاییزی ٢٠١٨

فرێدریکستاد - نەرویج

ماکوان کەریم

## سەرەتایەکی ترسناك

دوای ئەوەی ماوەیەکی زۆر ئارام بوبوومەوە لەو بارە گرژییەی کە بۆم دروست بوبوو لەلایەن حەزقیل و سەسیل و بنەماڵەی کاك عەبدوڵا و ئەو هەموو ناڕەحەتی و کارەساتەی کە بینیم و بەسەرمدا هات لە مردنی هێرۆ و کاك مستەفا، هەروەها ئازاردانی خۆم و ڕفاندنی حەزقیل کە تا ئەم کاتەش نازانم لە کوێیە.

ئەوەندە نەبێت کە سەسیل وتی: حەزقیل لەلایەن ئەوانەوە لە ناو براوە!

لەڕاستیدا زۆر بڕوام بە قسەی سەسیل نییە، چونکە وەك پێشتریش ئاماژەم پێدابوو سروشتی جنۆکە وایە کە زۆر درۆزنن، ئەوەی ڕاستی بێت نایڵێن، عەلی یەمەنی ئەوەی بۆ باس کردبووم!

ماوەیەکی زۆر بوو هیچ دەنگوباسیان نەبوو، بەردەوام بووم لە ژیانی ئاسایی خۆم، لەپڕ لەلایەن عەبدوڵا هەولێری و ئازیزەوە پەیوەندیم پێوە کرا.

عەبدوڵا هەولێری وتی: برا دێین بۆ ماڵتان.

ماکوان: یاخوا بەخێربێن.

کە هاتن ژنێکی خەڵکی کەرکوکیان لەگەڵدا بوو، ناوی ڕوناك بوو.

دوای دانیشـــتن و قســـە کردن کاکە عەبەی هەولێری کەوتە قســـە و وتی: ماکوانی برام ئەم ئافرەتە تووشـــی کێشـــەیەك بووە بەڵکو بۆی چارەســـەر بکەیت.

وامزانی باســـی طەڵاق و جیابوونەوەیە کارێکی کۆمەڵایەتییە، بەڵام وانەبوو. عەبـدوڵا کەوتە قســـە کردن بـاش نەیـدەزانی بیگێڕێتەوە، بۆیە ڕووی کردە ڕوناك خان وتی: خۆت بۆی باس بکە!

ڕوناك خان باسی شتێکی زۆر سەیری کرد!

باسـی ئەوەی کرد کە خاوەنی چوار منداڵە، منداڵەکانی لە کوردسـتان بوون و پۆلیسی نەرویجی بۆی هێناوەتەوە بۆ نەرویج!

ماکوان: ئەی هاوسەرەکەت؟

ڕونـاك: جیـابووینەتەوە و لە کەرکوکە نەهـاتۆتەوە، لایەنی دەروونی ئەویش تەواو نییە.

ماکوان: لەسەر چی جیابوونەتەوە؟

ڕونـاك: لەدوای ئەوەی بڕیـارمـانـدا بگەڕێینەوە کوردســـتـان، هەســـتم کرد کەواخەسووم خۆشحاڵنەبوو بەبوونی ئێمە لەوێ، چونکە خانویەکمان هەبوو پێشتر خەسوومی تێدا دەژیا لە قاتی یەکەم و قاتی دووەمیش درا بوو بەکرێ، ئەو پارەکەی وەردەگرت و مەسروفی خۆی پێدەکرد.

دوای ماوەیەك لەگەڕانەوەمان بۆ کوردســتان، ژیانی ئاســاییمان بەڕێدەکرد. ئاگام لێبوو خەسووم شتی زۆر سەیری دەکرد و خوێنی مریشکی دەگرت و دەیکرد بە حەوشەو دەرگاکەدا و هەمیشە ئێسقانی حەیوان و مریشکی بڵاودەکردەوە، زۆر پیس و چەپەڵی بڵاودەکردەوە.

لەبەر دڵی هاوسەرەکەشم هیچم نەدەوت، هەرچی جارە حەوشە و خوێن و پیسییەکانم پاك دەکردەوە، بەلام خەسووم توڕە دەبوو لێم ودەیووت بۆ لایان دەبەیت؟

ئەوە بۆ هاوڕێکانم داناوە!

ڕۆژێك بەهاوسەرەکەمم وت کەوا دایکت شتێکی وادەکات.

هاوسەرەکەم چوبوو پێی وتبو.

دایکی لە وەڵامدا پێی وتبوو ئەوە بۆ سەید و پیاوچاکەکانە خێر دەکەم.

سەڵاحی هاوسەرم: وتی واز لە دایکم بێنە ژنێکی سادەیە، ئەوە خێرە دەیکات با دڵی نەشکێنین.منیش لەبەر دڵی سەڵاح هیچم نەووت.

کچە گەورەکەم تەمەنی ١٩ ساڵە، شەوێکیان هاواری کرد وتی: دایکە فریامکەوە خەریکە دەمخنکێنن، بەپەلە من و باوکی چووینە سەری تەماشامان کرد هیچ نییە. دوای ئەوەی کە ئارامیمان کردەوە هاتینەوە ژووری خۆمان.

لەو ژوورەی کچەکەمی لێ بوو دوو خوشکەکەی لەگەڵی بوون، بەتەنها نەبوو لە ژوورەکە.

کەمێکی تری پێچوو دیســـان کچە گەورەکەم هاواری کرد دایکە باوکە فریام کەون خنکام، وامزانی شـــەڕیانە لەگەڵ خوشـــکەکانی تریدا کەچوون گلۆپ هەڵکرابوو هەردوو خوشکەکەی تریشی بەدیارییەوە دانیشتبوون.

باوکی وتی با بە پەلە بیبەین بۆ نەخۆشخانە.

کچەکەم ناوی ڕۆشنایە، هەرچی لێم پرسی ڕۆشنا چییە؟ چی بووە کچم؟

لەوەڵامدا وتی: دایە نابینی ئەو ژنە چۆن قژی لەملم ئاڵاندووە و خەریکە دەمخنکێنیت!

ئێمەش هیچمان نەدەبینی، بە سەڵاح م وت بابیبەینە نەخۆشخانە.

ســەڵاح: باشــە با بیبەین، بەڵام بڵێین چییەتی! چیان پێ بڵێین لەوێ، باشــترە چاوەڕێ بکەین.

منیش قســـەکەیم بەهەند وەرگرت، ئەو شـــەوە خۆم چوومە لای کچەکەم خەوتوم وەك ســـەرمای بێت هەڵدەلەرزی. زۆر بەزەییم پێداهاتەوە، بەڵام بۆ بەیانی ئاسایی بوویەوە.

پاش چەند ڕۆژێك لەو ڕووداوە میوانمان هات، منیش خەریکی چا تێکردن بووم، لەپڕ لەبەردەممدا پیرێژنێکی پرچ ڕەشی باڵا بەرزی زۆر ناشیرین سەری ئەیدا لە سەقفیماڵەکەمان لەبەردەممدا بوو، یاری بە قژی دەکرد.

دەستم کرد بەهاوار کردن و وتم ئەها ئەوەتا، ئێوەش دەیبینن؟

سەڵاح هات لەجیاتی ئەوەی هاوکاریم بکات کەچی زللەیەکی لێدام و بێهۆش بووم بردبوویانم بۆ نەخۆشخانە.

لەدوای ئەو ڕووداوە ژیانم لێ تاڵ بوو، تووشی نارەحەتی و سەرئێشەو هەرکات بچوومایەتەوە ماڵی خۆمان ئەو ژنە لەوێ بوو. منداڵەکانیشم بەتایبەت کچە گەورەکەم وەك منی لێهاتبوو.

باوکیشیان ئازاری کچەکانی ئەدا بەتایبەت گەورەکەم، ئەی وت تۆ وەك دایکت شێتی.

ماڵم بەجێ هێشت و بە سەڵاحم ووت: نایەمەوە بەو ماڵەدا یان تەڵاقم بدە یان با بگەڕێینەوە بۆ نەرویج. نەمدەتوانی لەوێ بژیم ئەو ژنە لە هەموو سوچێکی ژوورەکاندا ئامادەبوو، جاری واهەبوو دەبوورامەوە یان خۆم پیس دەکرد. کاك ماکوان ئیتر با زیاتر سەرت نەیەشێنم ئەوە گوزەرانم بوو.

سەڵاح تەڵاقی دام، منیش گەڕامەوە بۆ نەرویج، لێرە پەیوەندیم بە پۆلیسەوە کرد و وتم کەلە هاوسەرەکەم جیابوومەتەوەو مناڵەکانم لای باوکیانە و باوکیان زۆر ئازاریان دەدات. لێرەوە پۆلیسی نەرویجی چووبون بە نهێنی قسەیان لەگەڵ منداڵەکانم کردبوون و هێنانیانەوە، بەڵام ئەو سەرئێشەو بوورانەوەیەم لەگەڵدایە زۆر وەزعم خراپە.

ئازیزو کاك عەبدوڵا باسی جەنابتیان کردووە لەگەڵ کوڕێکی یەمەنی ناوی عەلییە، خێرتان دەگات بەڵکو هاوکاریمان بکەن.

ماکوان: ڕوناك خان ئەوەی بە من بکرێت لەخزمەتاندام، بەڵام من نازانم عەلیم بۆ ئەدۆزرێتەوە ئێستا.

هەوڵ ئەدەم پەیوەندی پێوە بکەم بزانم چی دەڵێت.

تەلەفونم کرد بۆ یەمەن بۆ ژمارەکە عەلی، وەڵام درایەوە بەڵام خێزانەکەی بوو. بەنەرویجی قسەم لەگەڵ کرد وتم: دەمەوێت قسە لەگەڵ علی بکەم.

وتی: فرۆکەی سـعودی بۆردومانی کردووە، عەلی بریندارە و برینەکەی زۆر سەختە، عەلی لەسەرەمەرگدایە دوعای بۆ بکە!

بەتەواوەتی خەفەت دایگرتم بە جۆرێك کە نەمتوانی وەڵامی ئەوان بدەمەوە تا چەند خولەکێك، لەدڵی خۆمدا وتم ئەوەی پێم دەکرێت بۆ ئەم ژنە دەیکەم.

ڕووم کردە ڕوناك خان و پێم وت: بەنیسـبەتی سـەرئێشـەو بوورانەوەکەت ئەگەر هۆکارەکەی سـیحرو جادووی جنۆکە بێت چارەسـەر دەبێت. هەوڵ بدەن خۆت و کچەکەت لێرە ئامادە بن لەکاتیکدا کە نوێژتان لەسـەرە واتە (لەعادەتی مانگانەدا) نەبن، بەڵام لەگەڵ مەحرەمی خۆتاندا.

ئێستا بەبیستنی ئەو هەواڵەی عەلی توانای هیچم نییە، وەك فێریان کردووم کاتی بەتاڵکردنەوەی سـیحرەکە دەبێت زمانم بەڕۆژووبێت و ١٣ و ١٤و١٥ مانگی عەرەبی بێت زۆر باشە.

ڕازی بووین بەوەی کە هەفتەیەکی تر دووبارە لەخزمەتیاندا بم و کارەکەیان بۆ بکەم.

ئەو ماوەیە لەگەڵ خێزانی عەلی یەمەنیدا هەر لە پەیوەندیدا بووم بزانم عەلی تەندروستی چۆنە رۆژ بەرۆژ خراپتر دەبوو.

عەلی هەندێك شتی فێر كردبووم، بەڵام پێویستم بەهاوكاری ئەو بوو كە رێنماییم بكات. عەلی زۆر بەتوانا بوو لەبواری جنۆكە و جادو و سیحردا.

ئەو كاتەی كە دیاریمان كردبوو بۆ دووبارە یەكتر بینینەوەو بەتاڵكردنەوەی سیحرەكە، تەواو بوو، ئەوان هاتنەوە لام. پەیوەندیم كرد بە مامۆستایەكی ئایینی خاوەن بیرو باوەڕێكی پاك كە هاوكاریم بكات، ئەویش هات هەرچەندە وتی لێی نازانم، بەڵام هەر حەزم دەكرد كەسێكی ترم لەگەڵدابێت.

دەستم كرد بەخوێندنی قورئانی پیرۆزو ئایەتەكانی زەجر ئەوانەی كە باسی قیامەت و ترساندن لە قیامەت دەكەن، پاشان ئەو فەرمودانەی كە ڕاستن وهاتوون لەو بارەیەوە هەموویم خوێندو دەستم پێكرد.

أعُوذُ بِاللَّه مِنَ الشَّيْطَانِ: مِنْ نَفْخه، وَنَفْثه، وَهَمْزِه (نَفْثُهُ: الشِّعْرُ، وَنَفْخُهُ: الْكِبْرُ، وَهَمْزُهُ: الْمُوتَةُ (يظهر: أن همزات الشياطين إذا أُفردت دخل فيها جميع إصابتهم لابن آدم، وإذا قُرنت بالنفخ والنفث كان نوعاً خاصاً). إغاثة اللهفان، ١/ ١٥٤- ١٥٥.

اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْهَدْمِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ التَّرَدِّي، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْغَرَقِ، وَالْحَرَقِ، وَالْهَرَمِ، وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ يَتَخَبَّطَنِي الشَّيْطَانُ عِنْدَ الْمَوْتِ، وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ أَمُوتَ فِي سَبِيلِكَ مُدْبِرًا، وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ أَمُوتَ لَدِيغًا.

أخرجه أبو داود، واللفظ له، كتاب الوتر، باب في الاستعاذة، برقم ١٥٥٢، والنسائي، كتاب الاستعاذة، باب الاستعاذة من التردي والهدم، برقم ٥٥٤٦، والنسائي في الكبرى، ٤/ ٤٦٧، برقم ٧٩١٨، وأحمد، ١٤/ ٣٠٣، برقم ٨٦٦٧، والطبراني في الكبير، ١٩/ ١٧٠، وصححه الألباني في صحيح النسائي، ١١٢٣/٣، وصحيح سنن أبي داود، ٥/ ٢٧٥.

خەریكی خوێندنی ئایەتەكان و ئەو فەرموودانە بووم كە لەوبارەیەوە هاتوون، ئەوەندەم زانی كچەكەی ڕوناك خان (ڕۆشنا) پەلاماریدام نینۆكی تیژ بوو دەستی لە قورگم گیركردبوو، خوێنی هێنا لە ملم، تا لێمكردەوە زۆری پێچوو، بەتەواوەتی خۆی نووساندبوو بەمنەوە بەهیچ لێم نەدەبووەوە. تەنانەت بەلێدان و پێداكێشانیش، هەرچۆنێك بوو دەستیم لە ملم كردەوە تا وام لێكرد شل بوو، بەتەواوەتی ئازارم پێگەیاند ئینجا دووركەوتەوە خۆشم باش هیلاك بووبوم. پاشان بەردەوام بووم لە خوێندنی قورئان و نزاكان، ئەمجارەیان ڕوناك خان پەلاماری دام، هاوارم كرد عەبە فریام كەوە، عەبدوڵا ڕوناك خانی گرت دیسان كچەكەی پەلاماری دام. هاوارم كرد لە و مامۆستایەی كە لەگەڵمدابوو فریام كەوە ژن كوشتمی. بەخوا ڕۆشنا پەلاماری مامۆستای دا سەروچاوی مامۆستای هەموو هێنایە خوارەوە بە چڕنوك.

هەستم كرد خوێن زۆر لە قورگم دەچۆڕێت هەموو چواردەورم تاریك بوو، ئەوكەسانەی لەدەوروپشتم بوون هیچیان دیار نەمان، تەنانەت خێزان وماڵو منداڵ و ئەو مامۆستا ئاینییەی كە بانگم كردبوو، كەس نەما هاوارم دەكرد چیتان لێهات كەس وەڵامی نەدەدامەوە، دەمزانی من ماوم نەمردوم لەگەڵ ئەوەشدا ئاگام لە مێشك و هەست و بوونی خۆم بوو، بەڵام نە جێگا ئەو

جێگایە بوو نە خەڵکیش ئەو خەڵکە بوون لەگەڵیاندابووم تەنانەت زەمەنیش ئەو زەمەنە نەبوو کە تێیدا دەژیام، هەمووی گۆڕا!

چواردەورم ڕەش بوو بوو لەپڕ کەسێکم بینی بەرەو ڕووم هات، هەتا لێم نزیك دەبوەوە هەستم دەکرد ئەو کەسە دەناسم تازیاتر نزیك بوویەوە تەماشام کرد ئەوکەسە خۆمم، هەتا توانی زللەیەکی لێدام و بوورامەوە.

## جنۆکه له لاشەمدا یاری دەکات

لەدوای ئەوەی کە بوورامەوە ئاگام لە خۆمم نەما، کە هۆشـــم هاتەوە پێڵوی چاوم هەڵنە دەهات، سەرم قورس بوو سەرئێشەیەکم گرتبوو هەروەك کارەبا بیدات لەســـەرم ئازارەکەی ئەوەندە بە خێرای دەهاتو دەڕۆیشـــت، هاوارم دەکرد فریـام کەون ســـەرم تەقی کەللەم تەقی. گوێم لەکەس نەبوو چـاوم کەسی نەدەبینی، تەنها ئەوەندە نەبێت خێزانم هات پەڕۆیەکی تەڕی فێنکی خســـتە ســـەر نێوچاوانم کەزانیم ئەوە ئـارام بوومەوە و دووبـارە بێهۆش کەوتمەوە.

ئەمجـارەیـان کە بەخەبەر هـاتمەوە ســـەرم هەڵبڕی و چـاوم کردەوە لە نەخۆشخانەم، قوڕگم لەزگەی پێوەیە و کەسیش لە ژوورەکەمدا نەبوو!

هەڵسام تۆزێك ئاوم خواردەوە خەریك بوو دەخنکام، هەناسەم قورس بوبوو، بەرەو پەنجەرەکە ڕۆشـــتم بیکەمەوە تـا هەنـاســـە هەڵمژم، هیچ توانـای کردنەوەی پەنجەرەکەشـــم نەبوو. هەرچۆنێك بوو کردمەوە، دەنگێك دەهاتو دەچوو لە مێشکمدا دەیووت خۆت بکوژە ئەوە کەی ژیانە تۆی تێدای!

خۆت فڕێدەرە خوارەوە لەو پەنجەرەوە، ئەو نەخۆشخانەش منی لێبوم شەش نهۆم بوو، منیان لە نهۆمی چوارەم خەواندبوو. چەند جارێك ویســـتم خۆم فڕێبـدەم. بیری فەرمودەکەی پێغەمبەر (ﷺ)م کەوتەوە کەدەفەرموێـت:

(من قتل نفســـه بشيــء في الدنيا عذب به يوم القيامة) رواه البخاري ٥٧٠٠ ومسلم ١١٠

واتا: هەرکەسـێك لەدنیادا بە چی خۆی بکوژێت لە قیامەتدا بەوە ئازار ئەدریتەوە.

ئەو فەرموودەیەشـم بیرکەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (كان فيمن كان قبلكم رجل به جرح فجزع فأخذ سـكينا فحز بها يده فما رقأ الدم حتى مات. قال الله تعالى: بادرني عبدي بنفســه حرمت عليه الجنة) رواه البخاري ٣٢٧٦ومسلم ١١٣

واته: لە زەمانێکی پێش ئێوەدا، پیاوێک برینێکی لێ پەیدا دەبێت، لە تاو ئازاردا خۆی پێناگیرێت، بە چەقۆیەک دەماری دەسـتی خۆی دەبڕێت، ئیتر خوێنەکە ناوەسـتێتەوە هەتا دەمرێت. خوای گەورەش دەفەرموێت زەو بەندەیەم خۆی کوشت، منیش بەهەشتی لێ قەدەغە دەکەم.

ئەنجا هەسـتم کرد سـوپاس بۆ خوا من موسـوڵمانم، سـەیری دەرەوەم کرد نەمزانی کاتژمێر چەندە دنیا شـەو بوو، خەیاڵم لای نویژەکانم بوو، چوومە دەرەوەی ژوورەکە کە تێیدا بووم، کەسم نەدی ڕۆشتمە خوارەوەی نهۆمەکان تا نهۆمی یەکەم چووم تەنها یەك کەسـم بینی پرسـیارم لێکرد کە کاتژمێر چەندە؟

وتی: ٣:٣٨ دەقیقەی شەوە.

دەستم کرد بە گیرفانمدا تەلەفونێك پارەیەك شتێك بدۆزمەوە هیچم پێنەبوو.

هـاتمه دەرەوەی نەخۆشـــخـانەکە بە پێ کەوتمە ڕێ بەرەوە مـاڵەوە، بـاری دەروونیم ئاســـایی بوو، هیچ ئازارێکیشـــم نەبوو، زۆر بەئاســـانی گەڕامەوە ماڵەوە لە دەرگام دا خێزانم وتی: کێیە؟

وتم: ماکوانم بیکەرەوە.

دەرگای کردەوە بە پێکەنینەوە وتی: چۆن بەم شەوە ئیزنیان داویت؟

مـاکوان: وەڵا کەس ئیزنی نەداوم خۆم هـاتوومەتەوە، ئەرێ بەڕاســـت چی بووە؟ بۆ لە نەخۆشخانە بووم؟

خێزانم (باران): ئەی تۆ سێ ڕۆژە لە نەخۆشخانەیت.

ماکوان: بەڕاستە.

بـاران: بەڵێ لەدوای ئەوەی ئەو ئافرەتـانە پەلامـاریـانـدایـت و تۆ بوورایتەوە، حـاڵـت زۆر خراپ بوو هـاواری ســـەرت دەکرد، لە کـاتێکـدا ئەوان تەنهـا بەنینۆکیان تۆزیك ملی تۆیان بریندار کرد، بەڵام تۆ ئەو ڕوناك خانە فەقیرەت وێران کرد.

ماکوان: بۆ چیم کرد بۆ خاتری خوا.

باران: چۆن چیت کرد، ئەوەندەت بۆکز کێشـا بەســـەریدا تا بوورانتەوە تۆش یەکسەر بوورایتەوە لەگەڵ بوورانەوەی ئەودا!

ماکوان: بۆخاتری خوا چۆن شتی وا دەبێت.

باران: ماکوان بیکە بەخاتری خوا واز لەم جنۆکەو شـتانە بینە شـتێکت لێدەکەن.

ماکوان: باشە بەسەر چاو، بەس سەیرە بەلامەوە من ئاگام لەم شتانە نەبووە!

دەستم کرد بە (استغفرالله) و کاتی بانگی بەیانی بوو چووم دەستنوێژ بگرم و نوێژی بەیانی بکەم و نوێژەکانی ترم قەزا بکەمەوە.

هەڵسام کەچووم تەوالێتەکە دیسان سەرئێشەیەکم بۆ هات ئەوەندە ئازارم هەبوو لەبەر منداڵ و خێزانم دانم بەخۆمدا گرت دەنا ئەوەندە ماندووی کردم لە تەوالێتەکدا پاڵکەوتم.

خێزانم بانگی کردم ماکوان کێشـەت نییە؟ وتم نا ئێسـتا دێمە دەرەوە.. چارەکێك زیاتر مامەوە، هەسـتم دەکرد شـتێك بەناو لەشـمدا دێت یاری دەکات لە پەنجەی پێمەوە دەهاتو دەچوو تا تەوقی سەرم. دەستنوێژم گرت هەر ئەوەندی وتم: أَشْـهدُ أَنْ لا إِله إِلاَّ اللَّه وحْدَه لا شَرِيكَ لهُ، وأَشْـهدُ أَنَّ مُحمَّدًا عبْدُهُ وَرسُولُه، اللَّهُمَّ اجْعلْني من التَّوَّابِينَ واجْعلْني مِنَ المُتَطَهِّرِينَ. ئیتر وەك ئەوەی بە چەکوش بکێشن بەسنگمدا.

ئەمەویسـت هاوار بکەم، لەبەر خێزانم و منداڵەکانم نەمدەوێرا هاوار بکەم، بەڵام کەوتمە سـەر زەوی و لەتاو ئازار کراسـەکەی خۆمم کرد بەدەممدا بۆ ئەوەی هاوار نەکەم.

شتێك لە مێشکمدا دەیووت کوفر بکە، قسە بەخوا بڵێ چاك دەبیت، ماکوان قســـە بە خوا و موحەمەد وقورئـان بڵێ چـاك دەبیتەوە، ئەوە ئەوانن وات لێدەکەن.

ئەوەنـدە مانـدووی کردم عارەقی زۆرم کرد، هەموو گیانم لەســـەر ئـاو بوو خێزانم هەر دەیووت ماکوان باشـــی؟ ئەوە تەلەفونم کردووە بۆ ئامبولانس ئێســـتا دێن وئەت بەن تەحەمولت بێت. منیش لەتاو ئازار هیچم بۆ نەدەکرا هەرچی دەموویست بلێم (سبحان الله یان الحمد لله) زیاتر ئازار دەهات بە ســـەرمدا. ئینجا بیرم کەوتەوە کە ئەمە نەخۆشـــی نییە ئەمە (صرع)ە خۆم ناتوانم پێویستە کەسێك بیخوێنیت، ئەمویســـت بە خێزانم بڵێم پێویستم بە ئەمبولانس نییە، پێویستم بەتۆیە دوعام بۆ بخوێنە بەئاو بەسەرمدا بپرژێنە. هیچ نەمدەتوانی خێزانیشم شڵەژابوو، ئاگام لێبوو ئانای کچیشم دەگریا تەنها لەبەر ئەوان هاوارم نەدەکرد، کراســـەکەم خســـتبووە دەمم، دوو کەس هاتنە ماڵەوە منیان بە پەلە خستە ناو سەیارەی ئامبولانسەکەو ئۆکسجینیان کرد بەدەمدا و بێهۆش کەوتم.

کەهۆشـم هاتەوە لەهەمان ژووردا بووم، زۆر ئاسـایی بووم هیچ کێشـەیەکم نەبوو وەك ئەوەی هیچ ڕووی نەدابێـت، بەڵام ئەوەی ڕوویـدابوو لەگەڵ خێزانم ماڵی خۆماندا هەموویم بەبیر هاتەوە، بەڵام ئەم جارە خێزانم لابوو.

وتم: چییە؟

باران: بە پێکەنینەوە شکور باشبوویت؟

ماکوان: سـوپاس بۆ خوا عەیبم نییە، هەرکە وتم سـوپاس بۆ خوا عەیبم نییە دیسـان وەك تریشـقەی هەور هاتەوە بەسـەرمدا و پاڵی خسـتمەوە لەسـەر سەرینەکەم.

باران: رایکرد بانگی دکتۆر بکات.

بانگم کرد وتم: وەرە کەس بانگ مەکە باش بووم.

باران: بۆ وات لێهاتووە؟ چی بووە؟

ماکوان: شـتێکت پێ دەڵێم نێوانی خۆم و خۆت بێت، نابێت بە کەس بڵێیت، وەعدم ئەدەیتێ؟

باران: وەعد بیت ئەگەر گیانی خۆشم بێت!

ماکوان: لێرەوە دەچینەوە بۆ ماڵەوە ئەم بەستیتەوە، منداڵەکان بنێرە بۆ ماڵی باوکت. تەحەمولم بکە ئەوەی پێت دەڵێم بیکە، باشە؟

باران: بۆ خاتری خوا نەکو نەخۆش بیت من چۆن شتی وا دەکەم.

ماکوان: من نە نەخۆشـم نە هیچ، بەڵکو من جنۆکە چۆتە لاشـەمەوە هەسـت دەکەم سـیحرم لێکراوە، بەهەر حاڵ تەلەفونێکم بۆ بکە بۆ عەلی یەمەنی، بەڵکو باش بووبێت وەزعی منی تێبگەیەنەو بەخێزانی بڵێ بەڵکو هاوکاریت بکات.

باران: تەلەفونی کرد بۆ ژمارەکەی عەلی یەمەنی ژنەکەی هەڵیگرت، هەواڵی عەلی پرسی.

خێزانی عەلی: سێ ڕۆژە وەفاتی کردووە خوای گەورە بە شەهید وەریگرێت.

زۆر خەفەتم خوارد دەســتمان کرد بە گریان هەردووکمان، چارەم نەما وهیچ هیوایەکم نەما بۆ فێربوون چی بکەم، بەڵام یەك پلانی ترم لە مێشــکدا بوو نەمدەویســت دەریبڕم بە خێزانمم وت با بڕۆینەوە بۆماڵەوە، بەڵام پێش من بەدایکت بڵێ با منداڵەکان بەرێت بۆ ماڵی خۆیان.

پێش من ڕۆشتەوە منداڵەکانی نارد بۆ ماڵی خەسووم..

لەدوای چوونەوەمـان بۆ مـاڵەوە بۆم نووســی بە زمـانی نەرویجی وا بم بەسـتەرەوە کە نەتوانم بجوڵێم، بەڵام بەدەنگ هیچم پێ نەووت. پاشـان بۆم نووســییەوە بۆ ئەوەی خۆم و ئەویش دڵنیا بکەم کە وا بم بەســتەرەوە کە نەتوانم خۆم بکەمەوە ئەگەر چی خۆشــم زۆر بجوڵێنم وپەلەقـاژە بکەم، چونکە هەستم دەکرد ئەگەر قسـە بکەم جنۆکەکان دەزانن، ناهێڵن پلانەکەم سـەر بگرێت، لە خێزانیشـم دەترسـام کە بچنە لاشـەی ئەوەوە. خوای گەورە خســتیە دڵم کە نەکو لە ترســی خێزانم کە من ببینێ ترسـەکەی زۆر بێت و ئەوانیش فورسەت وەرگرن لە ترسەکەی خێزانم و ئەویش وەك منی لێ بێت، چونکە ترسیش بەشێکە لە وهۆکارەی کە جنۆکە بچێتە لاشەی مرۆڤەکانەوە.

خێزانم بەدوای شتێکدا دەگەڕا من ببەستێتەوە، ئاگام لێی بوو دڵی نەدەهات.

بە تووڕەییەوە پێم وت ئەگەر دەتەوێـت من چـاك ببمەوە ئەوەی کە بۆم نووسیویت بیکە.

هەندێك شتی باشی پەیدا کرد وابەستمیەوە ئازارم پێگەیشت، دوای بەستنەوە وتم: کتێبەکەی (عەبدولواحید عبدوسەلام بالی) بخە سەر لاپەڕە ٣٤ و قورئانەکەم لەبەر دەم دابنێ بیکەرەوە و بیخەرە سەر سوڕەتی (بقرة) بە دەنگی غامدی و بڕۆ دەرەوە دەرگا داخە، لەم ناوە نەوەستیت، تەلەفونەکەشم بۆ بخە سەرژمارەی خۆت لە نزیك دەستمەوە دایبنێ خۆم ئەگەر پێویستم بوو لەپشتمەوە دایبنی تەلەفونت بۆ دەکەم. ئەزانم قورسە، بەڵام بەقسەم بکە، تەنها ئەوە چارەسەری منە. بەزەییت پیاما نەیەتەوە بڕۆ لەم ناوە نەوەستیت خێرا، ئەوەی پێم وت کردی بەڵام پێش ئەوەی بمبەستێتەوە چووم بە پەلە دەستنوێژم گرت هیچ زکرێکم نەخوێندو خێزانم ئەوەی پێم وت بە تەواوەتی کردی.

قورئان لەسەر بوو خۆشم بە زمانم لاپەڕەی قورئانەکەم هەڵئەداوە تا ئایەتی ٣٠ دیسان سەرئێشەم بۆ هات ئەم جارە وەك ئەوەی کەللەم بە بزمارو چەکوش داکوتن هەستم دەکرد بە بلۆك دەکێشن بەسەرمدا. هاوارم دەکرد، بەدڵم دا هات لەگەڵ هاوارەکەدا یادی خوا بکەم.

هەر زریکەیەکی ئازارم بۆ دەهات هاوارم دەکرد الله اکبر و سبحان الله، الحمدلله، پاش کەمێکی تر خوای گەورە خستییە دڵم هاوارم دەکرد سبحان الله، والحمد لله، ولا إله إلا الله، والله اکبر.. ئازارەکەم باش بوو تۆزێك، پاشان زۆرم تینوو بوو بیرم چووبو داوای ئاو بکەم، بەڵام گوێم پێنەداو بەردەوام قورئانەکە دەخوێنرا و لەپڕ پیاوێکی سپی پێستی جل سپی هاتەوە بەرچاوم، وتم ئەم کەسە دەناسم لەدڵی خۆمدا، کە بیرم کەوتەوە زانیم سەسیلە.

بە زەردەخەنەیەکەوە وتی: ماکوان بەباشـــی کەوتیتە بەردەســـتم، بۆ کوێ دەڕۆیت؟

ماکوان: مەلعون بۆ لای خوای خۆم دەڕۆم، من خوام هەیە تۆ کێت هەیە؟

سەسیل: کەللەت رەقە پێیان بڵێم سێ چوار بەردت پیا بکێشن؟

دەســـتم کرد بە پێکەنین و وتم کەللەیەك لەپێناوی خوادا پیای نەکێشـــن بۆ شکاندن باشە.

ســەسـیل: بۆنایتە ناومان نەجاتت بێت، بۆ دەبێت تاماویت شـێت بیت و بە شێتیەوە بتکوژم.

ماکوان: حەدت چییە، ئەوە تۆنیت من بکوژیت؟ شێت بوونم لە پێناوی خواو دینەکەمدا ســەربەرزییە بۆم، تەحەمولی لەســەر دەکەم، نەوەکوببمە کۆیلەو کافری وەك تۆ؟ ئەی سەسیلی مەلعونی سەگ باب!

ئەوەندەم زانی ئازار بە گیانمدا هات، ئەوەنـدە ئازارم پێگەیشـــت تەنانەت خەریـك بوو میزم دەکرد بە خۆمـدا، بەڵام لەشـــەرمی قورئانەکە هیچم بۆ نەدەکرا و خۆمڕاگرت. لەجوڵەی زۆریشـم هەسـتم دەکرد ئەو حەبلانەی منی پێبەســـترا بوومەوە وردە وردە شـــل دەبوونەوە، عارەقیش بەگیانمدا دەهاتە خوارەوە، بەڵام هەر هاوارم دەکرد ســـبحان الله، والحمد لله، ولا إله إلا الله، والله اكبر.

ئەو سەسیلە هیچوپوچە بەسەرمەوە دەگەڕا جێی نەدەهێشتم.

لەدڵی خۆشمدا لام سەیر بوو قورئان خراوتەوە سەر، خۆم زیکر دەخوێنم و پاشان قورئانم لایە، چۆن ئەوەندە بە توانان ئاوا توانای خۆیان بەسەر مندا سەپاندوە ئەو مەتەڵەم بۆ حەل نەدەکرا. خوای گەورە بۆی ئاسان کردم ئەوەندەم زانی ڕوخسارێکی جوانی ناسك خۆی کرد بەژووردا ڕێك لە باوکم دەچوو. وتی ناتوانیت هیچ لەو کوڕە بکەیت و ئەگەر جێی نەهێڵیت ئێستا لەناوت دەبەین.

هەر ئەوەندە کە وای وت هاتە نزیکم و دەستی خستە سەر سنگم و دیار نەما، بەڵام هەستم کرد چووە ناو لاشەی من، وەك سەهۆڵاوێك بکەن بەلاشەمەدا وام لێهات و کەمێکی پێچوو من ئارام بوومەوە. تەماشام کرد هەمان پیاوە کە لە کاتی ماسی گرتنەکەدا بینیبووم زانیم حەزقیلە.

ماکوان: حەزە گیان ئەوە لەکوێیت خۆ وتیان تۆ مردوویت؟

عەبدوڕەحمان حەزقیل: ماکوان گیان درۆیان کردبوو لای مامۆستاکەم بووم خەریکی خوێندنی علومی شەرعی بووم، ئاگاداریان کردینەوە کە سیحرت لێکراوە، بە ئارەزووی خۆیان هەموو شەیتانەکان دێن و دەچن و ماڵەکەشتان پڕبووە لە شەیتان.

ماکوان: بەس من هیچی وام نەکردووە کە ئەوان ئەو هێزەیان هەبێت.

حەزقیل: ئەو ڕۆژەی کە میوانەکانت هاتوون سیحرێکیان خستۆتە ناو ناوکەفی پێڵاوەکانت هەتا ئەوە بەتاڵ نەکەیتەوە ئەوان هەر دەتوانن بێنە ناو لەشت هیچ شتێك کاریگەری نابێت.

ماكوان: حەزە گیان بە جێم مەهێڵە تا تەلەفونێك دەكەم بۆ خێزانم.

حەزقیل: با خێزانت نەزانێ خۆت چارەســەری بكە، بەڵام هاوڕێكانمان بۆیان باســكردم كە تۆ غیرەتێكی باشــت هەبووە و توانیوتە بەســەر ئەو ئازارانەی خۆتدا سەركەویت. ئەوەش سوپاسی خوای دەوێت.

ماكوان: دە حەزقیلی برام ئەو پەتەی دەستم شل بكەرەوە با بەیەكەوە بەتاڵی بكەینەوە.

هەروام وت دیار نەما، بەلام ئاگام لە دەســتم بوو وردە وردە پەتەكەی شــل بوو خۆمم كردەوە. قورئانەكەم هەڵگرتو خســتمە شــوێنێكی بەرزو چوومە تەوالیتو دوایش تێرو پڕ ئاوم خواردەوە هەســتم بە ســووكی لاشــەم كرد كەچووم لای پێڵاوەكانم تەماشـــای ناوكەفەكەیم كرد حەزقیل ڕاســتی كرد لەهەردوو تاكە پێڵاوەكەمدا ســیحری تێدا بوو دەرمهێناو ئاوڕمداوە حەزقیل لەسەر پلیكانەكانەیماڵەكمان دانیشتووە پێدەكەنێت.

## سیحر و جادوی ژەنیار (المعازیف)
## نیکرۆنۆمیکۆن(Necronomicon)

ئەو هەموو ئازار و ناڕەحەتیەم بینی و چەشت، خوای گەورە فریام کەوت لە هەمان کاتدا حەزقیلی کردە هاوکارم و هۆکارێکیش بۆ ئەوەی زیاتر بە غیرەتتر بم.

کە ئاگاداری کردمەوە لەناو پێڵاوەکانمدا سیحری تێدایە، چووم تەماشای پێڵاوەکانم کرد ڕاست بوو لە هەردوو تاکە پێڵاوەکانمدا دوو نووسینی جیاوازی تێدابوو کە شێوەکەی لە نووسین و وێنە پێکهاتبوو. ئاوڕمداوە حەزقیل لەسەر پلیکانەی ماڵەکەمان دانیشتوە تەماشام دەکات و پێدەکەنێت.

ماکوان: من هیچ لەمە تێناگەم، ئەمە چییە حەزقیل-ی برام؟

حەزقیل: ئەوە سیحری مردووەکانە!

ماکوان: حەزقیل بۆ خاتری خوا سیحری مردووەکان چییە؟

حەزقیل: ئەوە سیحرێکی زۆر گەورەیە، لە دێر زەمانەوە هەیە و مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی جادووبازەکانی فیرعەون!

ماکوان: جا کەسیان لەسەر ئەم زەوییە نەدۆزیەوە ماکوان نەبێت سیحری لێبکەن؟

حەزقیل: بۆ تۆ خۆتت پێکەمە؟

ماکوان: ئەرێ وەڵڵا زۆریش خۆم بەکەم دەزانم لەئاستی موسوڵمانانو پیاوچاکاندا.

حەزقیل: دە سوێند بەو الله ی سوێندی پێدەخۆیت لە کەسی وا کراوە ئەوەندە سادەیە تەنانەت لە گەڕەکی خۆشیاندا کەس نایناسێت، تۆ دەزانیت شەیتان ئارەزوومەندە بەوەی ئازار بگەینێت بە ئێوەی موسڵمان؟

ماکوان: بەس ئایا تۆ پێت وانییە دەچنە لاشەی خەڵکی بێدینیشەوە؟ ئەی ئەو خۆ بە قورئان نایەتە دەرەوە لەوانەیە هەر نەزانێت قورئان چییە، خەڵکانێك هەیە دەڵێن بە ئینجیل چارەسەری دەکرێت بۆ ئەمە چی دەڵێیت حەزقیلی برا؟

حەزقیل: شتێك هەیە بیزانە ئەگەر هەموو جۆرەکانی جنۆکە بیانەوێت بچنە ناو لاشەی هەر کەسێك دەتوانن بچێت، چونکە ئەوە خوای پەروەردگار ئەو هێزەی بە ئێمە بەخشیوە، ئێوەش هیچ دەسەڵاتێکتان نییە.

ماکوان: واتا هەر وا بە ئاسانی ئەچنە ناوە لاشەی خەڵکەوە؟

حەزقیل: بەڵێ زۆر بە ئاسانی، ئێمە ڕاستە مەخلوقی خوای پەروەردگارین وەك ئێوە هەریەکێك لەم دوو دروستکراوانەی پەروەردگار تایبەتمەندی هەیە. بۆ نمونە ئێوە زیرەکن و توانای ئاوەدانکردنەوە و جێنیشنکردن و بەندایەتی زیاترتان هەیە، بەڵام ئێمە توانای جێنیشنکردنو ئاوەدانیمان نییە، بەڵام توانای فڕینو گەڕانی خێراو ئاشکرا کردنی هەندێك نهێنیمان هەیە. هۆکارەکەشی

دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئێوە خاوەن لاشـــەن ئێمە خاوەن وزەین، ئەوە جیاوازیمانە. هێزی ئەقڵی بیرکردنەوەی ئێوە لە ئێمە بەهێزترە.

ئێمە زانســـت و زانیاری و تەنانەت زیرەکیش وەردەگرین، ئەوەی فێریش دەبین لە دین و لە هەندێك بواری تری ژیان لە ئێوەی مرۆڤەوە فێردەبین. چوونیشـــمان بۆ ناو لاشـــەی ئێوە هەر وەك ئەوە وایە من بەناو دیوارێکدا ڕەتدەبم یاخود دەچمە ناو ئاو یان دەچمە بۆشایی ئاسمان، ڕوونە ماکوان-ی برام؟

ماکوان: نە بەزاتی خوا زۆر ڕوون نییە، تۆ پێم بڵێ ئەگەر دەتوانن بچنە ناو لاشـەی هەمووکەس، ئەی ئیتر ئەم هەموو هاتو هاوارەتان لەچییە؟ سـەسیلی بێقیمەت چی دەوێت لەمن بۆ ناچێتە ناو لاشـــەم و ئەوەندە شـــەڕمان پێنەفرۆشێت؟

حەزقیل: چوونە ناو لاشـە ئاسـانە، دەتوانین بە ناو دەزولەی خوێنتانادا بڕۆین و دەمارەکانتان بە کیلۆمەتر تێپەڕێنین، بەڵام ئەمە نە ئازاری ئێوە ئەدات نە هیچ تەنها دەتوانین وەسوەسەتان بۆ دروست بکەین لە ڕێگای ئەو کارەبایەی کە لە ناو دڵەوە ئاڕاستەی مێشـك دەکرێت. هەر ئەوەندەیە ئەویش لە کاتی تەرکیز کردنتاندایە بۆ نوێژ یاخود ئافرەتی جوان و بیرخســـتنەوەی خۆتان زیاتر دەروژێنین بۆ حەزە شـەهوانیو سـێکسـییەکان و بەگشـتی حەزەکانی خۆتان.

ماکوان: ئەی ئەوە چییە کە دەچنە ناو لاشەی خەڵک و قسە دەکەن لە جیاتی ئەو کەسـە؟ لەشـەرعدا ناونراوە بە مەسـسـی جنۆکە گوایە ڕقیان لە قورئان و

دینـداری و نـاوی خوای دەبێتەوە، کە جنە هیچوپوچی کـافرەکـان دەچنە ناولاشەی مرۆڤەکان؟

حەزقیل: ماکوان گیان وەك وتم چوونە ناو لاشە نییە، بەڵکو بەهۆکاری لاوازی ئیمان و کەسایەتی ئەوکەسـەیە کە هەموو مێشـکی داگیر دەکرێتو دەسـت دەگیرێت بەسـەر مێشـکیدا وئاڕاسـتەی دەگۆڕێت بەو شـتەی کە جنۆکەکە دەیەوێت.

ماکوان: واتا ئیتر ئەو تەحەکوم دەکات وەك کۆنترۆڵی تەلەفزیۆن؟

حەزقیل: بەڵی وەك سوکانی سەیارەش.. بە پێکەنینەوە.

ماکوان: باشە ئەی من چی بکەم ئێستا؟

حەزقیل: دەبێت سیحرەکە بەتاڵ بکەینەوە.

ماکوان: جا ئەوە ئاسـانە ئێسـتا بەتاڵی دەکەمەوە، عەلی یەمەنی خوا عەفوی بکات فێری کردووم.

حەزقیل: نا ئەمە ئەو جۆرە جادووانە نییە بەشێکی تری ماوە دەبێت ئەویشی لەگەڵدا بەتاڵ بکەیتەوە کە لای ساحیرەکە ماوە.

ماکوان: جا من چوزانم ساحیرە کە کێیە؟

حەزقیل: ئاسانە هەموو سیحرێك جنۆکەیەکی شەیتان یان

عیفریتێك دەیگرێتە ئەستۆی خۆی، بە بۆنەکەیدا ئەدۆزرێتەوە.

ماکوان: بۆ ئەم سیحره چییه؟ ئەوەندە گرنگە؟

حەزقیل: بۆ کەسێك نەیزانێت بە دڵنیاییەوە گرنگە.

ماکوان: ئەی بە ئایەت و قورئان بەتاڵ ناکرێتەوە؟

حەزقیل: نا، تەنها بە قورئان بەتاڵ ناکرێتەوە.

ماکوان: تورە بووم وتم چۆن وادەڵێیت قورئان کەلامی خوایە، قورئان هەمووی بەتاڵ دەکاتەوە.

حەزقیل: ماکوان گیان کاتێك کە سیحرلە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کرا، فریشتەکان چوون بەشەکەی تری سیحرەکەیان هێنا لە بیرێکی ئاودا دانرا بوو، وابوو؟

ماکوان: بەڵێ، بەڵێ

حەزقیل: ئەمە مانای وانییە کوفر بێت، بەڵکو - بۆیە ئەو حاڵەتە بەسەر حەزرەتی موحەمەد (ﷺ) پێغەمبەری ئاخر زەمان و فەخری عالەم کراوە بۆ ئەوەی ئەگەر ئێمەش شتێکی وامان بەسەر هات بە قورئان و سوننەت خۆمان چارەسەر بکەین!

ماکوان: ڕاستەکەیت من تورە بوونەکەم لە جێگای خۆیدا نەبوو، چەندجار خۆم ئەوفەرموودەیەم شەرح کردووە، ئێستا بیرم کەوتەوە.

حەزقیل: ئاســـاییە ماکوانی برام، تۆ فەزڵت هەیە بەســـەر زۆرێك لە من و هاوڕێکانمەوە.

جا لەبەر ئەوە هەرچی بڵێیت ئێمە خۆشـــمان دەوێیت و هاوکاریشـــت دەکەین.

ماکوان: بەخوا ڕۆحی حەزە گیان، بەس پێم بڵێ ئەم ســیحرە چیەو ناوی چیە و چۆن بەتاڵی بکەمەوە بۆ لە من کراوە؟

حەزقیل: چەند ســەد ســاڵیك بەر لە ئێســتا پیاویکی ســاحیر ئەم ســیحرەی نووســـیوەتەوە بەناوی المعازیف دوایی کراوە بە زمانی لاتینی و زۆرێك لە قەشەو ڕاهیبە جولەکەو مەسیحییەکان بەکاری دێنن، لە ئەوروپادا زۆر بڵاوە. ئێســـتا شـــیعەکانی ئێران و فارســـەکانیش کردوویانە بەفارســـی، بەتایبەت زەردەشـــتییەکان بەکاری دێنن لە هیندســـتان و لە ئێران و لە کوردســـتانیش چەند کەسێك دەیزانێت، ئەو کەسەی کە کردوویەتی لە کەرکوك-ە.

ماکوان: واتا دەبێت بچم بۆ کەرکوك؟

حەزقیل: بەڵێ

ماکوان: بەڕاستی قورسە.

حەزقیل: دەشێت سەسیل و هاوکارەکانی بێنەوە بۆلات، ئەو دیارییەی کە پێم دابوویـت یەکەم جـار هەڵیگرە بـا پێـت بێـت. ئیتر ئەوان نـاتوانن بینە نـاو لاشـەتەوە، بەڵام دەتوانن بتبینن و بێنە لات. لە زیکرو ویردو قورئان خوێندن بەردەوام بە تا سیحرەکە بەتاڵ دەکەینەوە بە پشتیوانی خوای پەروەردگار.

ماکوان: جا حەزقیلی برام ئەو دیارییەی تۆ ئەوەندە گرنگە کە هەڵیبگرم، قورئان و سوننەت گەورە ترە، هەست دەکەم ئەگەر ئەوە هەڵبگرم ببێتە شرك.

حەزقیل: نا ماکوانی برام نابێتە شرك، چونکە تۆ پشتیوانت بە خوای موتەعالە، چۆن کەسێك ئەنفلۆنزا دەگرێت حەبێك دەخوات یان سەرئێشەیەك دەگرێت دەرزییەك لە خۆی ئەدا ، ئایا دەرمان دەبێتە شرك؟

ماکوان: نا ئەگەر وەك وەسیلە بەکار بێت ئاساییە.

حەزقیل: ئەوەی کە من داومە پێت ئەو جۆرەیە کە هیچ ڤایرۆسێکی سیحرو جنۆکەی سیحربازەکان نایەن بەلای ئەو دیارییەی منداو لێی دەترسن، چونکە تووشی جۆرە دەردێکیان دەکات لە ناو ئێوەی مرۆڤدا نییە، گەڕو گولیان دەکات و دەیان پوکێنێتەوە و دەیانسوتێنێت.

ماکوان: ئەی تۆی چۆن نەسووتاند مەگەر تۆ جنۆکە نیت حەزقیلی برام.

حەزقیل: من هەڵمنەگرتوە، بەڵکو کاتی خۆی من زانیاریم دایتێ وەك دیارییەك پێم وتی و پێشم وتی بۆچی باشە. عەلی یەمەنیش بۆی باسکردی بیرتە؟ ئەوکاتە هەمان پرسیارت کرد لە عەلی یەمەنی، ئەویش وەڵامی دایتەوە وتی: ئەو زانیارییە ئەوان داویانە بە ئێمە دژی خۆیانە، بەڵام موسڵمانەکانی بۆ پاراستین، ئێمە ئەمان دەنێ بۆ ئەوەی دووربین لە خراپەی شەیتانە جنۆکەکانان

ماکوان: باشە برا خوا پاداشتان بداتەوە، ئێستا چی بکەین؟

کەوام وت دەموچاوی حەزقیل تێك چوو نەما، وەك تەشـویشـی تەلەفزیۆنی لێهات و دیار نەما، منیش ترسـام ڕامکرد دیارییەکەی ئەوم خسـتە گیرفانم، لەترسـاندا دەرم هێناو خستمە ناو دەستم توند گوشیم. هەستم دەکرد کە سەسیل و حەزقیل لە شەڕدان.

ئەوەندەم زانی سـەسیل بە ناشرینی خۆی دەرکەوتەوە وتی: ماکوان کارێکت بەسـەر دێنم لەم نەرویجەدا سـجن بکرێیت و لە ژیانتا بۆ کوردسـتان نەڕۆیتەوە.

ماکوان: منیش توڕە بووم وتم دە کەرە چیت لەدەست دێت بڕۆ بیکە، مادەم هەڕەشـە دەکەیـت تـۆش فشـە دەرچـوویـت، لەدڵـی خـۆمـدا وام دانابوو(ڕەگەزنامە) جنسییەکەم ئەبات‌و ئەیشارێتەوە.

مانگێك لەسـەر ئەو ڕووداوانەدا تێپەڕی و بەردەوام بووم لە ژیانی ئاسـایی خۆم هیچ ڕووی نەدا نە حەزقیل نە سـەسیل دەنگیان نەبوو، شـەوێك لە کار گەڕامەوە سـەسیل لەسـەر سـوچی کۆڵانەکەماندا وەستابوو، منیش سـەیارەم پێبوو خێرامکرد ویستیم لێیبدەم ئەو هیچ و پوچە کەچی هاتە ناو سەیارەکەم خەریك بوو دڵم بوەستێت.

سـەسـیل: ئەم شـەو وەعدەکەی خۆم دەبەمە سـەر ناهێڵم لەم وڵاتەدا دەرچیت.

خێرا ئایەتە لکورسـیم خوێندو بەدەم زیکرەوە چوومەماڵەوە، وەك ڕۆژانی ئاسایی دەستنوێژم گرت نوێژم کرد و نانم خوارد و خەوتم.

کاتژمێر ٥:٣٠ی بەیانی لەدەرگای ماڵمان درا، منیش وامزانی دراوســـێکەمانە، کەچی بەدەنـگ ی بەرز وتی بیکەرەوە ئێمە موخـابەراتی نەرویجین، ئەگەر نەیکەیتەوە دەرگاکە دەشکێنین ، تا پێنج چرکە دەژمێرین.

## دەستگیرکردنم لەلایەن موخابەراتەوە

دوای ئەوەی لە دەرگا دراو دەرگام کردەوە، وتیان ئێمە موخابەراتی نەرویجین و بە فەرمانی حکومەتی ئیتاڵی دەستگیرت دەکەین، چونکە تۆ لە دوای مەلا کرێکار کەسێکی سەنتراڵی لە ڕێکخراوەکەی مەلا کرێکاردا. واتا کەسی دووەمم لە ڕێکخراوەکەیدا، ویستومە کاری تەقینەوە لە وڵاتی ئیتالیادا بکەم.

لەبەردەمی دەرگاکەدا کەلەبچە کرام هیچ دەسەڵاتێکم نەبوو، بەپەلە چەند کەسێك چوونە ژوورەوە، تەنها مەجالی ئەوەیان دام کە خۆم بگۆڕم و هەموو شتەکانیان لە گیرفانم دەرهێناو سەواری سەیارەیەك کرام بە کەلەبچەکراوی بردمیان بەرەو ئۆسلۆ.

منیش لەناو سەیارەکەدا دەستم کرد بە نوێژی بەیانی. وتم کارەکەم ئاگادار بکەنەوە کە من لەگەڵ ئێوەدام وتیان ئەو کارەت بۆ دەکەین، دوای یەك کاتژمێر چووینە ناو فەرمانگەی مەرکەزی پۆلیس لە ئۆسلۆ، بردمیانە ژوورێك و یەکسەر زیندانی کرام.

زیندانەکە ٢ مەتر بە ٢ مەتر بوو، تا چەند کاتژمێرێك وازیان لێهنام و دوای ئەوە دەرگایان لێم کردەوە و بردیانم بۆ پشکنینی دی ئێن ئەی.

دوای تەواو بوون، گەڕامەوە بۆ زیندانە ئینفرادییەکەم. ژوورە کە تەنها سەکۆیەك و دۆشەکێکی زەردی چەرمی چڵکنی تێدابوو، دوای ئەوە وتیان خۆت ئامادەکە بۆ لێکۆڵینەوە.

لەدوای ئەوەی هەمان رۆژ بردیانم بۆ لێکۆڵینەوە لەگەڵ موخابەراتدا ئەم پرسیارە سەخیفانەم لێکرا.

- ساڵی ١٩٩٩ چۆن هاتوویت بۆ نەرویج؟

وەڵامم داوە.

- ناوی خۆت و خێزان و منداڵ و ئیشوکارت چییە؟

وەڵامم داوە.

- ئایا ڕێگەمان پێئەدەیت بچینە ناو تەلەفون و پاڵتاك و فەیسبوك و ئیمەیڵو شتە تایبەتەکانت؟

وەڵامم داوە بۆ هەمووی ئازادن و ئەوەیشـــی ئێوە نایزانن و ناوتان نەبردوە ئەوانیشمدانێ لە ڤایبەرو سکایب هەرچی ترم هەبوو.

- پەیوەندی من بە مامۆستا کرێکارەوە چی بووە؟

وەڵامم داناوە کە لەگەڵ جەنابیان پەیوەندییەکی توندو تۆڵ و برایانەو ئیسلامیانەو خۆشەویستیانەم هەبوو زیاتر من بۆ کاری رۆژنامەوانی و ئایینی سوودم لەوپیاوە وەرگرتووە.

- ئایا من لە ڕێکخراوەکەیدا بوونم هەبوو بەناوی ڕەوتی شاخ؟

لە وەڵامدا ئەوەم پێڕاگەیاندن بە ڕاشـــکاوانە ئەوەندەی کە من مامۆســـتام ناسیوە خاوەنی هیچ ڕێکخراو و دەستەو گروپێك نەبووە، ماوەی چەند ساڵێك

دەبێت من دوور کەوتومەتەوە بە هەندێك هۆکاری تایبەتی لەو پیاوە، ئیتر لەوماوەیەدا نازانم هیچ ڕێکخراوێکی دروســـتکردبێت ئەویش موســـتەحیلە چونکە هەر لە زینداندا بووە.

- ئایا تۆ لەنەرویجدا شەریعەت و خیلافەت دادەمەزرێنیت؟

لەوەڵامدا وتم: نەرویج وڵاتی موسوڵمانان نییە تا من خیلافەت و شەریعەتی تێدا بەرپا بکەم، ئەوە خەڵکی وڵات هەڵیدەبژێرن نەك من بڕیار بدەم.

- هەندێك پرسیاری تر لەوەی چەند کتێبم نووسیوە و باس لە چی دەکەن و کتێبەکان ناویان چییەو ڕێکخراوەکەی خۆم بەناوی بزاڤ کارمان چییە و گۆڤاری بزاڤ و..هتد

هەموو لێکۆڵینەوەکەی من دوو لاپەڕەی پڕنەکردەوە و هەموو بە کۆی گشتی کاتژمێرێك لێکۆڵینەوەم لەگەڵدا کراوە.

دوایی هێنایانمەوە بۆ زیندان، هەموو ئەو چەند هەفتەیە من لەزینداندا بووم ئەمە لێکۆڵینەوەکەم بووە. ئیتر لەدوای ئەم لێکۆڵینەوە کەس لە منی نەپرســـییوە نزیکەی ٤٠ شـــەو لە زیندانی ئینفرادی دا بووم هیچ کەس بۆی نەبوو قســـەم لەگەڵ بکات و ببینێت، تەنها دوو جار نەبێت جارێك خێزانم کە موخابەرات لەگەڵماندا دانیشـــتوە بۆ ماوەی کاتژمێرێك بینیومە و جارێکیش منداڵەکانم بۆ ماوەی یەك کاتژمێر بەهەمانشـــێوە موخابەرات لەگەڵماندا دانیشـــتوە، بۆ خۆشـــی فیکلانکۆم دەکرد لەگەڵ دوو کچەکەمدا هیچکام لە موتەرجمەکان نەیانتوانی فیکلانکۆ بکەنە نەرویجی.

حوکمی حـاکمێکی بەهێزی نەرویجی لەســەر نـاردنی من بۆ ئیتـالیـا و پێشێلکاری سەروەری وڵاتی نەرویج کە پارێزەرەکەی موخابەراتی ئیحراج کرد.

لەدوای ئەوەی کە بەردەوام لەو ماوەیەی ئەو ڕۆژەی کە دەســتگیر کرابووم بەردەوام لێکۆڵینەوەم لەگەڵدا کرا، مەبەســتم لێکۆڵینەوەی گفتوگۆ نییە بە تەنها بەڵکو بە پشــکنینی پزیشــکی و گفتوگۆو هەنـدیـك ڕۆتینـاتی تر، هەرخۆشــیـان پـارێزەرێکیـان بۆ دۆزیمەوە، خۆشــی لەوەدا بوو لەکـاتی لێکۆڵینەوەی موخابەراتی نەرویجی پارێزەرەکەم خەوی لێکەوتبوو!

لەبەرچاوی لێکۆڵەرەوەکەی موخابەرات هەڵمسـاند لەخەوو وتم تۆ پارێزەری منیت ئاگات لێم بێت، وتی باشــە بەڵام ژوورەکە گەرمە با ئیسر‌احەتێك وەرگرین لە دوای خەوی ئەوەوە چوون بۆ ئیسراحەت.

ئەو شەوە لە زیندانی ئۆسلۆ لە ژوورێکی ئینفرادی ٢م بە ٢م دا زیندانی کرام و بۆ بەیانی کاتژمێر ١١ بردیانم بۆ زیندانی دادگایی ئۆسـلۆ، ئەویش هەر ٢م بە٢م بوو لە دەوروبەری کاتژمێر یەك بۆ دوو برامە بەردەم دادوەر.

تا ئەو ساتە وەختەش نەمدەزانی بۆچی گیراوم، بەڵام قسەکەی سەسیلم لەبیر بوو دەمزانی ئەمە پەنی ئەوانە، تا ئەو سـاتە وەختە نەمدەزانی ئەو تۆمەتانە چییە ڕووبەرووم دەبێتەوە. بەهەر حاڵ پارێزەری موخابەرات دەسـتی کرد بە گفتوگۆ لەســەر من. لەدڵی خۆمدا دەمووت خوایە من چیم کردبێت و چیم ڕووبەڕوو بکرێتەوە.

لە دوای ئەوەی پارێزەرەکەی موخابەرات دەســتی کرد بە قســە و وتی: ئێمە تەنها گومانمان هەیە لەسەر ماکوان کەریم.

لەســەر گومانی حكومەتی ئیتاڵی دەبێت ماكوان تەســلیم بە ئیتالیا بكرێت. ماكوان هەوڵی داوە و پیلانی گێڕاوە بۆ كاری تیرۆر لە ئیتاڵیادا و بۆیە داوا دەكەین تەسلیم بە ئیتاڵیا بكرێت.

پاشــان حاكمەكە منی بانگكردو وتی خۆت بناسـێنە و ئەو تۆمەتانە لەســەر تۆیە، چی لە بارەوە دەڵێیت ئەوە موتەرجمیشت بۆ گیراوە؟

ماكوان: جەنابی حاكم من نەرویجیم پێویستم بە موتەرجم نییە.

ناوی خۆم و زانیاری تەوام دا و وتم هەمووی قســەی بێمەعنایە و هیچ فڕی بەڕاستیەوە نییە.

حاكم: كەواتە تۆ نەرویجیت؟

ماكوان: بەڵێ

ئیتر لەوێدا وەزعەكە گوڕا لە سفرەوە بۆ ١٠٠پلەی سەدی، پرسیار كرا لەسەر من ئایا لە نەرویج لەماوەی ١٧ ســاڵی ژیانیدا هیچ كێشــەیەكی هەبوو لە پۆلیس و موخابەرات؟

وەڵام درایەوە كە من لە وڵاتی نەرویجدا هیچ كێشــەیەكم نییە هیچكات ڕووبەڕوی دادگاو پۆلیس نەكراومەتەوە.

حاكم: نەرویجی هەرگیز تەســلیم بە وڵاتێكی تر ناكرێت، ئەگەر بەڵگەتان هەیە لەســەری فەرموون لێرە لێكۆڵینەوەی لەگەڵدا بكەن و یاخود بەڵگەكانتان بخەنە روو.

پارێزەری موخابەرات؛ تا ئێســـتا هیچ بەڵگەیەکمان بەدەســـت نەگەیشـــتوە لەسەر ماکوان، بەڵام بەڵگە هەیە ئیتاڵییەکان پەیمانیانداوە بۆمان بنێرن.

لەدڵی خۆمدا وتم دیارە ئیمەیل و فاکس و بەریدی ئەلکترۆنییەکان بەکار نایەت لە کاری موخابەراتدا، یان سەسیلە خوێری بۆی کۆنەکراوەتەوە.

بەهەر حاڵ هیچ بەڵگەیەك نەبوو لەسەر من کە تۆمەتەکانیان پشت ڕاست بکاتەوە، پارێزەرەکەشـم هەڵسـا دەسـتی کرد بە قسـە من بڕوام وابوو هیچ نازانێت، بەڵام هەڵسـاو ئەوەندە قسـەی جوانی کرد ،خەوەکەی لەبەرچاومدا سڕییەوە!

پارێزەرەکەم: ئەمانە هیچ بەڵگەیەکیان لەســـەر ماکوان نییە و ماکوان خاوەن کارە و خاوەن دوو منداڵە و ئەگەر بیهێڵنەوە کارەکەی لەدەســـت ئەدات و پـاشـــان هیچ بەڵگەیەکی کۆنکرێتی نییە تـا فەرمـانی دەســـتگیرکردنی بۆ دەرچێت..

پارێزەرەکەی موخابەرات: بە یاسای ١٧ و ١٨ و (یاسایەکی تریشی وت لەبیرم نەماوە) ئێمە دەمانەوێت ماکوان دەستگیر بکرێت، چونکە ماکوان کەسێکی سەنتراڵە و ئەگەر بچێتە دەرەوە هەموو بەڵگەکان دەشێوێنێت. واتا لەدوایی ئەوەی بەڵگە نەبوو بەم یاسایە داوایان کرد کە من دەستگیر بکرێم، چونکە من بەڵگەکان دەشێوێنم.

لەســـەر بنەمای قســـەکەی پارێزەرەکەی موخابەرات داوای ســـێ هەفتەی زیندانی لە حاکم بۆ کردم..

پارێزەرەکەم دەستی کردەوە بە قسە و وتی: من هیچ بیانوویەک نابینم بۆ دەستگیرکردنی ماکوان.

حاکم: پاش کەمێکی تر حوکمەکەم دەردەکەم.

من دیسانەوە کەلەبچەکرام و سواری سەیارەی پۆلیس کرام و لە دوای کاتژمێرێك لێخوڕین گەیشتمە زیندانێك بەناوی ئۆلەشموو، هیچم نەدەزانی دیسانەوە بۆ زیندانی ئینفرادی و نازانم حاکم چیی وتوە.

ژووری ئەم زیندانە نوێیە ٣م بە ٢م بوو مێزو کورسی و تەلەفزیۆنێکی تێدا بوو، منیش بێ ئەوەی خەیاڵم لای حوکمەکەم بێت تیڤیم کردەوە. تەماشام کرد لە تەلەفزیۆن باسی من دەکات دەڵێت ئەو کەسەی تەمەنی ٣٨ ساڵە و خاوەن دوومنداڵە دووهەفتە زیندانی بۆ بڕایەوە لەگەڵیدا کۆنترۆڵ وهیچ کەس بۆی نییە سەردانی بکات و هەموو شتێکی لەژێر کۆنترۆڵدا دەبێت.

بەهەر حاڵ هیچ چارەم نەما و خەم دایگرتم و لەوێدا قوڕگم پڕبوو بوو لە گریان.

نەك بۆ خۆم، بەڵکو بۆ ئەوانەی کە زیندانن بەناحەق بۆ ئەوانەی خاوەن منداڵن.

شەوان و ڕۆژانی ناو زیندانم چۆن دەبردە سەر، لە ئینفرادی چاوەڕێ بووم تا دووهەفتەکە تەواو بوو دیسانەوە خۆم ئامادەکردەوە بۆ ئەوەی بچمەوە بۆ دادگا بزانم لەدوای ئەم دووهەفتەیە لە ئیتالیاوە بەڵگەکان دەنێرن، هیچ کام لە سەسیل و حەزقیلیش دیار نەبوون.

لەدوای ئەوەی کە چوار هەفتەی ترم بۆ نوێ کراییەوە دەست بەجێ ئەمجارە داوای تێهەڵچوونەوەم کرد (ئیســتئناف) دادوەر قبوڵی کرد، بە پارێزەرەکەمی وت: ماوەی ســێ رۆژتان لەبەردەمدایە بۆ تانەدان لە حوکمەکەی ماکوان، پاشان راستەوخۆ بە موخابەراتی وت: ئەگەر بەڵگەی کۆنکرێتی نەهێنن ئەوا ئیتر ناتوانین لەوە زیاتر ماکوان دەستبەسەر بکەین، چونکە من لەسەر هیچ بەڵگەیەك دەست بەسەرو ڕاگیراو نەکرابووم لە زیندان، بەڵکو تەنها لەسەر قســەی ئیتاڵیا کە نەرویجی ڕاســپاردوە بەوەی ئەگەر لەدەرەوە بم ئەوا من پەیوەندی بەو خەڵکانەوە دەکەم و بەڵگەکان دەشــێوێنم. لە کاتێکدا ئەمە قســەیەکی زۆر نامەعقول بوو. ئاخر باشــە ئەگەر ئەو خەڵکە گیراون چۆن بەڵگە دەشێوێنریت و من چۆن دەتوانم پەیوەندییان پێوە بکەم، بەهەر حاڵ هەستم دەکرد شتێکی زۆر نائاساییە، هەر دەستی شەیتانی ئینس و جنی تێدایە.

بەردەوام من لە زینــدانــدا بووم لەمــاوەی دوو هەفتە کتێبێکم نووســی بەناونیشانی (ئاوێتە بوون و خۆڕازاندنەوە بە سیفاتی پەروەردگار) شیکاری لەســەر نــاوە پیرۆزەکــانی خوای گەورە دەکەم کەچۆن بتوانین لە ڕێگــای ســیفاتەکانییەوە خۆمانی پێ کامڵ بکەین وەك مرۆڤ. بە ١١٦ پەڕی ئەم دیواو دیو واتە ٢٣٢ لاپەڕە لە زینداندا کۆتایی هات ، سەرقاڵ بووم بەمەوە.

پاشــان کتێبێکی ترم نووســی بە ٥٧ پەڕ تەواوم کرد، واتە ١١٤ لاپەڕە کە باس لەکۆتایی مێژوو دەکەم ڕەخنەیە لەســەر فیکری شــارســتانی ڕۆژئاوا بەناوی (کۆتایی مێژوو) فرانسیسۆ فۆکۆیاما.

سەرقاڵ بووم بەم نووسینانەوە کاتەکانم دابەش کردبوو، زۆر بێ مەجال بووم. کاتم تەرخان کردبوو ڕۆژی دوو جوزء قورئان بخوێنم بەیانیان کاتژمێرێك و چارەکێکم دەویســـت بۆ جوزئێك شـــەوانیش یەك کاتژمێر. ئینجا ســـەرقاڵی فەرمووده قودسـیيەکان بووم و شـەرحی ئیمامی نەوەویم لابوو بە شـیکاری شـێخ عوسـەیمین لەگەڵ تەفسـیرە نایابەکەی سـەید قوطب لە کتێبخانەی زیندانەوە زیاد لە ١٥ کتێیم بۆ هێنرا و دەستم کرد بە خوێندنەوەو نووسین.

هەندێك کاتی ترم دانابوو بە تەماشـای تەلەفزیۆن لەوانە کەناڵی کوردسـاتم هەبوو لەگەڵ کەناڵی پارتی و گەلی کوردســتان و کۆمەڵەی ئێران.. لەکەناڵە عەرەبییەکانیش دوبەی دووکەناڵ واتا دراما وسپۆرت و کەناڵی قورئانی کەریم و سکای نیوز.

هەموو شـــەوێك کاتژمێر ١٠ تەماشـــای درامایەکم دەکرد لە کوردســـات زۆر بەلامەوە خۆش بوو بەنـاوی ســـەردەمی شـــکۆمەنـدی تـا زنجیرەی ٣٠م لە زینداندا بینی. ڕۆژی ١٨ مانگی ١٢ ســـاڵی ٢٠١٥ ڕۆژی هەینی دەســـتنوێژم گرت کاتژمێر ١٢ نیوەڕۆ بوو وتم ئەمڕۆ هەینییە نوێژەکەم تەخیر دەکەم بۆ کاتژمێر یەك. هەموو ڕۆژێك کاتژمێر ١٢:٣٠ بۆ ماوەی یەك کاتژمێر دەیانبردمە دەرەوە بۆ هەڵمژینی هەوای پاك.

لە ژوورەکەمدا جەرسێك و مایکرۆفۆنێکی تێدابوو ئەگەر سەرم بێشایە داوای حەبم بکردایە لەگەڵ ریسـێپشـندا قسـەم دەکرد،.کاتژمێر ١٢:٣٠ زەنگیان بۆم لێدا وتیان خۆت ئامادەکە دەچیتە دەرەوە، منیش وتم کاتی نوێژە کاتژمێر ١:١٠ دەچمە دەرەوە.

پۆلیســـەکە وتی: ماکوان مەبەســـتم ئەوەیە تۆ دەچیتە دەرەوە بە تەواوی هیچت لەســـەر نییە و بەڵگەیان لەبەر دەســـتادا نییە بۆ هیشـــتنەوەی تۆ. لەڕاستیشدا من حوکمەکەم ٨ ڕۆژی ترم مابوو تەواوی بکەم واتا ٢٥مانگی ١٢ ئازاد دەکرام. کەوای وت لە خۆشیدا سەرمکردە سەر سوجدە ئەو هەر قسەی دەکرد.

دەیووت شـــتەکانـت کۆکەرەوە پاش کەمێکی تر دەچیتە دەرەوە من هەر وەڵامم نەدایەوە.

هاتن ئازادیان کردم، بەڵام بۆچی گرتیانم و بۆچی ئازادیان کردم ئێســـتاش نازانم.

چیم لەســـەر بوو هەر نازانم، دوای ئەوەی کە هاتمە دەرەوە لە کەناڵەکانی نەرویجەوە باســـیان لەوە دەکرد کەمن هیچ تاوانێکم نەبووە، بەڵکو هیچ بەڵگەشـی لەسـەر نەبووە کە دەسـتگیرکراوە، نەرویج بڕیاری گرتنی نەداوە، بەڵکو ئیتالیا بووە پاشان بە فەرمانی ئیتالیاش ئازادکراوم.

دوای ئەوەی کەچوومەوە بۆ ســـەر کـارەکەی خۆم ئەوانیش پـارەی یەك هەفتەیان لێدزیبووم و دەڵێن بەبێ هۆکار ڕۆشتتوە و ئیشـەکەشم لەدەسـت دا، ئەوەش بەسەرهاتی گرتنەکەمە کە سەسیل هەڕەشەی لێکردم.

لەدوای ئەوەی بێیش بووم بەدوای کاردا دەگەڕام ڕۆژێك لەدەرەوە سەسیلم بینی، کە هات بەرەو ڕووم دەســـتم دایە بەردێك پیایدا بکێشـــم کەزانی زۆر تورەم لەبەرچـاومـدا نەمـا، ڕۆژانە بەدوای کـاردا دەگەڕام تـا کـارێکی ترم دۆزییەوە سوپاس بۆ خوا بەردەوام بووم بەو کارەوە، ئینجا ڕۆژێك حەزقیل-م

بینی لەگەڵ کچێکی زۆر جوان لە ناسـك ناسـكتر بوو لە جوانیش جوانتر بوو، لەتاو جوانی ئەو کچە حەزقیلم لەبیر چووە وە. وتم حەزە گیان ئەمە کێیە؟

حەزقیل: ئەمە حەنانەیە.

ماکوان: حەنانە کێییە؟

حەزقیل: خزمی خۆمانە حەز دەکات تۆ بناسێت

ماکوان: حەنانە تۆ خزمی حەزقیلی یان خزمی منی؟

حەنانە: من تەرەفی تۆم تۆ چیت بوێت من ئەوەی تۆم.

# ماکوان و حەنانە

تەعاروفمان لەگەڵ ئافرەتێکی جنۆکەدا کرد لە ڕێگای حەزقیلەوە بەناوی حەنانە، جوانی حەنانە خەیاڵی بوو. پرسیم حەنانە خەڵکی کوێیت؟ بۆ ئەوەی هەندێك موجامەلەی بکەم.

حەنانە: بە پێکەنینەوە من خەڵکی وڵاتی ماکوانم. ئەڕێ بەڕاست ئێوەی مرۆڤ بۆ وەك خۆتان بیردەکەنەوە سیستەمی ژیانی ئێمە وەك ئێوە نییە، بەتایبەت من و حەزقیل کە لە تایفەی عفریتین.

ماکوان: بۆ ئێوە وڵاتتان نییە؟

حەنانە: نا، من لە ئاسمانەوە هاتوومەتە ژیان!

ماکوان: خۆم ڕۆ، بۆیە لە تەیارە دەچیت، بە پێکەنینەوە

حەنانە: ماکوان من پێویستە بێمە ناو لاشەی تۆ بۆ ئەوەی هیچ کام لەو جنۆکانەی سەسیل نەیەنە ناو لاشەی تۆ، تا - سیحرەکە بەتاڵ دەکەینەوە.

ماکوان: جا ئەم سیحرە کەی بەتاڵ دەکرێتەوە؟

حەنانە: ئەی حەزقیل پێی نەوتی دەبێت بگەڕێیتەوە بۆ کوردستان و لەوێ بەتاڵ بکرێتەوە، بەشەکەی تری لە کەرکوکە، لەماڵی خەسووی ئەوژنەی کە کێشەکەی بۆ دروستکردی.

ماکوان: ڕوناك خان؟

حەنانە: بەڵێ.

ماکوان: حەنانە بۆ من ئاسـاییە، بەم هەموو جوانییەوە ئایا گوناح نییە بێیتە لاشــەمەوە، تۆ ئافرەتی. من نازانم ئایا لە ڕووی شــەرعییەوە جائیزە یان نا دەبێت پرسیار بکەم.

حەنانە: لەشــەرعدا شــتێك هەیە بەناوی کەمترین زەرەر، تۆ ئەبێت بزانیت ئەگەر من نەیەمە لاشەتەوە پارێزگاریت لێنەکەم، ئەوە دڵنیابە سەسیل جنی تر دەنێرێت و ئازارت ئەدەن، بەڵام ئەگەر بزانرێت من لەناو تۆدا نیشتە جێ بووم ئیتر ناتوانن بێن بەتایبەت، من کە مێینەم.

ماکوان: ئاساییە بەڵام تۆ ئەچیتە لاشەی منەوە چی دەکەیت، واتا لەناو لاشەی مندا ئوتێلە، خۆشی چییە کە ئێوە دەچنە ناو لاشەمان؟

حەنانە: بۆ ئێمە هیچ خۆشــییەکی تێدا نییە، بەڵکو زۆر قورســە و هەموو جنۆکەکان ئەوەیان پێخۆش نییە، تەنها شــەیتانەکان پێیان خۆشــە بۆ ئەوەی مرۆڤەکان تووشی تاوان بکەن و لە خوا دووریان بخەنەوە.

ماکوان: لەناو ئێوەدا شەیتان هەیە، کە عیفریتن؟

حەنانە: بەڵی شەیتان لەناو هەموو تایفە جنۆکەکاندا هەیە، شەیتان پۆست و مەنصبە، ئێوە مرۆڤ ناوتان لێناوە شەیتان.

ماکوان: باشـــە من ســـەرم لەوە دەرناچێت لەناو مەســـیحییەت و جولەکە و تەنانەت ئایینی هیندییەکاندا بەهەمان شێوە باسی ئێوە دەکەن و لە لاشەی خەڵکیدا دەری دەهێنن و هەندێکیان بە ڕۆحی شـــەڕەنگێز و پیس ناوزەدی دەکەن، ئەی ئەمەیان چییە؟

حەنانە: بڕوا بکە ماکوان هەمووی درۆ و دەلەســـەی خۆیانە و شـــەیتانەکان لەگەڵ ئەواندا تەنها لەسەر بنەمای سیحر و جادوو ڕێکەوتون و بەو شێوەیە کار دەکەن، هیچ پەیوەندی نییە بە خواناسی و دەرکردنی جنی لە ناو لاشەی خەڵکیدا لە ڕێگای تەورات و ئینجیل..هتد، دەڵێت ئەو کارە دەکەن، بەڵام هیچ نییە هەر قسەیە و ئەوان بەردەوام لە تاواندان، بۆ ئەوەشی کە بینیوتە بەناوی تەورات ئینجیل و هەر ناوێکی تر دەکرێت هەمووی سیحر و جادووە و هیچی تر، بەکوردی خۆتان دیکۆرە. تاکە کاریگەری لەســـەر جنی خراپەکار و شەیتان وەك ئێوەی مرۆڤ دەڵێن: قورئانی پیرۆزە.

ماکوان: تێمگەیەنە لەوەی لەناو لاشـــەی ئێمەدا ئێوە چ کارەن، ئەگەر تۆ لە لاشەمدا نەبیت ئەوان چ دەکەن و تۆچی دەکەیت؟

حەنانە: باش گوێگرە و بە هاوڕێکانیشت بڵێ، من ئامۆژگاریت دەکەم بەوەی ئێمە هیچ توانایەکمان نییە بەسەر ئێوەدا، ئەوە خۆتانن دەرگای وەسوەسە بۆ جنۆکەو خراپەکارەکان و شەیتان ئاساکان دەکەنەوە کە ئەو جۆرە کارە بکەن، دەنا ئێمە هیچ دەســـەڵات و توانایەکمان نییە بەســـەر ئێوەدا، من وا تەمەنم ٦٧٠ ساڵە!

ماکوان: چی بۆ خاتری خوا ٦٧٠ ساڵ، هەر ئەم ساڵە خۆمان کە حسابی دەکەین؟ بەڕاستتە یان درۆم لەگەڵ دەکەیت؟

حەنانە: نا ماکوان درۆت بۆ لەگەڵ دەکەم، سیستەمی ژیان لای ئێوە زۆر جیاوازترە لە سیستەمی ژیان لای ئێمە.

ماکوان: تۆ زۆر ڕۆشنبیر دیاریت زانیاری باشت لایە، بە ئوسلوب و قسەکردنتدا دیارە، بەس ئەم دەمو چاوە جوانە کە تۆی پێدەبینم وامزانی ساڵی ١٩٩٥ لەدایکبوویت.

حەنانە: ئاخر دەبێت ئەوە بزانیت ئەوەی فێربووم لە ئێوەی مرۆڤ فێربووم، هەموو قورئانم لەبەرە لەزۆربەی زانستە ئیسلامییەکان شارەزام، لە زۆربەی زانکۆکانی جیهاندا ئامادەیم هەبووە بۆ وەرگرتنی زانیاری، خۆ لەناو جنۆکە قوتابخانە و پەیمانگا و زانکۆ ئەو دەزگایانە نییە، بەڵکو هەموو لە ئێوەی مرۆڤەوە فێربووین و وەرمانگرتوە.

بڕوا بکە ماکوان جاهیلترین ئومەتێك لە سەر ئەم زەوییەدا ئێمەی جنۆکەین، بەداخەوە هەندێك لە ئێوەی مرۆڤ زۆر ئێمەتان گەورەکردووە.

ماکوان: چۆن ئێوەمان گەورە کردووە؟

حەنانە: بۆ نمونە خەڵکی کە تووشی فەشەل دەبن خۆی کەسێکی دۆڕا و و فاشلە دەڵێت سیحرم لێکراوە، جن چۆتە لاشەم، زۆر ئافرەتان هەیە دەڵێت جنۆکە لەگەڵمدا خەوتووە، هەموو ئەمانە بۆ پاساو هێنانەوەی فەشەلی ئێوەی مرۆڤە، خۆی زینای کردووە دەینێت بەسەر ئێمەدا.

ماكوان: قسەكانت خۆشە ؛ كەواتە ئەم سيحر و شتانەشى لە من كراوە ڕاست نييە.

حەنانە: با، ڕاستە بەڵام لە بارستايى خۆى زياترتان كردووە، بۆ نمونە ئەگەر ٥ كيلۆ بێت ئێوە كردوتانە بە ١٠٠٠كيلۆ!

ماكوان: ئەوەندە جياوازى هەيە؟

حەنانە: جوان گوێبگرە و تەماشـــا بكە بزانە، خۆت جياوازييەكە نابينيت و هەستى پێناكەيت.

ماكوان: ئادەى چۆن تەماشاى چى بكەم؟

حەنانە: خواى پەروەردگار لە قورئاندا لە باسى شەيتاندا چى دەفەرموێت؟

ماكوان: زۆرى فەرمووە لەوبارەوە نازانم مەبەستت چييە؟

حەنانە: دەزانم بەڵام لەبارەى شەيتانەوە دەفەرمووێت:

(إن كيد الشيطان كان ضعيفا) واتە بەڕاستى پلانى شەيتان زۆر پلانێكى لاوازە!

خواى پەروەردگار بۆ ئێوەى باس دەكات، خۆ بەرانبەر بەخۆى نييە، تا بڵێت پلانى شەيتان بەرانبەر بە زاتى الله لاواز بێت، شەيتانەكان هيچيان پێناكرێت بەرامبەر بەخوا، خۆت ئەوە باش دەزانى وايە؟

ماكوان: بەڵێ وايە.

حەنانە: دەی کەمادام وایە ئیتر شـــەیتان هیچی پێناکرێت ئێوەی مرۆڤن شەیتانتان گەورەکردووە، ئەزانی؟

ماکوان: زیاتر ڕوونی کەرەوە حەنانە-ی بەڕێز؟

حەنانە: خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێت: کاتێك مرۆڤەکان پلان دەگێڕن شاخ دەتوێنێتەوە، ئەوە دەقی ئایەتەکەیە:

(وَقَدْ مَكَرُوا مَكْرَهُمْ وَعِندَ اللَّهِ مَكْرُهُمْ وَإِن كَانَ مَكْرُهُمْ لِتَزُولَ مِنْهُ الْجِبَالُ) واتە: پلان و فێڵی مرۆڤ ئەوەندە بەهێزە شـــاخ دەتوێنێتەوە، دەی کەواتە توخوا عەیب نییە بەقســەی خوا ناکەن و خۆتان بەشـــتی خوارفییاتەوە کە ئێمەی جنۆکە هیچمان بۆ ناکرێت سەرقاڵ کردووە.

ماکوان: ئەمەی تۆ باسـی دەکەیت وایە، بەڵام تەماشـای سـەسـیل بکە چەند جارە هەڕەشە لە من دەکات وهەڕەشەکانی دەباتە سەر.

حەنانە: وانییە ئەو تەنها ئاگاداری مەلەفی تۆیە، دەنا ئەو هیچی پێناکرێت، یەك کار کە توانیویەتی بیکات زانیاری پێشـوەختی دەسـت ئەو کەوتوە تۆی ئاگادار کردۆتەوە یان تۆی پێ ترساندوە. تۆش ئەوت لا زۆر موهیم بووە، دەنا هیچی پێناکرێت بەو بیرکردنەوەی ئێوە بێت، ئێمە جنۆکەو شـەیتانەکان یەك مرۆڤمان نەدەهێشـت لەسـەر زەویدا، کە دادەنیشـین لەناو خۆماندا ئێمەی جنۆکە هەزار خۆزگە بە ئێوە دەخوازین و خوا خوامانە کە مرۆڤ بووینایە.

ماکوان: ئەی ئەم هەموو کاریگەری ســیحرە چییە لەســەر ئێمەی مرۆڤ و سیحر دەکەن و جنۆکەکانی لای ئێوەش بەشدارن و خەڵك دەبەستن و خەڵك

دەکەنەوە و نوشتەی ڕەشی دەکەن و نازانم ئەنواع و ئەشکال شتی قۆڕ و بێمەعنا دەست دەکەوێت لای ئێوەی جنۆکە.

حەنانە: بڕوا بکە ماکوان ئەوە هەموو خۆتانن. ئێوەی مرۆڤن ئەم کارە قۆڕ و بێمەعنایانە دەکەن، دوو شت زۆر گرنگە بیزانیت. یەکەم: کە ئێوە مافی شەیتانتان خواردوە ئەو لە کەمیندایە بۆ ئێوە. دووەم: لەجیاتی ئەوەی لە کەمینەکە ڕاکەن کەچی هاوکاری دەکەن.

ماکوان: ئاخر چۆن هاوکاری دەکەین؟

حەنانە: ئەگەر من پێت بڵێم برۆ ناو چاڵێک، پڕە لە ئاڵتون، لەوچاڵە هەنگوینی تێدایە، پاشان چوویت و جلەکانت پیس بوو لەناو چاڵەکە پڕبوو لەبەرد و لەجیاتی هەنگوینیش زێراب بوو، دوای ئەوەی کاهاتیتە دەرەوە هەمووگیانت گواو قوڕاو بوو خۆت تورە کرد بەسەر مندا چووی شکاتت لێکردم لای حاکم هەموو باسەکەت بۆ کرد. حاکم دەڵیت کێ بوو وای پێووتی؟ تۆش دەڵییت حەنانە. دەڵێت: حەنانە کێیە؟ دەڵییت: جنۆکەیە یان شەیتانە. حاکم ناڵێت ببەن بۆ شێتخانە؟

ماکوان: بەرێ وەڵڵا بە شێتم دەزانێت!

حەنانە: کاری جنۆکە و شەیتانەکانیش ئەوەیە، هەرچیتان پێدەڵێن بەقسەیان دەکەن و دوایش بەلەعنەتیان دەکەن. ئەوە ئێوەی مرۆڤی خراپەکارن کە دەبێت بەلەعنەت بکرێن، من پاکانە ناکەم بۆ شەیتان ئەو تەنها بانگتان دەکات ئێوەش وەڵامی ئەدەنەوە، خوای گەورەش باسی کردووە لە قورئاندا بەڵام ئێوەی مرۆڤ ئەقڵتان پێناشکێت.

ماکوان: لە کوێی قورئاندا باسکراوە ئەم باسەی تۆ دەیکەیت؟

حەنانە: لە سورەتی ئیبراهیم خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَقَالَ ٱلشَّيۡطَٰنُ لَمَّا قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمۡ وَعۡدَ ٱلۡحَقِّ وَوَعَدتُّكُمۡ فَأَخۡلَفۡتُكُمۡۖ وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيۡكُم مِّن سُلۡطَٰنٍ إِلَّآ أَن دَعَوۡتُكُمۡ فَٱسۡتَجَبۡتُمۡ لِيۖ فَلَا تَلُومُونِي وَلُومُوٓاْ أَنفُسَكُمۖ مَّآ أَنَا۠ بِمُصۡرِخِكُمۡ وَمَآ أَنتُم بِمُصۡرِخِيَّ إِنِّي كَفَرۡتُ بِمَآ أَشۡرَكۡتُمُونِ مِن قَبۡلُۗ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ٢٢﴾ [إبراهيم]

(کاتێ هەمووشـــت تەواو دەبێت بەهەشـــتییەکان دەچنە بەهەشـــتەوە و دۆزەخییەکان دەخرێنە دۆزەخەوە) شـــەیتان (بەفەرمانی خوا) دێتە قســـە و (ڕوو بە پەیڕەوانی) دەڵێت: بەڕاســـتی خوا بەڵێنی ڕاســـت و دروســـتی پێ ڕاگەیاندبوون منیش بەڵێنی درۆ و نادروســـتم پێدان و جا توانیم گومڕاتان بکەم و لە ڕێبازی ڕاست وێڵتان بکەم، وە نەبێت من هیچ زۆر و دەسەڵاتێکم بەســـەر ئێوەدا هەبووبێت، جگە لەوەی (بەوەســـوەســـە وخەتەرە و خەیاڵ) بانگم کردن (بۆ خوانەناســـی و تاوان) ئێوەش بەدەممەوە هاتن و بەقســـەتان کردم، ئیتر ســـەرزەنشـــت و لۆمەی من مەکەن، بەڵکو ســـەرزەنشـــت و لۆمەی خۆتان بکەن (کە ئاوا گێلانە، بێ بیرکردنەوە بەقســـــەتان کردم، ئەمڕۆ) من ناتوانم بەهانا و هاواری ئێوەوە بێم، ئێوەش ناتوانن بە هانا و هاواری منەوە بێن، بێگومان من باوەڕم نەبوو بەوەی کە کاتی خۆی منتان کردبوو بەشەریك و هاوبەش لە پێشدا، بەڕاستی ئەمڕۆ ستەمکاران سزای زۆر بەئێش دەدرێن.

ماکوان: ڕاستە.

حەنـانە: کەواتە ئێوەنە خـاوەنی ئەقڵێـك و ژیرییەکی زۆر بەرفراوانن لەماوەیەکی کەمدا بەدەستی دەهێنن و منیش ماوەی ٢٠٠ ساڵ زیاتر گەڕاوم تا توانیومە ببمە خاوەنی زانســـت، خۆتان تاوانبارن. بۆیە من ئامۆژگاریت دەکەم ماکوان کەسـایەتییەکی بەهێز و بەتوانات هەبێت، کە هەر بوویشـتە، ڕووبەڕوی ئەو هەموو خورافـاتە ببەرەوە کە بەنـاوی ئێمەوە- ئێوەی مرۆڤ دروستان کردووە پارەی پێ پەیدا دەکەن مافی خەڵکی پێدەخۆن.

مـاکوان: قســـەکـانـت زۆر جوان و لۆژیکن، بەڵام (پـارادۆکس) دەبینم لە قسەکانتدا، هەمووی دژ بەیەکە.

حەنانە: لەکوێدا دژ بەیەکە، پێم بڵێ با بۆت روون بکەمەوە.

مـاکوان: لەوەی کە دەڵێیـت ئێوەی مرۆڤ بەهێزن و جنۆکە لاوازە، کەچی ســـیحر لە من کراوە دەبێت بچم بەتاڵی بکەمەوە. ئەمە توانا و هێزی ئێوە دەرنـاخـات، یـاخود ئەگەر ئێوە نەبن من چۆن بمزانیـایە کە ئەم ســـیحرەم لێکراوە، ئەی ئەو ســـەســـیلە خوێڕییە ئەوەنییە لێم بووە بە ســـیکۆتین لێم نابێتەوە.

حەنانە: ئاخر خەتای خۆت بووە بۆ ســـیحرەکە، خۆت توانات نەبوو بەتاڵی بکەیتەوە وەك ڤایرۆس تووشـــیان کردوویت، ئەوە خۆت تاوان باریت. ئەی پێشتر بۆ وانەبوویت؟

ماکوان: ئەی لەلاشەی مندا چی دەکەیت تۆ واچوویتە ناوی؟

حەنانە: تۆ بلیت ببڕە بگەڕێرەوە بۆ کەرکوك لەوێ قســـە دەکەینەوە یەکتر دەبینین

ئێستا من دەڕۆم و تۆش بڕۆ بۆ سەر کارەکەت، ئەم حیوارە بەدەم ڕێگاوە بۆ کار ڕوویدا.

بەقسەم کردن دەستم کرد بە کڕینی بلیت بۆ کوردستان و دوای گیرانەکەم بە ٣ مانگ بڕیارمدا بگەڕێمەوە بۆ کوردستان و سەردانی کەسوکاریشم بکەم، بلیتم بڕی بۆ کوردستان لەڕێگای ستۆکهۆڵم سلێمانی.

ڕۆژێك سەسیلم بینی لەدوورەوە وتی نایەڵم بڕۆیتەوە، ئیتر دیار نەما، منیش هیچ گوێم پێنەدا.

لە ئۆسلۆوە سواری فڕۆکە بووم بۆ ستۆکهۆڵم و لە فڕۆکەخانەی نێودەوڵەتی ئایرلاندا ســـوید دابەزیم چاوەڕێی فرۆکەی ســـتۆکهۆڵم ســـلێمانیم دەکرد، کەچوومە ناو گێتەکەی خۆم واتا شوێنی وەستانی فرۆکەکە پشکنین کراینەوە بۆ جاری دووەم تەنها بۆ پاســـپۆرت بۆ ئەو فرۆکانەی کە دەچنە دەرەوەی ئەوروپا پێویستە جارێکی تر پاسپۆرت نیشان بدرێتەوە، نیشانمدا و کەوتنە قسەکردن لەگەڵ هاوڕێ پۆلیســـەکانیاندا و هەندێك تەماشای کۆمپیتەریان کرد و ئەوەندەم زانی دوو پۆلیسی سویدی هاتن کەلەبچەیان کردم.

فرۆکەکەشم نیو کاتژمێری ماوە بۆ فڕین، دەستگیرکرام و بردیانم بۆ زیندان.

## لە زیندانی فرۆکەخانەوە بۆ زیندانی ستۆکهۆڵم

لە دوای ئەوەی کە بردیانمە ژووری پشـــکنین لە فرۆکە خانە، وتیان لێرە چاوەڕێ بکە دوای نیو کاتژمێر ژنێکی پۆلیس هات بۆلام وتی: ماکوان تۆ ناتوانیت ســـەفەر بکەیت، ئێمە ڕادەســـتی ئیتالیا-ت دەکەین و پۆلیســـی ئەنتەرپول داوات دەکات.

کەوای وت زۆرم پێناخۆش بوو، بەڵام راستەوخۆ سەرم کردە سەر سوجدە و سوپاسی پەروەردگارم کرد. ئافرەتەکە بەجێی هێشتم منیش لە جێگای خۆمدا لە ژوورەکەدا دانیشتمەوە، تەلەفونم بەدەستەوە بوو ماموستا عەبدورەحمان محەمەد عارف لە فەیســـبووك لەســـەر خەت بوو، وتم: کاکە کۆڕو هەموو چالاکییەکانم هەڵوەشـــینەرەوە من گیرام و ڕادەســـتی ئیتالیا دەکرێم، دوای ئەوە خێزانم ئاگادار کردەوە کە من ناتوانم بگەڕێمەوە، خێزانم و منداڵەکان هەفتەیەك پێش من گەڕابوونەوە کوردستان.

هەر لەدوای ئەوە بە تەلەفون کوڕێکی برادەری خۆمم ئاگادار کردەوە لە نەرویج کە گیراوم و پارێزەرەکەم ئاگادار بکاتەوە.

چارم نەما خۆم ئامادە کرد بۆ ئەوەی ڕادەســـتی ئیتالیا بکرێم، ئەو شـــەوە لە زیندانی فرۆکە خانە مامەوە بۆ بەیانی هێنایانمەوە بۆ زیندانی ستۆکهۆڵم.

سـەرئێشـەیەکی زۆر قورسـم بۆ هاتەوە، داوام کرد لە پۆلیسـەکانی زیندان کە حەبێکی سـەر ئێشـەم بۆ بهێنن، پۆلیسـێکی هەتا بڵێی خوێڕی حەبەکەی بۆ

هێنام و فڕیدایە سەر زەویەکە بۆم، واتا لە کونی پەنجەرەی دەرگاکەوە نەیدایە دەستم فڕێیدایە سەر زەویەکە.

منیش بەهەرچیان هەیە هاتمە خوارەوە بە هەموو پۆلیس و سوید و مەلیکەکەشیان ئەوەشی کە لەو دەزگای پۆلیسە کار دەکات. ئەوەندەش سەرئێشەکەم توند بوو دامی بەسەر زەویدا و تا ماوەیەك بێهۆش کەوتم، ئەو شەوە مامەوە لەزیندانی ستۆکهۆڵم و بۆ بەیانی باشتر بووم، نەمدەزانی کاتژمێر چەندە بانگی پۆلیسەکانم کرد وتم دوێنی یەکێك لە ئێوە ئەو کارەی کردووە، کە وام وت یەکێکیان گوێی لێبوو وتی داوای لێبوردن دەکەین کارێکی زۆر نەشیاوی کردووە.

پاشان وتم دەمەوێت کاتی نوێژەکان بزانم من نازانم کاتژمێر چەندە من موسوڵمانم دەمەوێت نوێژ بکەم تکایە کاتەکانم پێبڵێن بۆ ئەوەی کاتی نوێژەکان بدۆزمەوە.

کەسێکی لێبوو لە بنەڕەتدا عەرەب بوو ناوی عەلوش بووکارمەندی ئەو دەزگا پۆلیسی سویدیە بوو، کەوام وت بەتانییەکی زیادەی بۆ هێنام و خواردنی بۆ هێنام و فەلافلی هێنا و هەندێك شەربەت و ساردی و نانی هێناو وتی بیخۆ هەرچی پێویست بوو ئەمڕۆ منی لێم بۆت دێنم.

وتم حەبی سەرئیشەم بۆ بهێنە زۆر سەرم دێشێت. خوا هەڵناگرێت هەرچیم داواکرد هەمووی کرد، کاتی نوێژی عەسربوو خاولییەکم کردە بەرماڵ و چوومە ناو نوێژەوە زۆر دڵم پڕبوو، دڵ پڕبوونەکەشم لەبەر ئەوە نەبوو کەبترسم، بەڵکو لەبەر ئەوە بوو کە هیچم نەکردووە و ئیتالیام نەدیوە

نەچوومەتە ناوی لەو ماوەیەی كە لەنەرویجدا ژیانم كردووە. زوڵمیكی زۆر گەورەبوو لێمدەكرا، بەبێ هیچ شتێك تەسلیم بە ئیتالیا بكرێم، خەمی هیچم نەبوو دەمزانی لەوێش بێت هەر ئازاد دەبم، بەڵام بەزەیم بە ئانا و لیندا دەهاتەوە منداڵن و پێویستیان بە باوكە لە ئەوروپا كەسوكار زۆركەمە، وەك كوردستان نییە تا پور هەبێت، نزیك بیت و مام و خاڵ هەموو لەیەك شار بن، تۆزێك خەفەتی ئەوەم دەخوارد دەنا هیچ شتێك بەخەیاڵی ماكوان-دا نەدەهات وە هەر سوپاسگوزاری خوای پەروەردگار بووم.

لەنوێژەكەدا بیری ئاناو لین-م كەوتەوە كە لە كوردستان چاوەڕێی ئەوەیان دەكرد من بگەڕێمەوە و قوڕگم پڕبوو لەگریان، هەرچۆن بوو نوێژم تەواو كرد بە گریان و هەنسكەوە. كە تەواو بووم ئاناو لین-م لە بیرچووەوە، گریانم بۆ منداڵی بێ باوك و زیندانییانی مەزڵومی ئەم جیهانی ئیسلامییە دەڕشت، بیرم لەوە دەكردەوە چەندە موسوڵمان بەبێ تاوان و تۆمەت و سیناریۆی بۆ دروستكراوە منداڵەكانی بێنازن، ئاخۆ چەندە منداڵی لارە ملی بێباوك، دایكی بەڕووی سوورەوە پارەی پێنییە ئێوارە خوانێكیان بۆ بڕازێنیتەوە.

جا وا ڕازاندییەوە بۆ منداڵەكان بەبێ باوك تامی چییە، چەندە ئافرەتی بەڕێزی موحەجەبەی بێناز هاوسەرەكانیان لە زیندان خزێنراون كەس نییە خۆشەویستیان بۆ دەربڕێت، بیری زۆر شتی ترم دەكردەوە لەوەی كە زیندانییەكان چەندە مەزڵومن وهیچ دەسەڵاتێكیان نییە، هاوارم دەكرد خودایە فریایان كەوە بەدەنگی بەرز هاوارم دەكرد خوا گیان فریایان كەوە. دیمەنی خەڵكم دەهاتەوە بەرچاو زیندانەكەی خۆم لە چاو خەڵكی مەزڵومی تردا لێبووبوو بە هوتێلی پێنج ئەستێرە، لە ناو ئەوان خۆمم بیر چوو بووەوە. دەمزانی مام و خاڵ و پووریان و نەكیان زۆرە سوپاس بۆ خوا منداڵی من

کێشـــەی نییە و پەك لە پارەش ناکەوێت، بەڵام خۆم ئازارەکەم چەشـــت، بەزەییم بە خەڵکی تردا دەهاتەوە، بۆیە چەندجار هاوارم کرد خوایە گیان فریایان کەوە.

لەدەرگاکەم درا عەلوش هات وتی ماکوان ئەو دەنگە دەنگەت لەچیە؟

ماکوان: کاکە ئازادم قابیلە دەنگی مۆســیقام دابێتی و شـوقەکانی دراوســێم ئیزعاج کردبێت، دوعا دەکەم، دوعاش قەدەغەیە؟

عەلوش: نا هەر وتم پێت بڵێم دوعا زۆر مەکە ئازادبووی!

وامزانی پێم رادەبوێرێت، وتم عەلوش من دەنێرن بۆ ئیتالیا ئازادی چی، ئەوە چاوەڕێم لەوێ دادگای بکرێم من پۆلیسی ئەنتەرپول داوام دەکات.

عەلوش: ماکوان من هیچ نازانم ئاگادارکراومەتەوە کە تۆ ئازادی، ئەوە کاتژمێر ٢:٤٥ دەقیقەیە فەرموو بڕۆ دەرەوە، جێگای تۆمان نەماوە لەم زیندانەدا.

ماکوان: باشە جلەکانم لەکوێیە کوا جەنتاو شتەکانم؟

عەلوش: هەمووی پارێزراوە ئەوەتا بڕۆ بیانبە.

چوومە دەرەوەی زیندانەکەو لە رێســێپشــنەکە پۆلیســێك هات وتی: ببوورە ماکوان دەتوانیت بڕۆیت سەفەرەکەت بکەیت.

کەوای وت زۆر تووڕە بووم، وتم من بە فڕۆکە دەڕۆم نەك بە پاس فڕۆکەکەم دوو ڕۆژە فڕیوە.

دەستی کرد بە پێکەنین وتی ببورە هەڵە بووم.

ماکوان: باشە کاغەزێك شتێکم بدەنێ کە من گیراوم لای ئێوە.

پۆلیس: ببوورە هیچمان نییە بتدەینێ.

ماکوان: ئەی نازانیت من بلیتەکەم فەوتاوە، کێ قەرەبووی دەکاتەوە؟

پۆلیس: بڕۆ بۆ سۆسیال هاوکاریت دەکەن

ماکوان: پێویستم نییە سوپاس بۆ خوا گیرفانم پڕە لەپارە، ڕۆشتمە دەرەوە.

فەیسبووکەکەم کردەوە تەلەفونم کرد بۆ کوڕێکی شارەزووری بەناوی کاك عادل برای کاکە حەمەی حاجی سابیر بوو کاکەی پێشمەرگە بوون لەگەڵ باوکمدا، خوا هەڵناگرێت خێرا هات بەشوێنمدا چووینەوە بۆ ماڵی ئەوان و دوای ئەوە گەڕامەوە بۆ نەرویج بە شەمەندۆفیر چوومەوە بۆ ماڵی خۆمان.

ئەی خوای پەروەدگار چەندە دڵ تەنگ بووم ئەو ڕۆژانە، مانگی ٣ ی سەرەتای بەهارە بەتەنها لەماڵم کەسی لێنییە بیری ماڵ و منداڵ و چیشتو نانێکی گەرم و خۆش دەکەم. ئەوانیش تەلەفونم بۆ دەکەن هەموو دەڵێن خۆشحاڵین مادام تۆ ئازادیت وا ئێمەش دەگەڕێینەوە، نەم هێشت بگەڕێنەوە.

وتم ئیسراحەتی خۆتان وەربگرن ماوەی مانگێك مۆڵەتمان وەرگرتبوو ماڵو منداڵ لەکوردستان مانەوە منیش بەتەنها لە نەرویج بووم.

بەتەلەفون لەگەڵ خێزانم قسەم دەکرد: ئەوەندەم زانی گوێم لەدەنگی خشە خشی پێی خەڵکی بوو لەسەر قادرمەکانی ماڵی خۆمان، بەخێزانم وت

بێدەنگ بە بزانم ئەودەنگە دەنگە چییە، هەڵسام ڕووە و پلیکانەکان ڕۆشتم لەپڕ - حەنانە- م بینی.. هاوارم کرد حەنانە چۆنی یاخوا بەخێر بێیت.

خوا حافیزیمان کرد لەگەڵ خێزانم، وتم حەنانە خاتون بفەرموو وەرە سەرەوە کە تەماشام کرد لە ژوورەوە دانیشتوە ئەو چاوەڕێی من دەکات!

حەنانە: زۆر خەفەتت خوارد ماکوان وابوو؟

ماکوان: بەڵێ وابوو چار نییە، ئەو سەسیلە خوێڕییە ناخۆشی کردووە، خۆ ئەو هیچو پوچە بەردەستیشم ناکەوێت.

حەنانە: ماکوان قسەی پێ مەڵێ ئەڵێی چی بانگی بکەم، بێ بۆلامان؟

ماکوان: ئەترسم ئەو حەزقیل-ە بێ قیمەتە مورتەد بووبێتەوە و تۆش جاسوسبیت لەگە سەسیل؟

حەنانە: ئەی بۆ پێچەوانەکەی ڕاست نەبێت و سەسیل موسوڵمان و باش بووبێت؟

ماکوان: یاخوا وابێت - جا وایە؟

حەنانە: یەك داوات لێدەکەم ماکوان ئەو دیارییەی حەزقیل لابە لە گیرفانتدا.

ماکوان: وەڵڵا لای نابەم، دوایی فیڵ بکەن و ئەو سەگبابە بێتە لاشەمەوە چی بکەم هێشتا کاریگەری سیحرەکەی لەسەرم ماوە.

حەنانە: لایە من وەعدت ئەدەمێ هیچ ڕوونادات و سوودی دەبێت، سەسیل داوای کردووە قسەمان لەگەڵ بکات.

ماکوان: ئەی حەزقیل لەکوێیە؟ با ئەویش بێت.

حەنانە: ئاخر دەبێت بڕۆم بەشوێنیدا بانگی بکەم.

ماکوان: دەی بڕۆ ئیشت چییە؟

حەنانە دیار نەما، منیش هەڵسام چایەك و نانێك دروست بکەم ئەوەندەم بسکیت و زەیتون و نانی رەقم خواردبوو زۆر ئیشتهای گۆشت و برنج و مریشکم دەکرد، تەبیعەتم وایە وەک تیمساح وایە هیوایەتم گۆشتە. چووم گۆشت دەربهێنم و نانێك دروست بکەم ئاوڕم داوە حەزقیل و حەنانە هەردووکیان لەدوامەوەن، بەڵام کە بینیمن زۆر ترسام چووم بە ئاسماندا.

تورە بووم لێیان وتم: کۆکەیەك، هاوارێك -یا الله- شتێك بکەن وبڵێن، جاخۆ خەریك بوو گیانم دەرچێت.

وتیان ماکوان مریشك دەربهێنەو ئێمەش لەگەڵت دەخۆین. وتم باشە بەسەر چاو یەك مریشکم دەرهێنا وازم لێهێنا بۆ ئەوەی بیکاتەوە دوای دەست بکەم بە پاکردنی. هاتم دانیشتم لایاندا ڕووم کردە حەزقیل وتم بەخوا عەبدوڕەحمانی برام گومانم پەیدا کردووە لێتان، حەنانە دەڵێت: سەسیل دێت بۆ ئێرەو قسەمان لەگەڵ دەکات، حەزەی برام فیڵ و شتم لێ مەکە دوایی تورە دەبم ئەژدادتان ئەسوتێنم!

دەستی کرد بە پێکەنین حەزقیل تی داوای کردووە لە حەنانە قسەمان لەگەڵدا بکات، نازانین چی دەوێت خۆ نامان خوا با قسەمان لەگەڵ بکات.

ماکوان: ئاخر دڵنیان شتی قۆڕ ناکات؟

حەزقیل: دڵنیابە..

ماکوان: تورە بووم ؛ ئەرێ کاکە ئێوە ئیش و کارتان نییە هەر بەدوای منەوەن.. کاکە بڕۆن بۆلای مەلا عەلی کەڵەك ئەو ئیشی پێتانە، بۆ بە کافرو موسوڵمانتانەوە لەمنتان پێچاوە؟

حەزقیل: بە پێکەنینەوە دەی باشە وا ئێمەش ڕۆشتین ئەوان وازت لێناهێنن.

ماکوان: ڕاست دەکەیت، بەس کاکە ئێوە زۆر سەیرن.

حەزقیل: یەك شت هەیە بیزانە ماکوان ئێمە وەك ئێوە یەکتر ناکوژین، داوات لێدەکەم ئەوەی کە داومە بەتۆ لایبە با لەگیرفانتا نەبێت.

ماکوان: بەمەرجێك کە ١٠٠ دانەی ترم بۆ بهێنیت لەهەموو ڕەنگەکانی باشە، چۆن یەك ناکوژن ئەی بیرتە وتیان تۆیان کوشتوە؟

حەزقیل: ئەی بیرتە درۆ دەرچوو ئەوە منم لەگەڵتا و بۆ دیارییەکەشت ئاخر زۆرە بەخوا ماکوان دەستم ناکەوێت.

ماکوان: حەزەی برام تۆ و حەنانە خۆتان پەیدای بکەن لەوانەیە گەلابەیەك بهێنە دەرەوە بۆم بێنەو لای دەبەم.

حەزقیل: وەعد نادەم بەڵام هەرچیم دەست کەوت بۆت دێنم پەیمان بێت.

ماکوان: باشە ئەوە لای دەبەم.. لامبرد و خستمە ناو قابێك لە ناو چێشتخانەکەماندا، کە ئاوڕم داوە بینیم حەنانە خەریکی پاك کردن و چاکردنی مریشکەکەیە. مریشکی بۆ چاکردم و هەتا توانی هەرچی بیبەری توونمان هەبوو پێوەی کرد، هاوارم کرد بۆ خاتری خوا - حەنانە ئەوە چی دەکەیت ئەتەوێت بمان کوژیت ئەو مریشکە جوانە بۆ والێدەکەیت.

حەنانە: تۆ ئیلاقەت نەبێت، ئەی هەنگوینتان هەیە.

ماکوان: ئا هەمانە - ئەوە لەوێدا هەیە هەنگوین، چی هەنگوین هەبوو سوویی لە مریشکەکە و بە تەماتەو پیازو سیر و هەرچی تەرتیباتە بەدەست کردیە ناوەوە - خنی بەناو مریشکەکەدا هەندێک ئاردی دەرێناو پژاندی بەسەر مریشکەکەدا و خوێی بەسەردا کردو خستیە ناو فرنەکە داوای لەمن کرد بۆی داگرسێنم و بۆم دایگیرساند.

منیش وتم با برنجێکی بۆ لێبنێم تا ئەو لەفرندا ئەبرژێت، برنجەکەش پێدەگات و چووم قابلەمە بهێنم، تەماشای ژووری دانیشتنەکەم کرد سەسیل دانیشتووە لەگەڵ حەنانە!

لەدڵی خۆمدا وتم خۆم رۆ ماڵەکمان بووە بە گەراجی جنۆکە..

منیش ویستم مەجلیسەکە تێك بدەم لەگەڵیشیا ئەترسم، وتم ئەوە سەسیلی باوەحیز، بۆ وا لەمن دەکەیت؟

حەنانە: ماکوان تۆ پەیمانت دا کە قسە بکەین، نەك قسەی ناخۆش.

ماکوان: باشـە بزانم چی دەوێت؟ ئەرێ باشـە کەسـتان دەسـت ناکەویت لەم سـەرزەوییە من نەبێت، سـەسـیل ئاخر ئەوە ڕاسـتە کە دەیکەن بەرانبەر بە من؟

سـەسـیل: ماکوان خێزانت تەلەفونت بۆ دەکات، هەواڵێکی خۆشـی پێیە بزانە دەڵێت چی!

هەر وای وتو خێزانم تەلەفۆنی کرد.

بـاران: مـاکوان ئەو ڕۆژەی کە گیرابوویـت پەیوەنـدیم کرد بە سـەفـارەتی نەرویجەوە لە سویدو پاشان بە موخابەراتی سوید، وتیان ئێمە هیچ نازانین.

ماکوان: ئەزانم بۆت باس کردم.

باران: ئێستا موخابەراتی نەرویجی تەلەفونیان بۆ ژمارەکەی نەرویجم کردووە، هەڵمگرت لێپرساوی ئەو بەشـەی تۆ بوو، وتی ئیتاليا وتویەتی ئێمە ماکوانمان ناوێ کە سـوید بە ئێمەیان وتوە ئیمەش وتمانە نامانەوێت، خۆ ئەگەر بشـی نێرن بۆ ئیتاليا ئەوا ئێمە مەجبور دەبین بینێرینەوە بۆ نەرویج.

مـاکوان: ئەی چۆن لە کۆمپیتەری هەموو فرۆکە خانەکانـدا وانوسراوە کە من داوکراوم لە ئیتاليا و ئەنتەرپول بە شوێنمەوەیە؟

باران: ماکوان ئێستا لێپرساوی ئەو دۆسیەی تۆکە لێپرسینەوەی لە گەڵ تۆ دا کردووە ناوی (پێر پێدەرشـن) بەمنی وت کەوا ناوەکەی ماکوان لابراوە ئیتاليا وتییەتی گرتنی مـاکوان ئێکسـپـایەرەو مـاکوانمـان نـاوێـت، بیشـینێرن ئێمە دەگەڕێنینەوە بۆ نەرویج ناوت لابراوە.

کە خێزانم وای وت ؛ زۆر دڵ خۆش بووم، سوجدەم برد بۆ خوای پەروەردگارو لەخۆشـیدا هەر دەمگوت سـبحان الله، والجمد لله، ولا إله إلا الله، والله اكبر وەڵا سەسیل نەما... حەنانە وتی با سەسیل بانگ بکەینەوە زیکرەکانت دوایی بخوێنە.

سەسیل هاتەوە لە کارەبای کوردستان دەچوو خێرا دەهاتوو دەڕۆشت!

حەزقیل: سـەسـیل ماکوان نەیزانیوە کە ئەوکارەی کردووە، تۆ وازی لێبهێنەو بیبەخشە بەئێمە.

سەسیل: دەبێت هەر تۆڵەی لێبکەمەوە، یان ئەوەتا براکانم بۆ دەگەڕێنیتەوە.

حەزقیل: توڕە بوو، بەتوڕەییەوە وتی ئەو نەیزانیوە.

ماکوان: ئەڕێ ئەو دوکان و بازاڕە چییە لەسەر منتان ناوە منیش هیچ نازانم

حەنانە: تۆ کە لە کوردسـتان بووی بەتەقەی خۆشـی دوو برای سـەسـیلت کوشتوە.

ماکوان: من ١٩ بۆ ٢٠ ساڵە لەکوردستاندا نەماوم.

سـەسـیل: سـاڵی ١٩٩٦ لەسـەیران بەن سـیلاحت دەکڕی و دەفرۆشـت کڵاشـینکۆفێکت تاقیکردەوە ڕیزێ فیشـەکەت کرد بەناو دۆڵەکەدا لە لای دوکانەکانی سەر مەرزەکە، وابوو؟

ماکوان: وابوو! بەس من براکانی تۆم نەدیوە لەوێدا بوون؟

سەسیل: خۆی تورەکردو دەستی کرد بە گریان، وتی خۆت و براکانت دەکوژم.

کەوای وت زۆرم پێناخۆش بوو پەلامارمدا لێیدەم کەچی لەبەر دەستمدا نەما نە حەزقیل نە حەنانە هیچیان نەمان، بە پەلە چووم دەستنوێژم گرتو دیارییەکەی حەزقیلم هەڵگرتەوە و دەستم کرد بە نوێژکردن و قورئان خوێندن..

بۆنی مریشك دێت لەدڵی خۆمدا وتم نەسووتا بێت، کەچوومە سەری بینیم نازوعیشوەم بەسەردا دەکات.

مریشکم خوارد تا ئێستا لە ژیانمدا خواردنی وا خۆشم نەخواردوە.

## میوانی نوێ

دوای ئەوەی دەستمكرد بە خواردنی مریشكەكە كە بەهەنگوین و بیبەری توون خۆشكرابوو، بەڵام لە راستیدا زۆرخۆش بوو.

دوای نوێژی مەغریب بڕیارمدا دەست بكەم بەقورئان خوێندن، بەتەنها لەماڵەوە بووم كاتی باشم لەبەردەستدا بوو.

لەدوای نوێژ دەستم كرد بە قورئان خوێندن، ئەوەندەم زانی حەزقیل لەلای ڕاستمەوە دانیشتوە گوێیگرتووە لە من كە قورئانم خوێند.

ئاوڕم داوە وتم حەزە گیان بۆ شوكری خوا ناكەیت، جاران بە قورئان ڕاوم دەنایت ئێستاش بەدیارمەوە دانیشتوویت و گوێت گرتووە، سوپاسی خوا بكە.

حەزقیل: لە نوێژ بووم لە مزگەوت ئێستا هاتمەوە بۆلات، ئەوە بۆ وا توڕە بوویت؟

ماكوان: شێت دەبم كەسێك لەڕوودا هەڕەشەم لێبكات، ئەو سەخیفە دەڵێت خۆت و براكانت دەكوژم ئەی چۆن توڕە نابم، باشە ئەی ئێوە بۆ ڕاتانكرد؟ زیرەكەن، خۆ من نە لە تۆ توڕەبووم نە لە حەنانە، گریمان ئەو مێینەیە ئەی تۆ خۆ بەحساب وامزانی شێر خۆری.

حەزقیل: ماڵت ئاوابێت کە تورە دەبن دەترسین ئێوە دەست ئەوەشێنن ئێمە بە بەردێکی بچوك بەرمان بکەویت ئەمانکوژن، ئینجا تورە بوونی ئێوەی مرۆڤ هەیبەتی هەیە.

ماکوان: وەڵڵا حەزەی برام ئێوەش خەتەرن، لەپڕ خۆتان دەردەخەن و نامێنن ئەمەش ترسناکە، ئەوە من عادەتم کردووەو ڕاهاتووم لەگەڵتاندا، دەنا خۆتان دەربخەن بۆ کەسێکی تر ئەبێت یان بیبەین بۆ نەخۆشخانە یان ژێری گەرم دەبێت!

ئەرێ بەڕاست ئێوەش دەچن بۆ مزگەوت، وتت لە مزگەوت بووم؟

حەزقیل: ئەی ئێمەش هەر وەك ئێوەین موسـوڵمانین و نوێژ لەماڵی خوادا بکەین خێرمان دەست دەکەوێت ئەی هەردوولامان خاوەنی یەك شەریعەت و یەك دینین، وەك ئێوە دەخۆین، دەخەوین، ژن دەهێنین منداڵمان دەبێت و شایی و شیوەنمان هەیە، نەتهێشت ئەو مریشکە لەگەڵتا بخۆین ڕاوتناین.

ماکوان: حەزە گیان ماڵ و مریشـك لە خزمەتدایە، مادام موسلمانی برای منی ئەوە مریشکەکەیە لەسەر مێزەکە بڕۆ تێرو پڕ بخۆ.

حەزقیل: ماڵت ئاوابێت حەنانەش حەزی لێدەکرد ، چاوەڕێ دەکەم تا ئەویش دێت.

ماکوان: بەڕاسـت حەزقیل، حەنانە زۆر جوانە! بەنەنکم بێت خۆ هەرچەندە لە سەروو ٣٠٠ ساڵەوەیە.

حەزقیل: خۆ ئەوە خۆی نییە ئەزانیت؟

ماکوان: ئەزانم عەلی یەمەنی خوای گەورە لێیخۆش بێت بۆی باســکردم کە ئێوە نابینرێن، ئەوەی بڵێت جنۆکەم دیوە درۆزن و فاسقە!

حەزقیل: ڕاســتە، خوای پەروەردگار لە عەلی یەمەنی برامان خۆش بێت، حەنانە ئەو شــێوەو شــکڵەی کچێکی ئیتالییە هەڵیگرتووە خۆی نیشــانی تۆ ئەدات.

سەیری حەزقیلم کرد تەماشای سەقفی ژوورەکە دەکات وتم ئەوەچیە؟ وتی: وا حەنانە هات!

ماکوان: بۆ بەئاسمانەوەیە..؟

حەزقیل: بەڵێ واهات

ماکوان: بۆ ماڵی من مەطارە، ناتوانێت بە شتێکی تر خۆی نیشان بدات؟

حەزقیل: ماڵی تۆ ماڵی هەموومانە میوانێکیشــی لەگەڵدایە ناوی ڕاقی یە، بۆیە وا خۆی نیشان ئەدات بۆ ئەوەی نەترسیت.

ماکوان: ڕاقیش زیادی کرد حەزەی برام؟

حەزقیل: جنۆکەیەکی زۆر زیرەك و ئاقڵە زۆر خواناس و دینداریشە.

ماکوان یاخوا بەخێر بێن ســەرچاو.. هەر وام وت و حەنانە وەڵامی دامەوە وتی مریشکەکە خۆش بوو؟

ماکوان: دەستەکانت خۆش شاز بوو، بڕۆم مریشکێکی تر دەربهێنم بیخۆن؟

حەنانە: نا خۆ ئێمە گۆشەتەكەی ناخۆین.

ماكوان: ئەی؟

حەنانە: تەنها ئێسـقانەكەی دەخۆین، باش بوو بیرت نەچوو بیسـم الله ت لێكردووە؟

ماكوان: بەڵێ بسم الله دەكەم، ئەی كوا حەزقیل؟

حنانە: میوانێكی تری لەگەڵدایە، ناوی ڕاقی یە

حەزقیل: ئەوەتا نایبینی؟

ماكوان: كە ئاوڕمداوە تەماشـا دەكەم لەسـەر قەنەفەكان دانیشـتوە، كوڕێك دانیشـتتوە دەم و چاوی رێك لە عەلی یەمەنی دەچێت، منیش وتم كاك ڕاقی بەخێر بێیت.

ڕاقی: بارك الله فیكم كاك ماكوان.

حەنانە: ئەوە هاوسەری منە.

ماكوان: خوای گەورە لەیەكتان نەكات ئەی حەنانە، ئەوە كچێكی جوانتان نییە منیش بیخوازم؟

حەنـانە: جـا مـاكوان چۆن ژن و ژنخوازی لە نێوانی ئێمەی جنی و ئێوەی مرۆڤدا دەكرێت، شتی وا نابێت هەرگیز.

ماكوان: ئەی ئەوە نییە، خەڵك هەیە دەڵێت ژنم لە جنۆكە هێناوە و جنۆكە عاشقم بووە؟

ڕاقی وەڵامی دامەوە و وتی: ئەگەر شـتێكی وا ببوایە و مومكین بوایە، خوای گەورە لە قورئاندا باسـی دەكرد یان لە شـەریعەتدا بابێكی بۆ دەكرایەوە لە فیقهی ئیسـلامدا، یاخود پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسـی دەكرد. شـتی وا چۆن دەبێت كەناتوانن ئێمە ببینن وەك خۆمان، یاخود پیاو ئەگەر ژنەكەی جنی بێت چوزانێت چووە بۆ كوێ، ئینجا منداڵ لە كامیان دەردەچن؟ ئایا مرۆڤە یان جنۆكەیە، لەبەر ئەوە درۆیە و هیچی وا ڕووینەداوە ئەوەشی وابڵێت درۆ دەكات.

ماكوان: بەڵێ دەزانم پێشـتریش لەگەڵ كوڕێكی ڕەفیقمان عەبدوڕەحمان حەزقیل دەیناسێت، باسمان كردووە كە درۆیەو هیچ بنەمایەكی ڕاستی نییە، بەڵام لەماوەی ڕابوردوودا كچێكم بینی لە یوتیوب خەڵكی كوردسـتان بوو، دەیووت گوایە ئێوە لەگەڵیدا خەوتوون مەبەستم جنۆكەیە. حاشا لە جەنابت و كاك حەزقیل.

ڕاقی: وەڵاهی كاك ماكوان درۆیە و شـتی وا هەرگیز ڕوونادات، بزانە كێ لە گەڵی خەوتووە دەینێت بەسـەر ئێمەدا. تەنانەت لە ناو ئێمەی موسـوڵمان وەك ئێوە وایە، هەركەس زینا بكات ڕەجم دەكرێت. لە ناو شـەیتانەكاندا ئاساییە خوانەناسـن هیچ گوێ بە عەیبەو حووڕمەت نادەن، ئەو كارە لەگەڵ یەكتر دەكەن. هەندێك لە موسـوڵمانە جنۆكەكان كە زینا دەكەن دووردەخرێنەوە لەو كۆمەڵ و تایەفەیەی خۆی دەربەدەر دەكرێت. تەنانەت

لەناو هەموو گروپ و مەزهەب و جەماعەتەکانی تریشـــدا بە چاوی کەم تەماشای دەکەین.

ماکوان: بۆ ئێوە ئەوەندە زۆرن ڕاقی بەڕێز؟

ڕاقی: لە ژماردن نایەین، لەوانەیە بەملیۆنان مەزهەب و قوتابخانە و ڕێگا و حیزبی جیاوازمان هەبێت، بەڵام سوپاس بۆ خوا کە ئیسلام هات ئیتر هەمووی باطڵ بوون. خوای گەورەش باسی کردووە بۆ ئێوە لە قورئاندا دەفەرموێت: ﴿وَأَنَّا مِنَّا ٱلصَّٰلِحُونَ وَمِنَّا دُونَ ذَٰلِكَۖ كُنَّا طَرَآئِقَ قِدَدًا﴿١١﴾﴾ [الجن] واتا: بێگومان ئێمە کەسانی چاک و (دیندارمان) تیا هەیە، هەروەها کەسانی تریش کە بەو شێوەیە نین، (ئێمە جاران) ڕێگەو ڕێبازو بەرنامەی هەمەجۆرمان گرتبوصە بەر (بەڵام ئێستا بەرنامەی ئیسلام ڕوون و دیارە).

ماکوان: ئەی ئێستا لەناو ئێوەدا موسوڵمان زۆرە یان ڕێگاکانی تر؟

ڕاقی: ســـوپاس بۆ خوا موســـوڵمان زۆرە، بەڵام بەداخەوە جنۆکەی شـــەیتان لەهەمووان زۆرترن و لەگەڵ ئەوەشـــدا یەهودی و نەسرانی و زەردەشـــتی و بێدین و ئایغنەکانی تریشمان زۆر هەیە.

ماکوان: ڕاقی من لە شتێك تێناگەم، ئەویش ئەم دیاریغەی حەزقیلی برامە کە بۆی هێناوم، کەدەریدێنم حەزقیل نامغنێت و سەسیلیش ڕادەکات. حەنانەش ون دەبێت، بۆیە دەریناکەم لە گیرفانمدایە بۆ ئەوەی ئیزعاجتان نەکەم، ئەمە چییە؟

ڕاقی: دەری بهێنییە بۆ من ئاساییە، ئەوە حەزقیل و حەنانە- کە پێی ئیزعاجن هیچ کاریگەری نییە بۆ من. ئەمە من بۆم ناردویت نەك حەزقیل ۲۰۰ دانەی تریشی داواکردووە بۆ تۆ، بۆم هێناویت.

ماکوان: بۆ جیاوازیتان چییە؟

ڕاقی: حەنـانە و حەزقیـل لە عەشـــیرەتی گەورەی عیفریتن، بەڵام من لە بنەماڵەی ئەصلی موسوڵمانم و لە مەرجانەکانم. ئەوان پێشتر لەگەڵ شەیتاندا کاریان کردووە کاریگەی سیحرو جادوویان لەسەرە، بەڵام ئێمە کە موسوڵمان بووین و کاریگەری سیحرمان لەسەر نەبوو، هەر بەحەڕاممان زانیوە بۆ ئێمە ئاساییە.

مـاکوان: من لەم قســـەی تۆ هیچ تێنـاگەم، ئەڵێی مەتەڵە تۆ و ئەوان هەر جنۆکە نین؟ ئیتر چۆن کاریگەری بۆ ئەوان هەیە و بۆ تۆ نییە.

ڕاقی: کێشـــەی ئێوەی مرۆڤ لەوەدایە هەموو شـــتێك وەك خۆتان تەماشـــا دەکەن، ســـیســـتەم و ژیان و گوزەرانی ئێمە وەك ئێوە نییە، بەڵام هەر بۆت ڕوون دەکەمەوە. چەندین کەس هەیە نەخۆشە، بۆ چارەسەری نەخۆشییەکە دەرمانێك بەلاشـــەی ناکەوێت، یاخود چەندین کەس لە ناو ئێوەی مرۆڤدا حەساسێتی بە سیرو پیاز ئەو شتانە هەیە کۆمەڵێکی تریش حەزی لێدەکات.

ماکوان: تێگەیشتم ئەی کوا ئەو ۲۰۰ دانەی کە بۆت هێناوم؟

ڕاقی: ئەوەتا حەنانە بۆی داناوی لە لای ئێسقانی مریشکەکەیە بڕۆ هەڵیگرە.

ماکوان: کەچووم سەیرم هەمووی لێیبوو زۆر دڵخۆش بووم. زانیم ساحیر نییە بتوانیت سیحرم لێبکات، بە پشتیوانی خوای پەروەردگار، بەڵام ڕاقی تۆ باسی ئەوەت کرد کە ئەوان حەزیان بەوە نییە؟

ڕاقی: تەماشـــای ئەو پارچە پەڕۆیەبکە کە تێوەی پێچراوە، ئەو جۆرە پەڕۆیە کە تێوەی بپێچرێت کاریگەری نابێت. جا لەبەر ئەوە خستویانەتە ناو ئەوە تا پەرشو بڵاوی نەکەیتەوە.

ماکوان: ئەی حەنانە و حەزقیل کوان؟ خۆ من هیچم دەرنەهێناوە تا ئێستا.

ڕاقی: نا-.چوون بۆ لای سەسیل کە واز لە تۆ بهێنێت بۆ کۆتا جار قسە پێکەوە بکەن، بەڵام کێشەکە لە دایکی سەسیل-دایە واز لە تۆ ناهێنێت.

ماکوان: جا چیم لە دایکی کردووە؟

ڕاقی: دوو کوڕیت کوشتوە.

ماکوان: خۆ من نەمزانیوە لە ڕووی شەریعیشەوە من تاوانبار نیم.

ڕاقی: بەڵێ تـاوانبـاری، چۆن پێغەمبەری خوا ئـاگاداری کردونەتەوە کە بەرد هەڵنەدەن، تۆ هەر تەقەت دەکرد بۆ بەئاسماندا! نەتکرد؟

ماکوان: ڕاستە، ئەوکاتە بەخزمەتی ئەو فەرموودەیە نەگەیشتبووم.

ڕاقی: کێشـە نییە کە هات شـتێکت فێر دەکەم پێی بڵێ خۆیی و دایکی وازت لێدەهێنن، باشە؟

ماکوان: مەمنونیشت دەبم، ڕاقی گیان.

## ماکوان، ساحیرێکی نەرویجی و سەسیل

لەگەڵ ڕاقی باسی ئەوەمان کرد کە من بە هیچ شێوەیەك تاوانبار نیم، چونکە نەمزانیوە، بەڵام ڕاقی پێی وابوو و وتی کە تاوانبارم، بەڵام قەناعەتم بە قسەکەی کرد، وتم کەوا بێت کەفارەتم دەکەوێتە سەر، بۆیە ناچار تەلەفونم کرد، بۆ زانایەك لە میسر بەناوی محەمەد عەبدوملەلیك ئەلزەغبي، پیشتر پەیوەندییەکمان هەبوو لە ڕێگای برایەکی میسرییەوە لەو شارەی کە لێی دەژیام. پەیوەندیم لەگەڵیدا گرت عەرزمکرد ئایا کەسێك جنۆکە بکوژێت کەفارەتی دەکەوێتە سەر- لەڕاستیدا هەموو باسەکەم بۆ گێڕاوە؟

ئەوە فەرمووی ڕاستەوخۆ درۆ دەکەن، ئەگەر شتی وا بکەیت یەکسەر ئەتکوژنەوە، بەڵام لەوانەیە کارێکی تریان لە ژێر سەردا بێت.

ماکوان: جا شێخ خۆ من غەیب نازانم، چۆن بزانم چیان لەژێر سەردایە.

شێخ محەمەد ئەلزەغبی: ماکوان داوای ئەوەیان لێکردویت ببیت بە ساحیر یان سیحریان لێکردوویت، کاریگەری نەماوە، شتێك هەیە مەزبوت نییەو من نایزانم هەموو شتەکانم پێبڵێ.

ماکوان: ئەوەی ئەیزانم بۆم باسکردوویت، جا نازانم چیان لە ژێر سەردایە.

شێخ: بەهەر حاڵ ماکوان ئەگەر توانیت وەرە بۆلام بۆ پورسەعید زیاتر لە نزیکەوە قسە بکەین، ئاگادار بە هیچ بڕوا بەو جنۆکانەی تریش نەکەیت

لەوانەیە ســەرت لێتێك بدەن لەگەڵیاندا کار بکەن و ســاحیرێکی مرۆڤ ناردبنی، پاشـان بۆ زانیاریت هیچ کەفارەتو شـتێکت ناکەویتە سـەر، چونکە ئێمە نایانبینین و تەنانەت بە دەســتی تۆش کوژرابێتن، تاوانبارنیت حوکمی قەتڵی نییە. وەك ووتم ئاگاداری خۆت بەو بڕوا بە جنۆکە نەکەیت.

ماکوان: زۆر سوپاست دەکەم و خوای گەورە پاداشتی خێرت بداتەوە، ئەگەر توانیم دێمە خزمەتتان.

پاشان کە وای شێخ وت ؛ گومانم لە ڕاقی و حەنانە و سەسیل-یش پەیدا کرد.

چوومەوە بۆ ماڵەوە بۆ ئەوەی بیانبینم و بێن بۆ لام، کەچی تا ١٥ ڕۆژ کەسـم نەبینی. ئەو ماوەیە خەریک بوو دڵم شەقی دەبرد، جاری وابوو هاوارم دەکرد حەزە، سـابونی ڕەقی، حەنانەی تەڕەماش لە کوێن؟ سـەسـیلی قۆنەرە، هیچ چارە نەبوو کەس دیار نەبوو. ماڵ و منداڵیش لەماڵ نەبوون ئەوەندەی تر خەفەتم دەخوارد سـەفەرەکەشـم لێتێکچوو بوو، ئیتر وەرە ماکوان ئەو دڵەت شەق نەبات.

دوای پانزە ڕۆژ ڕاقی پەیدا بوو.

ماکوان: ئەرێ ڕاقی خوا بتانکات بە صابونی ڕەقی ئەوە بۆ دیار نین؟

ڕاقی: لە عومرە بووین لەگەڵ حەنانە و حەزقیل و هەندێك لە ڕەفیقەکانمان.

ماکوان: جا عومرە پانزە رۆژی بۆ چیە بە یەك کاتژمێر تەواو دەبێت، ئەوەندە قورس نییە، ڕاست پێم بڵێن لە کوێ بوون؟

ڕاقی: بەڕاستمە درۆ ناكەم، وە ئەوەشمان بۆ ئاشكرا كردی كە سەسیل درۆ دەكات، نەبرات كوشتوە نە هیچ هەمووی فشەیە درۆ و دەلەسەیە.

ماكوان: بەڕاست وەڵا ئەمە باش نەبوو، حەزم دەكرد هەموو عەشیرەتەكەشیم بكوشتایە، بەداخەوە.

ڕاقی: ئەی خۆ تۆ دوێنێ زۆرت پێناخۆش بوو؟

ماكوان: ڕاستە وایە، ئاخر وامزانی لەشەریعەتدا كەفارەتم دەكەوێتە سەرو حوكمی هەیە ، بەس كوشتنی ئێوە وەك ئاوخواردنەوە وایە ئێستا ئەگەر هەر جنۆكەیەك بكوژم وەك ئەوە وایە مریشكێكم سەربڕیبێت، ئایا مریشك سەربڕین تاوانە؟

ڕاقی: جا بۆ بەو شێوەیە قسە دەكەیت ماكوان، ئێمە هیچ خراپەیەكمان بۆت بووە؟

ماكوان: لەڕاستیدا نازانم، ئایا ڕاستگۆن یان درۆزنن و جەماعەتی سەسیل-ن و خۆتان لەمن كردووە بە جەماعەتی شەریفی مەككە. نازانم لێتان تێناگەم.

ڕاقی: كیشەی تۆ لەوەدایە زۆر بڕوات بەخۆتە و لە خۆت ڕازیت و حساب بۆ كەس ناكەیت؟

ماكوان: ئەم قسەیە ڕاستە، سوپاس بۆ خوا زۆر لە خۆم ڕازیم چونكە خاوەن ئیسلامم، بڕوام بە خۆم هەیە، لەبەر ئەوەی خاوەنی كەسایەتییەكی بەهێزم و لە سەر قورئان بونیادم ناوە ئەوەش كە حساب بۆ كەس ناكەم وانییە بۆ

خەڵکی دیندار و خواناسـی دەکەم، بەڵام بەدڵنیاییەوە بۆ خەڵکی سـاختەچی و بێدین و خوانەناسی ناکەم و ئەرزشیان نییە لای من.

ڕاقی: بەهەر حاڵ خۆت ئازادی، بەڵام بزانە ئیمەش دۆستی تۆین.

ماکوان: چۆن بزانم دۆستی منن گومان لە هەموو شتێك دەکەم، بەتایبەتی لە ئێوە کە جنۆکەن، شـتیکم لێبکەن کێ بڕوام پێدەکات کە ئێوە کردوتانە. باشـە ئەی پانزە ڕۆژە بۆ دیار نین (خۆشم بیتاقەتان بووم خووم پێوە گرتبوون).

ڕاقی: ماکوان بزانە کە ئێمە تۆمان خۆش دەوێت، بیشـزانە خۆمان بۆ هەموو کەس ئـاشــکرا نـاکەین، حەز دەکەم ئەوەشـــت پێبڵێم زۆرێـك لە ئێمە و هاوڕێکانمان کە موســوڵمان بووین بە هۆکاری باس و خواســتەکانت بووە، لەبەر ئەوە خۆشەویستی لای ئێمە.

ماکوان: ئەو قسەیە قسەی خەڵکییە بەعام دەیکەنەوە، خۆ سەسیل-ی بێدین و هیچو پوچیش ئەویش خۆی دەردەخـات، ئەی کەواتە ئەویش منی خۆش دەوێت؟

ڕاقی: نا - ئەو تۆی خۆش ناوێت، بەڵکو دەیویســت لە ڕیگای ســیحرەوە بۆ ســەرلێشــواندی خەڵکی بەکارت بهێنێت ، خوای گەورە لەڕێگای جنۆکەکانی یەمەنەوە هیدایەتی عەبدوڕەحمان حەزقیلی دا کە هاتە تەرەفی موسوڵمانان دەنا ئێستا دەیانخنکاندی.

ماکوان: حەددیان چییە دەمخنکێنن.

ڕاقی: خنکاندنتان بەدەستی شەیتانەکان زۆر ئاسانە، خوای گەورە تاکە چەکێکی پێبەخشیوون کە قورئانە هیچ شەیتانێك ناتوانیت بێت بەلاتاندا، تەنها بە دوورکەوتنەوە لە قورئان خنکاندنتان ئاسانە.

ماکوان: لەکوێدا باسکراوە کە ئێوە دەتوانن ئیمە بخنکێنن؟

ڕاقی: ئێمە نا شەیتان دەیکات، خوای گەورە باسی کردووە لە قورئاندا لە سوڕەتی المؤمنون دەفەرموێت:

﴿وَقُل رَّبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ هَمَزَٰتِ ٱلشَّيَٰطِينِ﴿٩٧﴾﴾ [المؤمنون]

واتا خوایە پەنا دەگرم لە خنکاندنی مرۆڤ بەدەستی شەیتانەکان، ئەو هەمزاتە واتا خنکان.

ماکوان: ئەوە بە واتای وەسوەسە دێت نەك خنکان.

ڕاقی: ئەوە تەفسیرە سادەکان خۆیان دەرباز کردووە بە وەسوەسە ناویان بردوە، بەڵام بۆ نمونە طەبەری کە تەفسیرێکی باشە ئەو دەڵێت: کە واتای خنکانە، ئەوە دەقەکەیەتی:

حدثني يونس، قال: أخبرني ابن وهب، قال: قال ابن زيد في قوله: (وَقُلْ رَبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ هَمَزَاتِ الشَّيَاطِينِ) قال: همزات الشياطين: خَنْقهم الناس، فذلك هَمَزاتهم.

تەنانەت لە ڕووی زمانەوانی عەرەبیشەوە واتای خنکاندنە، ئەوە لە راغبی ئەصفهانی دەڵێت: في غريب القرآن للراغب الأصفهاني:

(همز): -الهمز کالعصر- وهو مناسب لقول المؤلف: خنق الشیاطین؛ لأن الخنق هو عصر الرقبة وضغطها لینقطع النفس.

ماکوان: وایە، باشە ڕاقی تۆ وتت شتێکت فێر دەکەم کە نەوێرن سەسیل-و دایکی و هیچ شەیتانیك بێت بەلاتدا.

راقی: خۆ تۆ ئێستا ئێمەت بە خائین و خۆفرۆش دەناساند.

ماکوان: نازانم هێشتا لەقسەکانم پەشیمان نەبوومەتەوە ، کاکە ناحەقم مەگرە ژیان لەگەڵ ئێوەدا هەروا سادە نییە، جا تا ساغ نەبمەوە ناتوانم بڕوا بکەم.

ڕاقی: ماکوان گیان شتێك هەیە بیزانە، من وەك باقی جنۆکەکانی تر نیم کە هاوکار بووم لەگەڵ کەسێکدا، ئامادەم سەری خۆم لە پێناویدا دابنێم بە مەرجێك کارەکانی شەرعی بێت.

ماکوان: باشە بۆ لەگەڵ من دەیکەن، کەس لەسەر ئەم زەوییەدا نەماوە[1] ماکوان نەبێت؟

ڕاقی: لەوانەیە تۆ هەستی پێنەکەیت، بەڵام ئەزانی چەند کەس لەسەر دەستی تۆ کارەکانت لە جنۆکەکان بوون بە موسوڵمان، ئەزانی مەلعەبێك جنۆکە تەماشای تۆ و سەسیل و حەزقیل و من و حەنانە دەکات. ئەی ئایا دەزانیت شەیتانەکان چەندە زۆرن دەیانەوێت ئازارتان پێبگەیەنن ئەوە ئێمەین بەرگریتان لێدەکەین، ناوی قەرینت بیستووە لە شەرعدا؟ ئێمەی

جنۆکەی موســولّمان پشــتوپەنای ئێوەین هەر ئاگاتان لەخۆتان نییەو کەچی زۆر جار قسەمان پێدەڵێن یان لێمان دەترسن.

مـاکوان: بەڵێ ئەی چۆن پیشــتریش لەگەڵ عەلی یەمەنیـدا خوای گەورە لێیخۆش بێت باسی ئەو قەرین و شتانەمان کردووە.

ڕاقی: ئەزانی چەنـد قەرینـت موســولّمان بووە چەنـدجـار قەرینی تریـان بۆ داناویتەوە، نەك تەنها بۆ تۆ بۆ هەموو هاوڕێکانتو موسوڵمانان بە گشت.

ماکوان: ڕاقی وەڵڵا دڵخۆشت کردم.

ڕاقی: ماکوان یەك شـتت فێر دەکەم کە هیچ شـەیتانێك ناتوانێت بێت بەلاتا، ئەوە ئەو ماوەی پێشوە ویستم فێرت بکەم، بەڵام دەرفەت نەبوو.

مـاکوان: جا چییە خۆشـــم دەیزانم، ئەزانم فەرموودەکەی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) کە ئەبووهوڕەیرە دەیگێڕێتەوە. دەفەرموێت: ڕاســتی کرد ئەو درۆزنە، ئایەتەلکورسییە.

ڕاقی: ڕاســتە ئەوە شــەیتـان فێری ئەبوهوڕەیرەی کردو پێغەمبەری خواش ئیقراری پێکرد (ﷺ)، بەڵام ئەوە نییە!

ماکوان: ئەی کامەیە؟

ڕاقی: ئەوە کاتییە شەیتان دەڕوات بەڵام دێتەوە.

ماکوان: ئەی ئەمەی جەنابت چییە؟

ڕاقی: هەرچەندە هەردووكیان هەر بەهێزن، بەڵام ئەمە هیچ شەیتانێك ناتوانێت جادووت لێبكات و هیچ جادوبازیكیش كاریگەری نابێت لەسەرت.

ماكوان: ئادەی ڕاقی برام (خوا قەزا گیان) بیلێ، بەس ڕاقی من دوای شتی خورافات ناكەوم. ئەوەی لە قورئان و سوننەتدا بوونی نەبێت نە باسی دەكەم نە بڕواشی پێدەكەم.

ڕاقی: ئەوەی بۆت باس دەكەم لە محەمەدی كوڕی واسعەوە گێڕدراوەتەوە خۆت باش دەزانیت چ پیاوێكە، وایە؟

ماكوان: وایە، ئەوپیاوە صادقەو تابیعێكی بەڕیزەو گەورەی قەومەكەی خۆی بووە. قوتابی ئەنەسی كوڕی مالكیش بووە، هەندێك دەڵێن پێغەمبەری دیوە، بەڵام دوایی موسڵمان بووە.

ڕاقی: وایە، ئەو دەگێڕێتەوە دەفەرموێت: شەیتان هات بۆ لام وتی هەرچی دەكەیت بیكە، ئەم دوعایە فێری خەڵك مەكە، ئەویش فێری هەموومانی كردووە، ئێوەش و ئێمەش هەركەسێكمان بیخوێنیت پارێزراو دەبێت لەشەڕی شەیتان و ساحیرەكان.

دەقی دوعاكە..

اللهم انك خلقت لنا عدوا لنا بصيرا بعيوبنا يرانا هو وقبيله من حيث لا نرونهم، اللهم يائسه منا كما يئسته من رحمتك وقنطه منا كما قنطه من عفوك وباعد بيننا وبينه كما باعت بينه وبين جنتك انك على كل شئ قدير، اللهم اكفنيهم بما شئت فسيكفيكهم الله وهو السميع العليم.

لە هەندێك گێڕانەوەی تردا زیادو کەمی بۆ کراوە، بەڵام ئەوەی کە بەڕاست و دروست هاتووە بۆم باسکردی و بەم شێوەییە.

ماکوان: خوای گەورە پاداشتت بداتەوە، زۆر مەمنون بووم خاڵە ڕاقی گیان.

ڕاقی: من بۆ شتێك هاتم بۆ لات تۆش ئەوەندەت پێکردین، لەبیرم چووەوە.

ماکوان: یا ألله خێر، ئەمرکە.

ڕاقی: وتم سەسیل درۆ دەکات، فێڵەکەی ئەوەیە دەیویست بەوە لێت خۆش بێت هەندێ وشـەت پێبڵێ لەگەڵ هەندێك ڕەسـمی سـیحردا، لەو ڕێگایەوە سـیحرت لێبکاتەوە، ئەو کەسـەی کە سـیحرەکەی بۆ دەکات کەسـێکی نەرویجییە، زۆر ترسناکە!

ماکوان: هەر ئەم سەگبابەی ترمان مابوو ئەمە کێیە؟

ڕاقی: ئەمە کورد نییە، بەڵکو نەرویجییە و سـاحیرێکی زۆر پیسـە و زانیاری زۆری هەیە. لە ئەمریکا خوێندوویەتی و زانسـتێکی زۆری لە سـیحر پەیدا کردووە.

ماکوان: جا چۆن لەشەڕی ئەمە ڕزگارمان بێت.

ڕاقی: یەك شـتت فێر دەکەم ئەگەر بەقسـەم بکەیت، لەدەسـتی ئەم ساحیرە پیسە زوو ڕزگارت دەبێت.

ماکوان: کێشـەکە لەوەدایە متمانەم بەهیچ نەماوە تەنانەت تووشـی دڵەراوکێ بووم لەتۆش. ئەترسم تۆش فیلم لێ بکەیت.

ڕاقی: من فێڵت لێناکەم، سـویند بە لا اله الا الله من ئەهلی تەوحیدم و خۆم بە موسوڵمان دەزانم تۆش بە برای خۆم دەزانم.

مـاکوان: تۆش برای منی، من و تۆ خوای گەورە کەرەمی لەگەڵ کردووین سـەروبرای جنۆکەو مرۆڤمان هەیە. تەواو بڕوام پێتە. لە بیروباوەڕەکەشـم دڵنیام و شك و گومانم نییە.. کە سەرکەوتن بۆ ئیسلامە.

ڕاقی: کەواتە ئەوەی پێت دەڵێم بیکە.

ماکوان: پێش ئەوەی بیکەم، یەك پرسیارم لێت هەیە.

ڕاقی: بپرسە، ئەگەر زانیم وەڵامت ئەدەمەوە.

ماکوان: سـەرم لەیەك شـت دەرناچێت، ئەم وشـە سـیحرانە چۆن کاریگەری دەبێـت کە تەنهـا وشــەیە، خۆ ئەوەش نییە بڵێم کەلامی خوایە، هەمووی قسەی درۆو خوزەعبەلاتە چۆن کاریگەری دەبێت؟

ڕاقی: دوو موگناتیس بدە بە جەمسـەری جیاواز یەك دەگرن، دوو جەمسـەری لەیەك چووش دووریان دەخاتەوە، ئەو کارلێکە چی پێدەوترێت لە زانستدا؟

ماکوان: هێزی موگناتیسی.

ڕاقی: ڕێك ئەوە بریتییە لە سیحر و ئەو کاریگەرییە دروست دەکات.
حەنانە لەپڕ پەیدا بوو، وتی ڕاقی فریاکەوە شەڕە.
ڕاقی دیار نەماو حەنانەش ڕۆشت، منیش بە تەنها مامەوە.

## شەڕی ماکوان و ئۆگە

حەنـانە لە پڕ هـاتو ڕاقیش نەمـا ئەوەنـدە گوێم لێبوو حەنـانە وتی ڕاقی فریاکەوە شەڕە.

دوای دوو ڕۆژ لەو ڕووداوە ســەســیـل-م بینی و هـات بۆلام بەرەو بـازاڕ دەرۆیشـتم، لە دوورەوە خۆی وا نیشـاندا زۆر بێتاقەتە دەموچاوی خۆی تێکداو وتی: ئای ماکوان چۆن دووبرای منت کوشت.

ماکوان: ئەوە بەتەمام لێرەش کڵاشینکۆفێك پەیدا بکەم تۆش بنێرم بۆلای ئەوان و حەواڵەت بکەم، نەجاتمان بێت لەشـــەڕی تۆش. دەســـتم خۆش بێت ئەگەر پیاوی چیت لەدەست دێت بیکە.

سـەسـیل: وا نەزانیت وازت لێدێنم، ئەوەی پێمبکرێت دەیکەم دژی تۆ. سـوێند بەوەی کە بڕوام پێیەتی ئەتکەم بە دز و ئەتکەم بە شــێت، ئەتکەم بە حیز، ئەتکەم بە داوێن پیس، ئەتکەم بە هەرچی شـتە. بۆ زانیاریت هەروا ناهێڵم لە ژێر دەستمدا بڕۆیت.

ماکوان: پێڵاوەکانم داکەند تێم گرت دیار نەما، بەڵام هاوارم کرد منەتت بەو پێڵاوانەم چیت لە دەست دێت بیکە. کە گەڕامە ماڵەوە تەلەفونم بۆ کرا، وتیان کاك ماکوان لە فەیسـبوك کابرای مریشـك دز، (هەڵە)مولحیدی خوێڕی قسـەی لەسەر کردوویت وتویەتی پارەی لە بەیتولمال دزیوە لای مەلا کرێکار!

منیش عەرزی ئەو برایەم کرد ئەگەر وەڵامی هەموو کەسـێك بدەمەوە ئەوە وەك ئەوانم لێدێت هەست بە بچوکی خۆشم دەکەم، بەڵام برۆ پێی بڵێ ئەگەر پیاوە هەرچی هەیە با بیخاتە ڕوو. بەهەر حاڵ ئەم پاشەڵ پیسە کە نەك تەنها پاشـەڵی پیسـە بەڵکو خێزانەکەی کە لە نەرویج پێکی هێناوە لە سـەر بنەمای سـووکی و پیسـی پێك هاتووە. جارێك ڕاقیم بانگ کرد وتم ئەم هەتیوە چۆن ئەم قسانە دەکات ئەوە سەسیل هانی ئەدات؟

ڕاقی: بۆی باسکردم هەموو مرۆڤێك فریشتەیەك و قەرینێکی جنۆکەی شەیتانی لەگەڵـدایە، فریشـتەکە ئـاڕاسـتەی دەکـات بەرەو بـاشـەو پێچەوانەش قەرینەکەیەتی، خۆ ئەگەر کەسەکە خراپەی زۆر کرد فریشتەکان دەڕۆن ئەوەی دەمێنێتەوە تەنها قەرینەکەیەتی واتا جنۆکە شـەیتانەکان، جا لەڕێگای ئەوانەوە سـەسیل ئەو کارانە دەکات ، هانی ئەو کەسانە ئەدات کە درۆ و دەلەسـەو بلا بکەنەوە.

ماکوان: واتا ئەو مولحیدانەش جنۆکە دەبینن؟

ڕاقی: نا - بەڵکو کاریگەری تەواویان هەیە لەسـەر مێشـك و هەسـتیانو بە ئاشـکرا ئاڕاسـتە دەکرێن. ئەوەی ئەو قەرینە جنۆکانە بیانەوێت، ئەچپێنن بە گوێ و مێشـك و خەیاڵدا کە ئەو شـتە بۆ ئەو کەسـە دروسـت بکەن. ئەوانیش لائیرادی بە بیرکردنەوە و توانـای خۆیـانی دەزانن، نـازانن بوونەتە کۆیلەی دەستی ئەو قەرینانە.

ماکوان: تێگەیشـتم ئەم شـەڕە بەردەوامە، گرنگ ئەوەیە موسـوڵمان بەتوانا بێت و لە ئاسـتی ئەو هەموو درۆ و دەلەسـانەی بۆی هەڵدەبەسـتن کەسـایەتی

نەڕوخێت، بەرانبەر بە پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) کراوە، پێی وتراوە کاهین‌و شاعیرو شێت و..هتد.

منیش بەردەوام بووم لە بە درۆ خستنەوەیان و ورونکردنەوەی ڕاستی بۆ هەموو لایەك و تەنانەت خودی مامۆستا کریکار خوا جەزای بداتەوە، نامەی ڕوونکردنەوەی دا کە تێیدا فەرموو بوی: ماکوان ئەوەندەی ناسیومانە بە دەست پاك ناسیومانە لەگەڵ هەندێك ڕوونکردنەوەی تردا.

تەنانەت جارێك پەیوەندیم بە (هەڵە دۆڕاوە) کرد بە ڕاستەوخۆ لە فەیسبوك، وتم وەرە باقسەبکەین لە ترسا تەلەفونەکەی داخستەوە ئیتر ئێستاش سەری دەرنەهێناوەتەوە.

لەدوای ئەوەی کە پێڵاوەکانم گرتە سەسیل و هاتمەوە بەرەو ماڵ، لە ڕێگادا ڕاقی- م توش بوو، وتی ماکوان فریای خۆت بکەوە سیحرێکی زۆر گەورەت لێکراوە لەلایەن کەسێکەوە ناوی (ئۆگەیە) و نەرویجییە و سەسیل ناوی تۆی داوەتێ ئەویش ساحیرێکی بەهێزە.

ماکوان: جا مادام لێرەیە بۆم بدۆزنەوە لە کوێدایە با بڕۆمە سەری.

ڕاقی: ئاسانە دەتوانیت بچیتە لای، بەڵام شەیتانی زۆرە و کاری زۆری بۆ دەکەن و سالانە لە کەرنەڤالی ساحیران لە (لۆسئەنجلس) بەشدارە، زۆر بەهێزەو لێرەش زۆر دەوڵەمەندە.

ماکوان: ئەگەر لەم کارەدا هاوکاریم بکەن، ئەوە سیقەی تەواوەتیم پێتان دەبێت، ناوی جێگاو شوێن و هەرچی زانیاری هەیە بۆم پەیدا بکەن و بە

زووترین کات بیگەیەننە دەستم. بزانن هاوڕێکانی کێن و دەچێتە کوێش دادەنیشێت و نان دەخوات.

پرسیاریکی تریشم هەیە؟

ڕاقی: فەرموو.

ماکوان: ئەگەر ئەو دوو سەد جنۆکەی لەگەڵ بێت ئێمە چەندمان لەگەڵدایە؟

ڕاقی: ئەو هەتا بڵێیت شەیتانی زۆری هەیە، بەڵام چەندت بوێت من پەیدای دەکەم، لەگەڵماندا دەبن بێخەم بە.

ماکوان: دەبڕۆن نەیەنەوە بۆلام تا زانیاری تەواوەتیم بۆ نەهێنن، کە هاتیشنەوە یەکسەر دەڕۆینە لای و شێوەی سیحرەکەشم بۆ بدۆزنەوە کەچییە؟

ڕاقی: ماکوان بەتەنها نەڕۆیت زۆر ترسناکە.

ماکوان: من گومانم لە بیروباوەڕی خۆم نییە، ئەو شەیتانی هەیە، من خوام هەیە. تۆ ئەوەی پێم وتون بۆم بکەن هیچی ترم ناوێت، من تەوەکولم بە خوای خۆمە.

دوای ١٨ کاتژمێر هەواڵم بۆ هاتەوە لای حەنانە-وە، شەو بوو هەڵسام لە خەو بۆ نوێژی بەیانی خەریکی دەستنوێژگرتن بووم، کە تەواو بووم هاتمە دەرەوە حەنانە لەبەردەم دەرگای حەمامەکەدا وەستابوو. خەریکبوو گیانم دەرچێت ئەوەندە ترسام، وتم ئەرێ هاوارێك قسەیەك کۆکەیەك بۆ ناکەیت خۆ خەریکبوو جەڵدە لێمدات ماڵت کاول بێت!

حەنانە: من هیچ ناڵێم وا خەریکە گیانت دەردەچێت، جا وەرە ئەگەر قسە بکەم. هەواڵم پێیە بۆت! ساحیرەکە ئێستا خەریکی سیحرە لە تۆ، هەر چاومان لەسەریەتی ناتوانین زۆر نزیك ببینەوە، شەیتانەکانی پاسەوانی بۆ دەکەن. ڕاقی وتی با دەست بکات بە خوێندنی سورەتی البقرة و نەخەوێتەوە تا ڕۆژ هەڵدێت و بەتەواوەتی خۆر ئەدات لە زەوی.

ماکوان: باشە وا دەکەم، دوا هەواڵ چییە؟

حەنانە: ئەوەندە بزانە ئەو جێگایەی ئەوی لێدەژی شارێکی زۆر بچوکە، جێگاو شوێنی زانراوە بێخەم بە.

ماکوان: سوپاس بۆ خوا منیش ئەوەم دەوێت، حەنانە ڕۆیشت و منیش دوای نوێژی بەیانی زیکرەکانم خوێندو ١٠٠ جار یش وتم لا إله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد، يحيي ويميت وهو على كل شيء قدير. ٣ جاریش سورەتی البقرة-م خوێند تا کاتژمێر ٩ بەیانی بەردەوام بووم.

زۆر ئاسایی بووم، ئیتر خەوم دەهات خەوم لێکەوت، زۆری نەمابوو بۆ نوێژی مەغریب هەڵسام و خێرا نوێژی نیوەڕۆ و عەسرم جەمع کرد خەریکی دروستکردنی نانی ئێوارە بووم، بانگی مەغریبی داو نوێژی مەغریبم کرد. ئەوەندەم زانی هەموو جنۆکەکان لە ماڵی ئێمە حازر بوون واتا حەزقیل و حەنانەو ڕاقی.

ماکوان: نانتان خواردوە یان ئێسقانتان بۆ ببرژێنم (خۆشترین خواردنی جنۆکە ئێسقانە)

ڕاقی: ماکوانی برام سـوێند بە خوا گەورەترین سـیحری لێتکرد، ئەو کابرایە ئەم شەو تۆ شێتت کردبوو نەیدەتوانی هیچت لێبکات، سبحان الله هاواری دەکرد دەیووت ماکوان کێیە؟ هەواڵیان بۆ دەهێنا دەیانووت ماکوانیش سـاحیرە، بۆیە هیچت بۆ ناکرێت لەگەڵیدا تا ڕۆژهەڵات بەردەوام بوو دواتر ماندبوو خەوی لێکەوت بەدەم سیحریشەوە دەیخواردەوە.

ماکوان: ناوی چییە؟

ڕاقی: ئۆگە

ماکوان: ئەو جێگایە چەند دوورە لێرەوە (واتا لە شارەکەی منەوە)

حەزقیل: نزیکەی سێ کاتژمێر.

ماکوان: حەزەی برام هەرچی پیاو چاکی لای خۆتانە کۆی بکەرەوە بەیانی دەڕۆین.

ڕاقی: ماکوان زۆر خەتەرە ئاگاداری خۆت بە.

ماکوان: من زەڕەیەك گومانم لە بیروباوەڕی خۆم نییە، جا ئەگەر ئیسـلامەکەم ڕاست بێت لێرەدا بۆ هەموولایەك دەردەکەوێت وایە؟

حەنانە: وایە.. ئەم شەو شێت بوبوو بەدەست ماکوانەوە، ئەو خەریکی قورئان خوێندن بوو، هیچی پێناکرێت بە پشتیوانی خوا..

بۆ بەیانی تەلەفونم کرد بۆ ٥ کوڕی هاوڕێم ٣ کورد و بۆسنییەك و عەرەبێك.

ئەم هاوڕێیانەم هەمووی هاتوچۆی مزگەوت دەکەن و هەمووشیان کوڕی چاك و ئازاو سـیقەیان پێدەکرێت، بۆم باس کردن کە سـاحیرێك دەیەوێت سـیحرم لێبکات و دەچینە سـەری، ئێوە تەنها چاودێری من دەکەن، ئەگەر ئەوکەسـەی من قسـەی لەگەڵ دەکەم بوون بە دوو کەس ئێوەش یەکێکتان بێنە لای من، ئەگەر بوون بەسێ کەس ئێوەش وەرنە پێشەوە.

پلانێکی زۆر باش و تۆکمەم داڕشت بە پشتیوانی خوا تەوەکولمان کرد و بە دوو سـەیارە کەوتینە ڕێ، بۆ ئێوارەکەی کـاتژمێر ٥:٣٠ خولەك گەیشـتینە ئەو ڕێسـتورانتەی ئەو نانی لێدەخوارد. پیشـتریش بە هاوڕێ جنۆکەکانم وتبوو کە پلانەکەمان چییە ئەوانیش هاوکارم بوون، هەموو لایەك پلانەکەیان پێباش بوو جنۆکەکانیش زۆریـان پێبـاش بوو، بەڵام هـاوڕێ مرۆڤەکـانم تەنهـا ئـامـادەی شەڕکردن بوون زۆر تێنەدەگەیشتن لە ڕەوشەکە.

ئۆگە هاتە ژوورەوە، حەزقیل لەدوورەوە خۆی نیشانی منداو وتی ئەوە ئۆگەیە.

منیش بە جەماعەتم وت ئەو کەسـەیە، کە دانیشـت من بۆ لای ئەو دەچم، بەڵام چاوتان لەسـەر من و ئەو بێت هەرچی بوو تا من ئاگادارتان نەکەمەوە هیچ نەکەن، یەکێك لە کوردەکان هەڵسا بچێت لێیبدات، وتم کورە دانیشە خۆ هێشتا هیچ نەبووە.

دوای ئەوەی گارسـۆنەکە لەلایدا لاچوو منیش چوومە سـەر مێزەکەی و وتم ئەتوانم دابنیشم لێرەدا وەك پرسیار نەمووت، بەڵکو یەکسەر دانیشتم واتا من دەتوانم دانیشم، خۆی زۆر پێ گرنگ بوو.

وتی نا ناتوانیت دانیشیت، من ڕێگات پێنادەم.

دەستیمگرت پەنجەیەكی بەدەستمەوە هات وا گوشیم تەقی بەدەستمەوە وامزانی شكاندوومە، گوێم لەدەنگت بێت كەلەت بەو پەرداخە ئەتەقینم، ئەزانی من كێم؟

ئۆگە: نا - نازانم چ مریشكێكی.. (جنێوێكی سووكی نەرویجییە)

ماكوان: كیسە گوو (ئەمەش هەر جنێوێكی نەرویجییە) من ئەوكەسم كە دوێنێ شەو بەدیارمەوە خەوت لێكەوت، ماكوانم ئەوەی كە سیحرت لێكردم، هەی كیسە گوو!

ئۆگە: شتی وا نەبووە ئەوە تۆ باسی چی دەكەیت.

ماكوان: باش من دەناسیت وا نیشان مەدە كە هیچ نازانیت، چونكە ناهێڵم لەم ڕێستورانتە هەروا بەئاسانی دەرچیتە دەرەوە.. ڕوونە، جا گوێم بۆ بگرە و بزانە چی دەڵێم (سروشتی خەڵكی نەرویجی وایە بڵێ گویم بۆ بگرە دەڵێت فەرموو)

ئۆگە: فەرموو چی دەڵێیت؟!

ماكوان: لەدوای ئەوەی گووەكەت خوارد لێرە هەڵدەستین دەچینە دەرەوە، دەچینە ئەو جێگایەی كە سیحرەكەت تێدا كردووە من بەدەستی خۆم ئەو خەت و قسە قۆڕانەی كە كردوتە ئەی سوتێنم و لەمە و بەدواوە بتبینم وببیستم كارێكی وا بكەیت بە چەقۆ پارچە پارچەت دەكەم! هەڕەشەكەشم جدی بوو.

کە وام وت دەسـتی کرد بە گیرفانیدا تەلەفونەکەی دەرهێناو وتی تەلەفون بۆ پۆلیس دەکەم، یەکسـەر لە دەسـتیم وەرگرت و ڕفاندم و هاوارم کرد لە کوڕە بۆسنییەکە وتم وەرە ئەو تەلەفونە بەرە و لای خۆتان بیکوژێنەرەوە.

کەئەوانی بینی ٥ کەسـی تر دانیشـتوون ئیتر دەنگی نەکرد و وتی باشـە با نانەکەم بخۆم دەڕۆین بۆ ماڵەوە.

لەناو سەیارەکەی ئەودا من و هاوڕێ بۆسنییەکەم ناوی عەمار بوو دانیشتین تا چووینە مـاڵەکەی، ڤێلایەکی خۆشـی هەبوو کە چوومە ژوورەوە نەمدەزانی سـیحرەکە لەکوێدایە، پێیان نەوتبوم، چاوەڕوان بووم حەزقیل، حەنانە یاخود ڕاقی هەواڵم بداتێ، بەلام هیچ نەبوو.

منیش بە تووڕەییەوە وتم دەی سـیحرەکە کوا بیهێنە تا ماڵەکەشـم بەسـەردا نەڕووخاندویت.

کە چوو هێنای فانیلەیەکی ژێرەوەی خۆم بەدەسـتیەوە بینی کە لەبەرمدەکرد، لەگەڵ چەند نووسـینێك کە خەت و نوسـین و ڕەسـمی ناشرین بوو نەمدەزانی چی لێبکەم، هاوارم کرد بەسـەریدا یا الله و سـورەتی مەعوزەتەینم خوێندو ئایەتەلکورسی، ئەوەندەم زانی حەزقیل هات وتی لەکەیەکەوە چاوەڕێین نەیان دەهێشـت بێینە لاتان. ئەوەندە شـەیتانی لێبوو کە ئایەتەلکورسـی و سـوڕەتی مەعوزەتینت خوێند کەسیان نەمان، ئەوە ئێستا هاتووین بۆ لات.

ئۆگە لە بەر دەسـتمدا زەلیل بووبوو، منیش پێمووت کێ پێیووتویت سـیحر لە من بکەیت؟

ئۆگە: من تۆ ناناســم هاوڕێکانم داوایان لێکردم کە ســیحرت لێبکەم، گوایە تۆ ئازاری ئەوانت داوە، وەڵامیان بۆ هێنامەوە کە تۆش ســـاحیریت بۆیە توانام نەبوو هیچت لێبکەم، تۆ لەکوێ خوێندووتە!؟

ماکوان: من ســـاحیر نیم و ســیحریش هیچ نازانم من موســـوڵمان و ئیســـلام ئایینەکەمەو ئەو قورئانەی کە دەیخوێنم قەڵغانمە و هیچ شـــتێك لە ســـیحرو جادووی تۆ کاری لێناکات.

ئۆگە: بەڕاست تۆ ساحیر نیت؟

ماکوان: نەخێر سیحر پیشەی کەسی باش و دیندار نییە، ئەوەی فاشل نەبێت لە ژیاندا خراپەکار نەبێت کاری واناکەت.

ئۆگە: واتە تۆ ساحیر نیت و ئێمە ئاوا گیرمان خواردبوو بەدەستتەوە؟

ماکوان: بەڵێ من ساحیر نیم و من موسوڵمانم.

ئۆگە: ئێستا من سحرێك دەکەم تۆ دەتوانی ئاشکرای بکەیت من چی دەکەم؟

ماکوان: بە پشـتیوانی خوا، ڕاقی خۆی نیشـان دام وتی مەترسـە لێرەم هەرچی بکات ئاگادارت دەکەمەوە.

گوریسێکی هەڵدا بە ئاسماندا، بە ئاسمانەوە وەستا.

پەڕۆیەکی ڕەشـــی هێنا و دوو جار بایدا و منداڵێک هاتە دەرەوە لێی و بە نەڕویجی وتی بە ئێمە ســـڵاو، دوای هـاواری کرد لە ســـەگێکی زل هـات گوریســـێکی تری هەڵدا وەك مار دەڕۆیشـــت، خۆی بە گوریســـەکەی ترەوە

بەستەوە و منداڵەكە چووە لای سەگەكەو لەلای دەمییەوە وەستا و سەگەكە منداڵەكەی خوارد و لە كۆمیەوە فڕیدایەوە دەرەوە منداڵەكە بە گوریسەكەدا سەركەوت، پەرۆ ڕەشەكەی هەڵدایەوە هیچی نەما.

ئەو ٥ كەسەی لەگەڵمدا بوو زیرەیان كردبوو!، هاوارم كرد ڕاقی ئەو مەوزوعە چییە فریامان كەوە هیچی لێتێناگەم؟

ڕاقی: هاتە لای گوێمەوە وتی ئەوە گوریسی یەكەم جنۆكەیەك بۆی گرتووە ئەوی تریش جنۆكەیەك بۆی هەڵواسیوە، ئەو منداڵە هەر جنۆكەیەو سەگەكەش سەگی خۆیەتی لەبەر چاوی ئێوە وای كردووە دەنا هەمووی فرت و فیڵی شەیتانەكان بوو بۆیان كرد.

ماكوان: ئەگەر ئایەتەكان بخوێنم دەتوانیت بیكاتەوە.

ڕاقی: نا بۆی ناكرێت.

ماكوان: ڕووم كردە ئۆگە ئەتوانیت جارێكی تر بیكەیتەوە، ئەو سیحرە؟

ئۆگە: ئاسایە..

دەستم كرد بە خوێندنی قورئان و هەر گوریسی هەڵدا هیچ نەبوو، هەر لەبەردەم خۆییەوە وەك مێش گیزەی دەهات هیچی بۆ نەدەكرا، سەگەگەی چەند جارێك قوروسكاندی و ڕۆشت، هیچی بۆ نەدەكرا منیش بەردەوام بووم لە خوێندنی ئایەتەلكورسی و دوعاكان بەگشتی، هیچی بۆ نەكرا.

هەڵســـامەوە وتم جەماعەت با بڕۆین، ڕووم کردە ئۆگە و پێم وت تۆ جارێ مریشکی و ئەوەندەی خۆت بەوەوە مەشغوڵ کردووە بڕۆ کارێک بکە باشترە، ئەوە ژیانە تۆی تێدای هەی مریشك.

هاتینە دەرەوە بەرەو شـارەکەی خۆم گەڕامەوە جەماعەت باسـیان دەکرد زۆر ترسابوون نەیاندەزانی ڕاستییەکە چییە، بۆم باسکردن ئەوە فرتوفێڵی ساحیرو شەیتانەکانە بڕیار وابوو دوای دوو ڕۆژ ماڵ و منداڵ لە کوردستان بێنەوە.

بۆ بەیانییەکەی ئەوەنـدەم زانی لە دەرگای مـاڵەکەمان درا، کـاتژمێر ٦ ئێوارە بوو، لە پەنجەرەکەوە تەماشام کرد ئۆگەیە!

داخۆ چی بوێتو بۆچی هاتووە.

## ئەوەی بیرم لێنەدەکردەوە ڕوویدا

دوای گەڕانەوەم لە شـــارەکەی ئۆگە، بۆ بەیانی ئێوارەکەی لە دەرگا درا، لە پەنجەرەکەوە ســـەیرێکی دەرەوەم کرد تا بزانم کێیە، بینیم ئۆگە لەدەرگای ماڵی من ئەدات، هەرلە پەنجەرەکەوە بانگم کرد چیت دەوێت؟

ئۆگە: سڵاو ماکوان ؛ تەماشا دەکەم سوجدەم بۆ دەبات.

ماکوان: ئەوەچییە ئەم کارە قۆڕە چییە دەیکەیت، شێت بوویت تۆ ئۆگە؟

ئۆگە: ماکوان تکایە هاوکاریم بکە، ئەم شەو هاوڕێکانم زۆریان لێداوم لەسەر تۆ.

دەستی کرد بە گریانێك وەك منداڵ فرمێسك بەچاویدا دەهاتە خوارەوە. من ترسام فیڵ بێت، هاوارم کرد دراوسێکانم هاتنە دەرەوە. خۆم بەئەنقەست وام کرد بۆ ئەوەی درواسێکان بێنە دەرەوە قەرەباڵغی دروست بێت لەوە ترسام نەوەکو خەڵکی تری لەگەڵ بێت و بەو فێڵە من بباتە دەرەوە، هەرچەندە منیش دوو چەقۆم پێبوو یەکێکیانم خستە باخەڵم و دانەیەکیش بەدەستمەوە.

کە قەرەباڵغی دروســـت بوو چوومە خوارەوە تەماشـــام کرد هەر خۆیەتی و نزیك بوومەوە لێی ســـوجدەی بۆ بردم، منیش زۆرم بەلاوە ســـەیر بوو، دراوسێکانم دەیانگوت چییە؟

وتم ببورن هیچ نییە، ئەمە هاوڕێمە حەشیشی لێبڕاوە پارەی پێنییە و داوای پارەم لێدەکات منیش نایدەمێ، وەڵا دراوسێیەکم کە وام وت چوو ٤٠٠ کرۆنی هێنا وتی بڕۆ بیکرە.

وتم: ئۆگە وەریگرە دوای ئەیدەن بە ساندویچ بەشەریکی دەیخۆین، دەستی کرد بە پێکەنین و وەریگرت، منیش وتم سوپاستان دەکەم من هاوکاری دەکەم

ئێستا دەیبەمە ماڵەوە زۆر ببورن کە ئیزعاجی کردن.

ئۆگەم بردمە ماڵی خۆمان و ڕێزم لێگرت، بەڵام هەر حەزەرم لێی هەبوو وتم نەکو سیلاح یان دەمانچەی پێبێت فێڵ بکاو لەپڕ بیتەقێنێت یاخود دەست بوەشێنێت، وتم چی دەخۆیت چای یان قاوە؟

ئۆگە: قاوە سوپاست دەکەم.

قاوەیەکم دروست کردو خەریکی خوێندنی ئایەتەکان و ویرد و ئایەتەکانی زەجر بووم دەموخوێند.

ماکوان: چیت لە ژێرسەردایەو بەتەمای چی و ئەگەر بە دوای فێڵەوەی ئەوکەللەیەت بە لاشەتەوە ناهیڵم، ئێمەی ئاسیایی زۆر زیرەکین لەسەربڕیندا!

ئۆگە: ماکوان تەماشای پشتم بکە.

کە کراسەکەی هەڵدایەوە هەموو جێگای قامچی و خوێنی تێزابوو.

ماکوان: ئەوە کێ وای لێکردوویت؟

ئۆگە: جنەکان لەبەر ئەوەی نەمتوانی لە ئاستی تۆدا بوستمەوە، بەس پێم بڵێ تۆ چیت؟ فێری ئەو سیحرەی خۆتم بکە.

ماکوان: من ساحیر نیم بڕوا بکە سیحر نازانم، بەڵام دەزانم چۆن بەتاڵی دەکەمەوە. من موسوڵمانم سیحر کردن کاری مرۆڤی باش و چاك نییە.

ئۆگە: منیش فێری ئەو ئیسلامە بکە، ئەوە داعشە کە لە موصڵن؟

ماکوان: نا- ئیسلام هیچ مرۆڤ و حیزب و کۆمەڵ و گروپێك خاوەنی نییە، بەڵکو خوا ی پەروەردگار خاوەنی ئەو ئایینەیە و بۆ ناسینی ئایینەکەی پەیامبەرێکی ناردوە ناوی موحەممەد ە(صلی الله علیه وسلم)، مرۆڤەکان خۆیان بەو ئایینەوە هەڵدەواسن بۆ ئەوەی سوودی لێوەربگرن هەیە بە نەزانی و هەشە وەك دوکان و بازاڕ دایناوە. هەیە بۆ دەسەڵات و سیاسەت و پاوەر بەکاری دێنێت. ئەوە کەوتۆتە سەر چۆنێتی مرۆڤەکان و بەکارهێنانی ئایینەکە کە بەکاری دەهێنن.. ڕوونە؟

ئۆگە: ئەو کاتەی لای من بوویت چیت خوێند؟ من

کەسم لا نەما لە جنەکان هەموو ڕۆشتبوون لەترسی تۆ.

ماکوان: لەترسی من نەبوو، بەڵکو لە ترسی قورئان و ئیسلام بوو.

ئۆگە: قورئان چییە؟ ئەوە نییە کە داعش دەڵێت شەریعەت و خەڵك سەردەبڕێت؟

ماکوان: نـا- بەڵکو قورئـان ئەوەیە کە خەڵکی نەجـات ئەدات لە هەموو ناڕەحەتی و تەنگەژەیەکی ژیان، ئەوەی قورئان بەکار بهێنیت ئاسـودەی ئەم ژین و ئەو دونیای تریش دەبێت.

ئۆگە: ئەو دنیایەی تر کە پرێسـتەکان باسـی دەکەن؟ مەبەسـتی قەشـە مەسیحییەکان بوو.

ماکوان: بەڵێ - بەڵام ئەو باسەی ئەوان تەزویرە ڕاست نییە.

ئۆگە: ئەی کامە ڕاستە؟

ماکوان: ئەوەی خوای موتەعال لە قورئانی پیرۆزدا باسی کردووە.

ئۆگە: چۆن قورئان فێر ببم؟

ماکوان: من لامە بەزمانی نەرویجی و ئینگلیزی و لە سـایتەکانیشـدا هەیە، حەز دەکەیت گوێی لێبگریت و بیخوێنیتەوە؟

ئۆگە: بۆ نا با بزانم چییە.

ماکوان: بەسـەر چاو، دەنگی غامدیم خسـتە سـەرو قورئانەکەم دایە دەسـتی بەزمانی نەرویجی ٦ دەقیقە سورەتی ال عمرانم خستە سەر، تەماشا دەکەم دەگری.

ماکوان: ئەوە چییە ئۆگە؟

ئۆگە: هەست دەکەم باوکم قسەم بۆ دەکات، دڵم زۆر ئارامە.

ماكوان: باوكی چی ئەوە فەرموودەی خوای موتەعاله خوای پەروەردگار قسەت بۆ دەكات.

ئۆگە: من نازانم زۆر خۆشحاڵم با بەردەوام بێت ئەگەر تەواو بوو بیخەوە سەری.

ماكوان: خەمت نەبێت زۆر گوێگرە تا دڵت تێر دەبێت، وازم لێهێنا چووم دەستم كرد بە سووركردنەوەی گۆشتی بەرخ لە فرندا و سركەو پیازو تەرتیباتم بۆ پێداكرد و دوعام دەكرد خوا هیدایەتی بدات، بانگی كوڕێكی رەفیقمم كرد فەڵەستینی بوو.

وتم وەرە بۆ ماڵمان خوای گەورە نێچیرێكی ناردوە با بە ئارەزووی دڵی خۆمان قسەی بۆ بكەین و بەڵكو موسوڵمانی بكەین، ڕاكە وەرە

گۆشت سووردەكەمەوە، ئەویش وەك من تیمساح ئاسا حەزی لە گۆشت بووا

نیو كاتژمێر دیقەتی ئۆگەم ئەدا ئەگریا، ئەم وت ئەوە بۆ ئەگریت؟ هیچ وەڵامی نەدامەوە، بەقەدەر هەموو دنیاش پێویستم بە حەزقیل-ە، بە ڕاقی-ە بەحەنانە-یە كەس دیار نییە.

ماجید هات بۆ ماڵمان كوڕێكی فەلەستینییە، بەڵام لە عێراق گەورە بووە كوڕێكی زیرەكو ئاقڵو دیندار بوو، تەعاروفم پێكردن لەگەڵ ئۆگەدا بەیەكەوە دانیشتن پاش ماوەیەك، خەریكی ڕازاندنەوەی سفرە بووم ئۆگە وتی دەڕۆم.

ماكوان: نایەڵم بڕۆیت نان بخۆ ئینجا بڕۆ.

ئۆگە: من ڤێجیتارم تەنها سەوزە دەخۆم.

ماکوان: ئەی گۆشت بۆ ناخۆیت؟

ئۆگە: ئاخر من ڕێز لە ئاژەڵ دەگرم نایخۆم، ئەوانیش حەزیان بە ژیانە.

ماکوان: تۆ ڕێزی ئاژەڵ دەگریت، بەڵام ڕێزی مرۆڤ ناگریت قسـەی بێمەعنا دەکەیت! نانەکەت بخۆ لەگەڵماندا، دەمزانی ساحیرەکان زیاتر گۆشت ناخۆن گیاین.

ئۆگە: ئەی تۆ بۆ گیا ناخۆیت ماکوان؟

ماکوان: لە ژیانتا شێرت بینیوە گیا بخوات؟

ئۆگە: نا.

ماکوان: ئێمە شـێرین، شـێریش گۆشـت نەبێت نایخوات و لاکەی تۆپیویش ناخۆین، گۆشـتی ئێمە حەڵاڵە دەی موسـڵمان بەو لەگەڵماندا بسـم الله بکەو بخۆ، من تەنهـا بۆ موجـامەلە وام وت چـاوەڕێی ئەوە نەبووم هەر بیر لە موسوڵمان بوونیش بکاتەوە.

ئۆگە: باشە دەمەوێت موسوڵمان بم، بەڵام چی بکەم؟

ماکوان: ماجید قسـەی بۆ بکە من تۆم بۆیە هێناوە بۆ ئێرە بۆ ئەوەی قسـە بکەیت، دامەنیشـە بەدیار تەلەفزیۆنەوە دەی، خێرا تەلەفزیۆنم کوژاندەوە. ماجید دەستی کرد بە قسە بۆی و ناردی بۆ حەمام خۆی شۆردو دەستێ جلی خۆمم بۆ هێناو هەموو جلەکانی خۆی فڕێدا جلەکانیم تەماشـا کرد هەمووی

تەلیســـمی ســـیحربوو، هەمووی لێی نوسرابوو شـــێوەی نووســـینی عیبری جولەکەی لەســـەر بوو، هەموویم ســـوتاند بەو شـــەوە. شـــایەتومانی هێناو دەســـتی کرد بە نوێژ کردن لەگەڵ ماجید و وتی باشـــە من دەڕۆم هەرچی وتمان مەڕۆ وتی بەخوا زۆر مورتاحم حەز دەکەم هەوای پاك هەڵمژم، ئەوە ماوەی چەند ساڵێکە هەر بەشەو خەبەرم و بەڕۆژ نوستووم! دەمەویت وەك مرۆڤ بژیم دەمەوێت زوو بخەوم و بەیانی هەڵسم لەخەو خۆر ببینم.

لەکاتی خوا حافیزی وتم تەلە فوونەکەتم بدەرێ ئەگەر شتێکت پێویست بوو پرسیار بکە لەخزمەتاندام، ژمارەی تەلەفونەکەم لێوەرگرت.

ئۆگە: ماکوان با پارەی جلەکانت بدەمێ؟

مـاکوان: خۆ من نەرویجی نیم پـارەی نـانخواردنەکەشـــت لێوەر بگرمەوە! (نەرویجی بۆ ئەو شـــتانە زۆر سروشـــتێکی ســـەیریان هەیە زۆر جار پارە لەیەکتری وەردەگرنەوە کە کەسـێك لەماڵی خۆشـیدا شـتێك ببەخشـێت) بە پێکەنینەوە.

ئۆگە: دەی براکەم السلام علیکم.

ماکوان: وعلیکم السلام ورحمة الله وبرکاته.

هاتمەوە بۆلای ماجید تەماشـــا دەکەم وەك پیاو قاپەکان دەشـــوات، قاپەکان تەواو بوو وتی دەڕۆم خێزانم بە تەنهایە، خواحافیزیشـم لەو کرد، دەسـتنوێژم گرت بۆ نوێژی عیشا هاتمەوە ژووری دانیشتن ڕاقی و حەزقیل دانیشتبوون.

ئۆگە: من ڤێجیتارم تەنها سەوزە دەخۆم.

ماکوان: ئەی گۆشت بۆ ناخۆیت؟

ئۆگە: ئاخر من ڕێز لە ئاژەڵ دەگرم نایخۆم، ئەوانیش حەزیان بە ژیانە.

ماکوان: تۆ ڕێزی ئاژەڵ دەگریت، بەڵام ڕێزی مرۆڤ ناگریت قســەی بێمەعنا دەکەیت! نانەکەت بخۆ لەگەڵماندا، دەمزانی ساحیرەکان زیاتر گۆشت ناخۆن گیاین.

ئۆگە: ئەی تۆ بۆ گیا ناخۆیت ماکوان؟

ماکوان: لە ژیانتا شێرت بینیوە گیا بخوات؟

ئۆگە: نا.

ماکوان: ئێمە شــێرین، شــێریش گۆشــت نەبێت نایخوات و لاکەی تۆپیویش ناخۆین، گۆشـتی ئێمە حەڵاڵە دەی موسـڵمان بەو لەگەڵماندا بسـم الله بکەو بخۆ، من تەنهـا بۆ موجـامەلە وام وت چـاوەڕێی ئەوە نەبووم هەر بیر لە موسوڵمان بوونیش بکاتەوە.

ئۆگە: باشە دەمەوێت موسوڵمان بم، بەڵام چی بکەم؟

ماکوان: ماجید قســەی بۆ بکە من تۆم بۆیە هێناوە بۆ ئێرە بۆ ئەوەی قســە بکەیت، دامەنیشــە بەدیار تەلەفزیۆنەوە دەی، خێرا تەلەفزیۆنم کوژاندەوە. ماجید دەستی کرد بە قسە بۆی و ناردی بۆ حەمام خۆی شۆردو دەستێ جلی خۆمم بۆ هێناو هەموو جلەکانی خۆی فڕێدا جلەکانیم تەماشـا کرد هەمووی

تەلیسمی سیحربوو، هەمووی لێی نوسرابوو شێوەی نووسینی عیبری جولەكەی لەسەر بوو، هەموویم سوتاند بەو شەوە. شایەتومانی هێناو دەستی كرد بە نوێژ كردن لەگەڵ ماجید و وتی باشە من دەرۆم هەرچی وتمان مەڕۆ وتی بەخوا زۆر مورتاحم حەز دەكەم هەوای پاك هەڵمژم، ئەوە ماوەی چەند ساڵێكە هەر بەشەو خەبەرم و بەڕۆژ نوستووم! دەمەویت وەك مرۆڤ بژیم دەمەوێت زوو بخەوم و بەیانی هەڵسم لەخەو خۆر ببینم.

لەكاتی خوا حافیزی وتم تەلە فوونەكەتم بدەرێ ئەگەر شتێكت پێویست بوو پرسیار بكە لەخزمەتاندام، ژمارەی تەلەفونەكەم لێوەرگرت.

ئۆگە: ماكوان با پارەی جلەكانت بدەمێ؟

ماكوان: خۆ من نەرویجی نیم پارەی نانخواردنەكەشت لێوەر بگرمەوە! (نەرویجی بۆ ئەو شتانە زۆر سروشتێكی سەیریان هەیە زۆر جار پارە لەیەكتری وەردەگرنەوە كە كەسێك لەماڵی خۆشیدا شتێك ببەخشێت) بە پێكەنینەوە.

ئۆگە: دەی براكەم السلام علیكم.

ماكوان: وعلیكم السلام ورحمة الله وبركاته.

هاتمەوە بۆلای ماجید تەماشا دەكەم وەك پیاو قاپەكان دەشوات، قاپەكان تەواو بوو وتی دەڕۆم خێزانم بە تەنهایە، خواحافیزیشم لەو كرد، دەستنوێژم گرت بۆ نوێژی عیشا هاتمەوە ژووری دانیشتن ڕاقی و حەزقیل دانیشتبوون.

ماکوان: ئەرێ ئیوە بۆ هەمیشـــە وەك فیلمی هیندی دەبێت لە کۆتایەکەییدا ئامادە بن، چەندە پێویستم پێتان بوو هەر نەهاتن. ئۆگە لێرە بوو موسولمان بوو.

حەزقیـل: ئـاگـادار بووین، بەڵام مـاکوان هەر بەچوونەوەی بۆ مـاڵەکەی دەیکوژن. بزانن موســـولمان بووە پارچە پارچەی دەکەن، ئەوە زۆر تێکەڵە لەگەڵ جنۆکە شەیتانەکاندا.

ماکوان: ئەی چی لێبکەم؟

ڕاقی: نەدەبوو بهێڵیت بڕوات بڕوا بکە ئەم شەو دەیکوژن.

ماکوان: ئەوە کاتژمێرێك نابێت کەوتۆتە ڕێ تەلەفونەکەی لامە خێرا تەلەفونم بۆ کرد، چەندجار لێیدا هەڵینەگرت لەدڵی خۆمدا وتم ســـەیارە لێدەخورێت بەئەوانیشم وت بۆیە هەڵیناگرێت سەیارە لێدەخوڕێت.

حەزقیل: بەخوا سەیارەکەیان وەرگەڕاندووە. کە حەزقیل وای وت من دڵم زۆر ناخۆش بوو، دیســـان تەلەفونم کردەوە هەر دەنـگ نەبوو جـارێکی تریش کردمەوە ئەمجارەیان وەڵام درایەوە. ئەو کەســـەی کە وەڵامی دایەوە خۆی ناساند و وتی من پۆلیسم ئەوکەسەی تەلەفونت بۆ کردووە تووشی ڕووداوی هاتووچۆ بووە تۆ چی ئەویت؟

یەکسەر وتم هاورێمە لای من بووە ڕۆشتۆتەوە بۆ شارەکەی خۆی.

پۆلیس: دەتوانیت بێیتە لای هاوکاری بکەن و حاڵی زۆر ترسـناکە و دەیبەینە ئەو نەخۆشـخانەیە لە نزیك شـارەکەی من بوو، واتا گەڕاندبوویانەوە بۆ ئەو نەخۆشخانەیە، چونکە نەخۆشخانەیەکی گەورە بوو.

وتم ئێستـــا دەردەچم ئەدرەســـەکەم بدەرێ وا هاتمە لاتان چەندێك دوورم لەڕووداوەکەوە؟

پۆلیس: نیزیکەی کاتژمێریك، بەڵام دەیبەینە ئەو نەخۆشـــخانەیە نیو کاتژمێر دوورە لە تۆوە، وەرە ئەوێ.

ماکوان: زۆر باشە واهاتم، کە ئاوڕمداوە: نە حەزقیل هەیە نە ڕاقی هەرچەندە زۆر گوێم پێنەدان. کاتێك گەیشتمە لای و بینیم وێران بوبوو.

پرســیم ڕووداوەکە چۆن بووە، وتیان نازانین زۆر ســەیرە نەخۆی بەهیچدا کێشاوە، وە نەهیچ خۆی کێشاوە بە سەیارەکەیدا، بەڵکو جامی سەیارەکەی شکاوە هەرچی سەیارەکەشیەتی وێران بووە، خۆشی برینەکەی زۆر ترسناکە ئەگەر بمینێت باشە!

هیچم پێنەکرا بێهۆش بوو، بەڵام شـوێنەکەیم زانی. منیش دەبوو بەیانی زوو بچمە فڕۆکەخانە ماڵو منداڵ دەگەڕێنەوە بۆ نەرویج، ناچار بە جێمهێشت و گەڕامەوە بۆ مـاڵەوە لەویش بوومـایە هیچم پێنەدەکرا. بەهەرحـاڵ دوای دووڕۆژ گەڕامەوە بۆ نەخۆشخانە هەواڵم پرسی ویان بێهۆشە، چوومە سەری دەستم کرد بە قورئان خوێندن تا چارەکێك قورئانم خوێند بەسەریدا، لەپڕ ژن و پیاوێك خۆیان کرد بە ژووردا و کە منیان بینی وتیان تۆ کێیت؟

منیش وتم ئەی ئێوە كێن؟

وتیان: ئەوە كوڕی ئێمەیە ناوی ئۆگە-یە.

هەڵسـامەوە لەبەریان و تەوقەم كرد لەگەڵ باوكی و وتم من ناوم ماكوانەو هاوڕێی ئۆگەم، ئەو شەوە لای من بووە كە گەڕاوەتەوە تووشی ئەو ڕووداوە بووە.

باوكی زۆر ڕێزی لێگرتم ناوی كنیوت بوو، دایكیشـی ناوی بیۆرگ. دایكی زۆر سـەگو سـەگ باب بوو، وای دەزانی من سـەیارەكەم لێخوڕیوە وام لێكردووە، بەڵام باوكی پیاوێكی زۆر نەجیب بوو.

بەهەرحاڵ بە جێمهیشـت و بە باوكیم وت: ئەگەرباش بوو ئاگادارم بكەرەوە دێمەوە بۆلای.

دوای هەفتەیەك كنیوتی بـاوكی ئۆگە تەلەفونی بۆ كردم، مـاكوان وەرە هەواڵێكی خۆشم پێیە بۆت، ئۆگە باش بوو هەواڵی تۆی پرسیوە.

ماكوان: یەك كاتژمێری تر لاتانم كەچووم ئۆگە باش بوو، منیش لەبەر چاوی دایكی و باوكی وتم براكەم السـلام علیكم و سـوپاسـی خوا دەكەم كە باش بوویت من و هاوڕێكانم دوعای خێرمان بۆ كردی لە نوێژی جومعە كە وام وت زۆری پێخۆش بوو بـاوكی پێدەكەنی و دایكیش وەك پیرێژنی دۆ ڕژاو لچێكی دابوو بەسەر لچەكەی تریدا.

ماكوان: بۆم باس كە چی ڕوویداوە؟

ئۆگە: ماکوان حەز دەکەم ئەو شتە بکەم کە فێرتان کردم.

مەبەستی دەستنوێژ بوو.

ماکوان: باشە وەرە بچینە حەمام.

دایکی هات تا یارمەتی بدات، وتی نا با ماکوان بێت ئاگام لێبوو دایکی خەریك بوو ئەتەقی. وتی ئەم کوڕەی من زۆر سەیرە.

ماکوان: ئەو سەیر نییە کێشە لە تۆدایە لێی تێناگەیت.

لەبەرچاویدا دەستنوێژم گرتو فێرم کردەوە.

هاتمە دەرەوە لە پشت دەرگای تەوالێتەکەوە وەستام وتم نەکو پێداویستی هەبێت و یاخود بکەوێت، باوکی وتی ماکوان زۆر ســەیرە ئەم کوڕەی ئێمە هاوڕێیەتی کەسی نەکردووە زۆرمان بەلاوە سەیرە کە بووە بە هاوڕێی تۆ.

ڕوومکردە دایکی وتم بەشکوم جەڵدە لێیبدات، وتم دەزانی ئۆگە موسوڵمان بووە، بووە بە برای ئێمە. قسەکەم تەواو نەکردبوو.

ئۆگە: ماکوان با نوێژ بکەین.

ماکوان: با بیکەین

کات نێوانی نوێژی مەغریب و عەسر بوو، من نوێژی عەسرم کردبوو، بەڵام جارێکی تر کردمەوە بۆ ئەوەی ئۆگەش بیکات، دوعام بۆ کرد بە زمانی نەرویجی و هەستم کرد وردە وردە بەرەو باشی دەڕۆیشت.

ماكوان: با بڕۆینە جێگایەك دابیشـــین لە كافتریای نەخۆشـخانەكە بەیەكەوە قسە دەكەین، دوور لە دایك وباوكیشت، رازیت؟

ئۆگە: ڕازیم! دایكی هات و وتی ئێمەش لەگەڵ باوكت دەچین ســـەردانێكی ناو بازاڕ دەكەین، زۆر بە ناشیرینی بەدایكی وت بڕۆن.

ماكوان: نابێت بەو شێوە قسە لەگەڵ دایكت بكەیت، لە ئیسلامدا بەهەشت لەژێر پێ دایكاندایە ئەگەر موســـوڵمان بێت، بەڵام ئەگەر كافر بوو دەبێت هەر ڕێزی بگریت بە ئەدەبەوە قســـەی لەگەڵ بكەیت ئیحترامی بگریت و هەستە دەستی ماچ بكە. كەوام وت هەڵسا دەستی دایكی ماچ كردو دایكی وتی بەڕاستی سەیرە.

چووینە كافتریاكە لەوێ دەستمان كرد بە قسە وتم ئەو شەوە چی ڕوویداوە بۆم باس بكە.

هەمووی بۆ گێڕامەوە كە سوكانی سەیارەی لە دەست وەرگیراوە، شوشـەی ســـەیارەكەی شـــكاوە نەیتوانیوە ســـەیارەكە ڕاگرێت و سـتۆپ بكات، تواناى بەسەر سەیارەكەدا نەماوە.

ماكوان: خەتای من بوو براكەم ببورە، نەدەبوو بهێشـــتایە بڕۆیتەوە بۆ ئەو ماڵە، چونكە ئەوكەســـانەی كە هاوكارت بوون پێشـتر بۆ سـیحر ئێســـتا وازت لێناهێنن دەبێت چارەسەرێك بدۆزینەوە.

ئۆگە: چی دەڵێیت بە قسەت دەكەم.

ماکوان: من دەڵێم برۆ بۆ عومرە نزیکی ڕەمەزانە، کەسێکت لەگەڵدا دەنێرم فێرت بکات و لەوێش ئارام دەبیت، ناوێرن بێن بەلاتدا برۆ بۆ مەککە و مانگی ڕەمەزان لەوێبە. هەر فیزەکەشت کۆن بوو نوێی کەرەوە لەڕێگای ئەو شەریکەوە، بەڵام نوێی کەیتەوە لە مەککە و مەدینە ئەگەر بەقاچاخ بگیرێیت ٥ ساڵ حوکمە ئاگادار بە! ئەگەر پارەشت پێنییە من هاوکاریت دەکەم.

ئۆگە: ئەوە دەڵێ چی ماکوان من بە ملیۆن کرۆنم هەیە، پارەم بۆچییە.

ماکوان: دە لەو ملیۆنانە ١٠٠ هەتیو بگرە خۆت لە کوردستان، ئامادەیت؟

ئۆگە: تۆ چی دەڵێیت ماکوان وەعد من دەیکەم ئەوە ١٠٠ بدۆزەرەوە من پارەکەی پێئەدەم.

ماکوان: برۆ بۆ حەج و بێرەوە دوایی قسە دەکەین، مەلایەکی ڕەفیقم هەیە سۆماڵییە هەتا بڵێیت دیندارە لەگەڵ ئەو ئەتنێرم، بەس زمانی باش نییە.

ئۆگە: ماکوان بەخوا من پێویستم بە زانیارییە کەسێکم بۆ بدۆزەرەوە با زمان بزانێت.

ماکوان: تەلەفونم کرد بۆکوڕێکی پاکستانی وتم ئەو کارەم بۆ دەکەیت؟

وەڵامی دامەوە بە نەخێر.

دوای ئەوەی لە نەخۆشخانە دەرچوو، ماوەیەکی زۆری بەسەردا ڕۆشت، تەلەفۆنی بۆ کردم وتی دەچمەماڵی باوکم، ئەگەر کەسم بۆ پەیدا نەکەیت خۆم دەڕۆم هەراسانیان کردووم. هەرچەندە نەمزانی چی ڕوویداوە

بەهۆكاری سـەرقاڵیمەوە، بەڵام خوای گەورە ئاسانی كرد لەگەڵ مزگەوتێك لە ئۆسـلۆ ناردم بۆ عومرە كوڕێكی خەڵكی فەلەسـتینم لەگەڵیـدا دانـا نەرویجییەكەی لە عەرەبییەكەی باشـتر بوو. ناردمن بۆ حەج، پارەی ١٠٠ هەتیویشی دانا بوو كە بۆیان بنێرم.

سوپاس بۆ خوا لە سلێمانی، هەولێر، هەڵەبجە، كەلار، دەربەندیخان، پێنجوین و كەركوك خەڵكمان دۆزییەوە ئەوەی زانیمان موسـتەحەقە لە پارەی ئۆگە هاوكاریمان كرد.

شـەوی ٢٧ ڕەمەزان ئۆگە پەیوەندی پێمەوەكرد و وتی ماكوان دوعـات بۆ دەكەم بڕۆیتەوە بۆ كوردستان.

دەیزانی كێشەی سەفەركردنم هەبوو و حەز دەكەم بگەڕێمەوە بۆ كوردستان.

وتی كتێبی باشم بۆ كڕیویت، بەم نزیكانە دێمەوە بۆلات.

ماكوان: نەیەیتەوە بۆ ئێرە تا - لەوێیت بڕۆ بۆ شـاری (جدە) بۆلای (طارق الحبیب) ئەو پیاوەی كە نیشـانم دای لە یوتیوب پرۆفیسـۆرێكەو باسـی ژیانی خۆتی بۆ بكە با هاوكاریت بكات. ڤیزە وەرگرەو بڕۆ بۆ جدە.

دوای ٨ ڕۆژ پەیوەندی پێوە كردمەوە وتی ئەوكەسە لە شاری (ریاض)ە چووم بۆلای و دوو شەو لای ئەو بووم.

ماكوان: زۆر باشـە مادام چووی بۆلای ئەو ئێسـتا دەتوانیت بگەڕێیتەوە بۆ نەرویج.

ئۆگە هاتەوە پشــتی تویتایەك شــتی بۆ هێنابوم ١٢ دزداشــەی هێنابوو بۆم، بێجگە کتێب و سیواك و عەتر و خورمای عەجوە و ئاوی زمزم.

ماکوان: وەزعت چۆنە؟

ئۆگە: زۆر باشم!

ماکوان: ناترسی لە شەیتانەکان؟

ئۆگە: حەددیان نییە بێن بەلامدا، خانووەکەی خۆی فرۆشت ناردی بۆ خەڵکی فەڵەســتین، ئێســتا کۆمپانیای تەکســی هەیە لە شــارەکەی بەندە حەزی بە هاوڕێەتیمان کردو نەگەڕاوەتەوە بۆ شــارەکەی خۆی، ناوی خۆی گۆڕیوە بە ئوسامە کۆمپانییەکەی ٨ تەکسی تێکردووە.

## سیحر و زانکۆ و ئەکادیمیا

لەگەڵ ئۆگە (ئوسامە) نێوانمان زۆر خۆش بوو چەندجار هاتوچۆی یەکترمان کرد و پاشان جارێکیش بەیەکەوە سەفەری باخچەی ئاژەڵانمان کردو چەند سات و کاتێکی خۆشمان بەیەکەوە بردە سەر.

زۆر جار باسی سیحرەکانی خۆی بۆ دەکردم کە چۆن جنۆکەکان هاوکارییان کردووە و ئەم نەیزانیوە کە جنۆکەن، بەڵکو ئۆگە هەر بڕوای بە خواش نەبووە.

ڕۆژێك لێم پرسی چۆن ئەم کارە ناپوختەیە فێربوویت؟

ئۆگە: زۆر تەماشای فیلمەکانی هاری پۆتەرم دەکرد زۆر حەزم بەکاری سیحر بوو، سەرچاوەکەشی ئەو کۆمەڵە فیلمە بوو کە بەچەند بەشێك دەرچوو. پاشان داوام کرد لەگەڵ باوکم و دایك و خوشکێکم چووین بۆ ئەمریکا بۆ لۆس ئەنجلس، لەوێ بە باوکمم وت دەمەوێت فێری سیحر بم. لەو شارە قوتابخانەی لێیە زۆربەی زۆری یەهودی و فارسەکانی ئێرانن کە وانەی تێدا دەڵێنەوە. منیش چوومە پەیمانگا، بەڵام کۆرسێکی سەرەتایی بوو زیاتر لەوێدا هونەری سیحر باس دەکرا. دوای ئەوەی کە زانرا من خولیام سیحرە، مامۆستایەکی جولەکەم هەبوو بەناوی جۆزیف. وتی دەتنێرم بۆ جێگایەك وەك ئەوەی هاری پۆتەر وایە.

وامزانی گاڵتەم پێدەکات، چونکە ئەوەندە باســی هاری پۆتەرم کردبوو زۆر جار لەگەڵ هاوڕێکانمدا لاسایی ئەوم دەکردەوە و کارەکانی ئەوم دەکرد.

جۆزیف: ئەتنێرم بۆ جێگایەك ناوی ئەکادیمیای جادووی ئەمریکییە، لەو زانکۆیەدا حکومەتی ئەمریکی بە فەرمی ناســاندوویەتی و ١٦ بەشــە بەشەکانی بریتن لە: کیمیا و چۆنێتی دروستکردنی عەصای جادووی و بەشی شــەڕ دژی هێزی خراپ و شــەڕەنگێز. هەر وەك قوتابخانەکەی هاری پۆتەر وابوو، کە ناوی هوجورتس بوو. دوایی بۆم دەرکەوت هەموو فیلمەکە لەو زانکۆیەوە وەرگیراوە.

ماکوان: ئەمریکا هەر ئەو زانکۆیەی تێدایە ؟

ئۆگە (ئوسامە): نا زۆرە لە بەناوبانگترینیان

ئەمانەن کە دیارن وەك زانکۆی جادووی (ماساتشوستس)

ئەم زانکۆیە لە ویلایەتی ماســاتشــوســتس ە، خاوەنی ٤٠ هەزار قوتابییە لە هەموو جیهانەوە ڕووی تێدەکەن، هەندێکیان لە ڕێگای ئینتەرنێتەوە دەخوێنن و هەندێکی تریشیان بەردەوام لە زانکۆکە دەوام دەکەن. هەروەها لە باکوری ئەمریکا زانکۆیەکی تری لێیە ئەمە زۆر ترسناکە ناوی (سیباستیان) جادووە، ئەم زانکۆیە دەکەوێتە (گراند کانیون) لە ویلایەتی ئاریزۆنا، ئەو کەســەی کە ئیدارەی دەکات و ســەرۆکی زانکۆکەیە ســاحیرێکی بەناوبانگی ئەمریکیە ناوی ســیباســتیان ە، زانکۆیەکی تری لێیە ئەوە زیاتر پەیوەســتە بە دەزگای جاسوسی ئەمریکی (سی ئای ئەی) بەناوی (ئیونشیان) بە زانکۆی فێرخوازی باڵا دادەنرێت، ئیتر وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا گەورەترین زانکۆ

و پەیمانگا لەم بەشــەیە لە. هەمووشــتێکی مەحاڵ دەکرێت - ئەوشــتانە دەکرێت تەنانەت لەتوانای ئێمەو مانانیشــدا نەبوو، زۆر لە ئێمە گەورەتر دەچوونە ناوی و وەردەگیران.

ماکوان: تەنها لە ئەمریکا هەیە؟ ئەی لە جێگای تری دونیادا نییە؟ بۆنمونە ئەوروپا، ئاسیا و ئەفریقا.هتد

ئۆگە (ئوسـامە): چۆن نییە زانکۆی نێودەوڵەتی سـیحر هەیە لە سـکۆتلەندا، ناوی ئەکادیمایی (ماکتافیش)ە بۆ زانستەکانی جادوو ناوەکەی بەو شـێوەیە. یەکێکە لە زانکۆ بەناوبانگەکانی جیهان بۆ ئەو بوارە، من چووم لە ناوچەیەکی زۆر خۆشدایە لەسەر کەنارەکانی لۆش نیسە، گەورەترین زانکۆی سەر زەوییە. لە کەرنەڤاڵی جادووبازەکاندا لەوێ بووم و دیاریم وەرگرتووە.

ماکوان: دیارییەکەت چی بوو؟

ئوسامە ئۆگە: هەندێك دەرمانی سیحر کە زۆر گرانبەهابوو و خۆڵی فیرعەونە.

ماکوان: پەنا دەگرم بە خوا لەم کارە قۆڕانە، ئەی جێگای تر هەیە لە وڵاتی ئیسلامییەکان زانکۆی وا هەیە؟!

ئۆگە (ئوســـامە): ئەی چۆن نییە زانکۆی هەڕەمەکانی میسرـــ گەورەترین زانکۆیە لە هەموو ئەفریقادا کە لە دوو بەش پێك هاتووە بەشــێکی لە ناو (گیزە)یە لای ئەهرامەکان و بەشــێکی تری لەژێر زەویدا لە ناو کتێبخانەی ئەسکەندەریەدایە ئەوەی کە جادووباز نەبێت بۆی نییە بچێتە ئەو بەشە.

بۆ زانیاریت ماكوان زیاد لە ٢٠٠هەزار كرۆنم داوە برۆمە ناو ئەو كتێبخانەیە نەیانهیشتوە. كتێبی زۆر گرنگی تێدایە لەسەر جادووبازی كە دەگەڕێتەوە بۆ شـارسـتانی فیرعەونەكان، واتا نزیكەی ١٥ سـەدە پێش لەدایك بوونی پێغەمبەرعیسای كوری مەریەم - سەلامی خوای لێبێت.

با بیرم نەچێت ماكوان شتێكی تر هەیە بیزانە چیایەك هەیە لە ئەفریقا ناوی (بیروە)یە كۆمەڵێك سـاحیری گەورەی لێیە، كە پەیمانگایەكیان كردۆتەوە بە پـارە خەڵك فێر دەكەن، ئەوانیش گرنگترین جـادووبـازەكـانی جیهـانن لەو شاخەدا دەژین و تەنانەت فڕۆكەیان هەیە و چەكی قورسی تایبەت بەخۆیان هەیە. دەوڵەمەند ترین خەڵكن و بازرگانی بە ئەڵماسەوە دەكەن.

ماكوان: ئەی ئاسیا، لە عێراق، ئێران، توركیا، پاكستان لەو وڵاتانە تەویلەخانەی وا هەیە؟ ئەوەی كە پێی دەڵێن زانكۆ.

ئۆگە (ئوسامە): بە پێكەنینەوە تەنها لە دوو وڵاتی زلهێزدا هەیە، ئەویش چین و ڕوسـیایە. ئەوەی ڕوسـیا زۆر ترسـناكە، لە ئەوروپا و لە ئاسـیادا دژایەتی هەرچی ساحیرەكانە دەیكات و تواناو هێزیكی زۆر سەیر و بەتوانایان هەیە. ئەم زانكۆیە لە كەنارەكانی دەریای ڕەشـە لە ناوچەی كراسـنوكاریسـكی، لە چینیش ئەوەندەی كە من بزانم هاوڕێ جادووبازەكانمان بۆیان باسـكردوین و خوێنـدویشـمانە، كە نـاوی زانكۆی (مینج) ی چینییە. لە نزیـك دیوارەكـانی چینەو لە پەكینی پـایتەخـت، ئەو زانكۆیە تەنهـا قوتـابی پەروەردە نـاكـات ئوستازی جادووگەر پەروەردە دەكات!

زانیاری ترت دەوێت ماكوانی ئازیز؟

ماکوان: بەدڵنیاییەوە زانیاریم دەوێت بەدوای شــتی تریشــدا دەگەڕێم، ئەی لەناو ئێوەدا خەڵکی موسوڵمانی تێدابوو؟

ئۆگە(ئوســامە): ئەوەی ســیحر بکات نابێت دینی هەبێت، دەبێت دژی خوابێــت، بەڵام پەیڕەوانی دوو ئــایین بۆیــان هەبوو بێنە نــاو زانکۆکــان، زەردەشــتییە ئێرانییەکان و هیندییەکان. هەروەها جولەکەکانی ئەمریکا. لە چەند زانکۆیەك وەك تەعلیمات درابوو بە قوتابیەکان نابێت جادووبازەکان هاوڕێیەتی موسوڵمانان بکەن و هیچ موسوڵمانێکیش بۆی نییە نزیك بێتەوە لە زانکۆکانیان، لە یەکێك لە زانکۆکانی ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا دەڵێت تەنانەت دەتوانیت بیکوژیت!

ئەگەر دەتەوێت باسی مەنهەج و خوێندنەکەشت بۆ دەکەم.

ماکوان: نا - نامەوێت هەر گوێم لیبێت.

ئۆگە(ئوســامە): ســەیرە خەڵکانێك پارە ئەدەن بۆ ئەوەی یەك وشــە لە من ببیستن ئەوە تۆ یەکەم کەسی دەڵێیت نامەوێت هەر گوێم لێبێت!

ماکوان: ئوسامەی برام نامەوێت گوێم لە زانستی جادووەکە بێت کافر دەبین کافر، بەڵام گوێ دەگرم بۆ مێژووی کارەکانی تۆ. نیعمەتی ئیســلام هەروا ســادەو ســاکار نییەو کافربوونیش یاری منداڵان نییە. من بزانم پیاوکوشــتن خراپە چۆن دەیکەم. سیحر لە پیاو کوشتنیش خراپترە.

ئۆگە(ئوسامە): بڕوا بکە ماکوان ئێستا هەست بە لەدایك بوونم دەکەم، ئەزانم ئیسلام چەندە بەرزە، ئەی پێم بڵێ بە تەما بوویت بڕۆیتەوە بۆ کوردستان؟ وتت سیحرت لێکراوە ئەو ڕۆژە شتێکی وات بۆ باس کردم.

ماکوان: بەڵێ بەداخەوە، سیحری نیکرۆنۆمیکۆنم لێکراوە سیحرەکە لە کەرکوکە.

ئۆگە(ئوسامە): دەستی کرد بە قاقای پێکەنین ئەو سیحرە خەڵکی سەرجادە دەیکەن ئەوە کەی ساحیرن، ئەوانە سواڵکەرەکانی ئەمریکاو هیندستان و خەڵکی سەرەتایی دەیکەن، ئەوە هەر باوی نەماوە.

ماکوان: بەڵام تووشی سەرئێشەیەکی زۆری کردووم، زۆر جار توانام نامێنیت بەسەر ئەو ئازارەدا ناچار هاوار دەکەم.

ئۆگە (ئوسامە): ڕاستە ئەو کاریگەرییەی هەیە، بەڵام طەلیسمەکان پەیدا بکە ئاسانە.

ماکوان: من بەشێکی طەلیسمەکەم لایە ، بەشێکی تریشی لە شاری کەرکوکە چی ئاسانە؟

ئۆگە(ئوسامە): استغفرالله، خەیاڵم نەبوو بیرم بەلای ئەوەدا چوو کە بە سیحر بەتاڵی بکەمەوە.

ماکوان: کێشە نییە تۆزێك ترسم هەیە لە پۆلیسی ئەنتەرپول بگیرێم بە بۆنەی ئەو کێشەی ئیتالیا بۆی دروستکردووم.

ئۆگە(ئوسـامە): من دەتوانم قسـه بكەم لەگەڵ موخابەراتدا هاوڕێیەكم لەوێ كار دەكات بزانین ناوت ماوە لە پۆلیس؟

ماكوان: مەمنونیش دەبم.

لەبەرچاوی خۆم تەلەفونی كرد بۆ هاوڕێكەی و ناوی منی دایە لەگەڵ ڕۆژی لەدایك بوون هەموو زانیارییەكان.

ئوسامە (ئۆگە): بۆم شـەرح بكە سیحر لە ئیسلامدا چۆنەو كێ باسی كردووە؟ كتێبەكان چین لەسەری نووسراون؟

ماكوان: زۆر مەمنونی بووم و وتم دڵنیابە سەفەرەكەم كردو هاتمەوە بەجوانی بۆت شـەرح دەكەم، بەڵام ئێستا هەردووكمان كاتمان نییەو بە ڕۆژ و دوو ڕۆژ تەواو نابێت.

ڕازی بوو پاشـــان دوای دوو ڕۆژ وتی هیچ ناوت نەماوە، بەڵام من هەر بڕوام نەكرد.

پەیوەنـدیمكرد بە برایەكی خۆمـانەوە لە بەلجیكـا نوێنەری حیزبێـك بوو لە كوردستان، داوام لێكرد بەو پێیە پەیوەندی باشە لەگەڵ پەرلەمانی ئەوروپیدا هەواڵێكم بۆ بپرســێت، بزانێت ناوم ماوە لە ئەنتەرپول؟ ئەویش هەواڵی بۆ هێنامەوە هیچ ناوێكت نییە، دڵم ئاوی نەخواردەوە پەیوەندیم كرد بە بەشـی ئەنتەرپولی فڕۆكەخـانەكـانی كوردســـتـان لە هەولێرو ســـلێمانی، ئەوانیش دڵنیایان كردمەوە كە ناوی من نییە لەناو پۆلیسی ئەنتەرپولدا.

دڵخۆش بووم خێرا بلیتم کڕی بۆ مانگی داهاتوو بگەڕێمەوە بۆ کوردستان. لە نەرویجەوە سەرکەوم بۆ قەتەر و لەوێشەوە بۆ سلێمانی، بەڵام بەقەدەر هەموو ئەم جیهانە کارم بە حەزقیل و ڕاقی و حەنانە یە بۆ مانگێك زیاتر دەچێت، دیار نین. خێزانم و مناڵەکانم دەنارد بۆ ماڵی باوکی دەموت بەشکوم بە تەنها بم بێن، بەلام هەر دیار نەبوون. دەچوومە ناو دارستان و بەشاخدا هەڵدەگەڕام هەر نەبوو، جاری واهەبوو هاوارم دەکرد و دەموت کورە ئیشم پێتانە ڕەحمەتتان لێبێت دەرکەون. هیچ چارم نەما، پەیوەندیم کردەوە بەعەبە هەولێری و ئازیزی خێزانییەوە وتم بڕۆن بۆلای ڕوناك خان بزانن لە کوێ سیحرەکانیان کردووە.

ئەویش هەر وەڵام نەبوو. دوو ڕۆژی مابوو سەفەرەکەم بکەم لە بازاڕ بووم، دیاریم دەکڕی بۆگەڕانەوە، حەزقیل وتی بچین پیاسەیەك بکەین. دوو عەلاگەم بەدەستەوە بوو لەخۆشیدا دامناو لە ناو ئەو مۆڵەدا هاوارم کرد حەزە کورە حەزە ئەوە تۆ لەکوێیت؟

هەرچی خەڵك بوو لە مۆڵەدا تەماشایان دەکردم، وایان زانی شێت بووم قسە دەکەم و کەسیش دیار نییە، باوەشم کردۆتەوە کە حەزقیل لەباوەش بگرم و ئەملاولای ماچ بکەم، ئەوەندە ئیشم پێی بوو.

حەزقیل: ماکوان بیکە بەخاتری خوا، کۆنترۆڵی خۆت لە دەست مەدە ئەو خەڵکە تەماشای تۆ دەکات، خۆ کەس من نابینێت.

ماکوان: بەخوا ڕاست دەکەیت زوو دەستم دایەوە عەلاگەکان و باش بوو خێرا ڕۆیشتم، برادەرێکی کوردیش هات وتی کاك ماکوان ئەوە چی بووە؟

وتم کاکە ببورە ئەوە بلوتوســی تەلەفونکەم لە گوێدا بوو تووڕەیان کردم ئاگام لە خۆم نەما. سوپاس بۆ خوا زۆر باشم عەیبم نییە، چونکە زۆرجار کە خەڵکم دەبینی لەناو بازاڕ لە ڕێگای بلوتوسەوە بە تەلەفون قسەی دەکرد وام دەزانی لەگەڵ جن قسە دەکەن!

حەزقیل: تۆ دوو ڕۆژی کە سـەفەر دەکەیت؛ ئەو سـیحرەی لێتکراوە ئەوەتا لە قەبرسانێکی مەسیحییەکانە لە گەڕەکی ئەڵماس لە شاری کەرکوك.

ماکوان: ئەی حەزە گیان هاوکاری ترم ناکەن؟

حەزقیل: تۆ جارێ بڕۆ خوا گەورەیەو لەخزمەتی برای خۆماندا دەبین.

ماکوان: ئەی ڕەحمەت لەباوکت ئینجا لەدایکت لەوەشی بڕیویە ناوکت!

حەزقیل: ناوکی چی؟

ماکوان: حەزە گیان ئەوە مەسـەلەیەکی فۆلکلۆری کوردی لادێی عەشـایەرییە، تۆ وازی لێبینە خەتای من بوو ئەو سیستەمە لە مەخلوقی ئێوەدا نییە.

حەزقیل: ماکوان لە کوردستان ئاگات لە خۆت بێت، سەسیل لەکەمیندایە.

## کوردستان و دۆزینەوەی سیحرەکان

لەفڕۆکەخانەی نێودەوڵەتی ئۆسلۆ سەرکەوتم بەرەو فڕۆکەخانەی قەتەر ڕۆیشتم و لەوێیەوە بەرەو فڕۆکەخانەی نێودەوڵەتی سلێمانی دابەزیم. زۆر دەترسام لە قەتەر بگیرێم هیچ ڕووینەداو زۆر ئاسایی بوو، سوپاس بۆ خوا هیچ نەبوو، بەڵام گەیشتمە فڕۆکەخانەی سلێمانی هەرچی ئاسایش و پۆلیسەکان بوون تەماشایان دەکردم. کوڕێکی منداڵ کار هات بۆلام وتی جەنابت کاك ماکوانی؟

ماکوان: بەڵێ.

کوڕەکە: تۆ سکرتێری مەلا کرێکاری؟

ماکوان: دەستم کرد بە پێکەنین و وتم کاکە جارێ مامۆستا کرێکار سکرتاریەتی نییە و پاشان گریمان هەیبوو، بەڵام من هەرگیز نابمە سکرتێر نە بۆ ئەو نە بۆ هیچ کەسی تریش. من خاوەنی کەسایەتی خۆمم، بەڵام بەدڵنیایەوە مامۆستا کرێکار دەناسم و ئەویش باش من دەناسێت، ئەوەی زانیاری داوە بە جەنابت هەڵەیە و ئەگەر زانیاریت لە خۆم دەوێت ئەوە قسەیەکی درۆیە وهەڵبەستراوە.

کوڕەکە: باشە فەرموو بڕۆ.

دوای ئەوەی جانتاکانم وەرگرتەوە هاتمە دەرەوە و سـواری پاس بووم، دیسـان کوڕە گەنجەکە هـات بۆلام. وتی کاك ماکوان دەتوانم پاســپۆرتەکەت بەرم کۆپی بکەم، بەڵام زۆر بە ڕیزو بە حورمەتەوە منیش دامێ دابەزیمەوە هەموو ١٠ خولەکی نەبرد هاتەوە دایەوە دەستم، منیش بەئاسایی وەرمگرت و دەرچوومە دەرەوە لە فڕۆکەخانەو کەســوکار هەموو مقۆ مقۆی بوو ئەوە چییە؟

منیش وتم هیچ نەبوو زۆر ئاســایی بوو، هەرچەندە هەســتم کرد ئەو چەند خولەکە فەرمی نەبوو. تەنها شــتێك بوو وەك لە فڕۆکەخانە پێم بڵێن ها ماکوان ئێمە تۆ دەناســین و چاومان لەســەرتە، یان خۆبادانی مولحیدێکی فشـەکەر بووبێت لە فڕۆکەخانە کار بەدەسـت بووە و هەر ویسـتبێتی خۆی بابدات، چونکە من بەڕێوبەرەکەیان هـاوڕێم بوو، هەرچیـان بکردایە دوایی تەریق دەکرانەوە.

چوومەوە ســلێمانی و دوای چەند ڕۆژێك لەگەڵ پێشــڕەوی برام بیرم لەوە دەکردەوە کە بەیەکەوە بچین بۆ کەرکوك، بەڵام کـاتەکـان بەجۆرێـك بوون ڕێکنەدەکەوت، بەیـانییەکیـان دەچووم بۆ لای ئـارامی بلەی بەهـار بۆ صـابونکەران بۆ جگەر خواردن. لای ئارام نانم دەخوارد تەماشـام کرد یەکێك هاتە تەنیشتمەوە وتی: بەزاتی خوا هەڵناسی، بەس ئەملاولات ماچ دەکەم.

کە ســەرم بەرز کردەوە برایمی هـاوڕێمە یەکێکە لە هـاوڕێکانی منداڵیم، تابڵێیت نە خوێندەوارە. لە ژیانیدا دوو کتێبی نەخوێندۆتەوە، بەڵام یەکێکە لە کوڕە ئازاو قسە خۆشەکانی سەردەمی منالیم. دینداریشی تەواو نییە، بەڵام هەتا بڵێیت کوڕی چاك بوو.

کە تەماشـام کرد وتم ئاخر چۆن دەبێت ئەوە چەند سـاڵە تۆم نەدیوە، باشـە بەس هەڵدەستم ئەملاولات ماچ دەکەم.

کاکە نابێت ئەوە من ماچت دەکەم، هاتو ئەملاولای یەکترمان ماچ کردوو بە وەستا ئارامم وت چی دەخوات بۆی دابنێ.

برایم: بابە عەیبە تۆ میوانی منیت.

بە هەردووکمان ۱۱ شیش جگەرمان خوارد، ئەوەندە دەنگی بەرز بوو حەیای بردم، هاواری دەکرد شـازی ڕەفیقم هاتۆتەوە، وەسـتا ئارام شـیشـەکان جوان دابنێ، وای دەزانی ئارامی بلە بەهار من ناناسـێت. دوایی بۆم دەرکەوت کە ئارام لەبەر خاتری من شـیشـی بۆ لێئەدا، وەسـتا ئارامیش پارە لە من و میوانەکانم هەرگیز وەرناگرێت.

دوای ئەوەی نانمان خوارد بەیەکەوە چووینە چایخانەیەك بۆ چا خواردنەوە، باسـی یادگارییەکانی منداڵی بۆ دەکردم کە کاتی خۆی بەیەکەوە چەندە بەرسـیلەی ترێ مان لێدەکردەوە و شـەوان گۆرانی وتنی گەڕەك و چوون بۆ شـاخی گۆیژە بۆ چوالەو فەریکە نۆك و هێنان و خواردنی و باسـی ئەوەی دەکرد کە جارێکیان بەیەکەوە شـاخی گۆیژەمان سـوتاندو باسـی شـەڕەکانی دەکرد کە لە دارەلمحەلی وخانووە قوڕەکان.

هەندێك یادگاری خۆشـم بیرخسـتەوە منیش، ئەوەم بۆ باسـکرد کە بەمنداڵی پێمان دەوت بلە شەقاوە.

ماکوان: برایم بیرتە هیوایەتت ئەوە بوو چەقۆیەکی ئەبوئەڵقەت پێبێت و شەرواڵەکەت شۆڕ بێت و جلی کوردی شلو شێواوت لەبەر دەکرد، هەمیشە دەنکێ شــقارتەت لەدەمدا بوو، خۆزگەم بەوکاتانە. بیرتە کە دەردەکرایت بەمنت دەوت با لەماڵی ئێوە بخەوم ؟

برایم: هەزار خۆزگەم بەوکاتانە ئەزانی خەسرەو (من ناوم ماکوان نییە، بەڵکو - ناوم خەسرەو-ە) بۆچی تۆم خۆش دەوێت؟

ماکوان: نەوەڵڵا بلە گیان.

برایم: بیرتە بەیەکەوە چووین بۆ پیرمەنســور بۆلێدانی کەسـێك پارەی تۆی خواردبوو؟ کەچووین تەقەمان دا لە دەرگای ماڵەکە ژنەکەی هاتە دەرەوە وتت کوا فلان؟ کەهات منداڵەکەی نەخۆش بوو ژنەکەی دەگریا پیاوەکەش پارەی پێنەبوو، ٣٠٠ دیناری سویسری لابوو، لەجیاتی ئەوەی لێیوەرگریتەوە ٢٠٠ دیناری تریشــت دایە و وەعدت دابوو بە من کە بەیەکەوە بچین و شــەربکەین پارەکە وەرگریتەوە ٢٥ دیناریش بدەیەتە من، کەچی ٢٥ دینارەکەشت هەر دامێ وپارەکەشت وەرنەگرتەوە!

ماکوان: راســت دەکەیت، ئەی ئەزانی من بۆچی تۆم خۆش دەوێت برایم گیان؟

برایم: وەڵڵا بڵێم چی بڕوا ناکەم منت زۆر خۆش بوێت. بیرتە جارێکیان دەمانچەت لێدەرهێنام خەریك بوو بمکوژیت، بە پێکەنینەوە.

مـاکوان: نـا بلە گیـان، بیرتە چووم بۆ گەڕەکی مـاڵی بـاجی پـاکیز حەزم لە کچەکەی مامۆسـتا ئەنوەر بوو، کوڕی ئەو گەڕەکە هاتن شـەڕم پێبفرۆشـن. قسـەشـت نەبوو لەگەڵم هـاتی و دەرنەفیزێکت دامێ خۆشـت ئەبو ئەڵقەیەکت دەرهێناو پشتت نا بە پشتمەوە وتت خەسرەوە سور وەك خۆت سـوریان کە بە خوێن. تا خوا رەحمی پێکردنین کاك ئاواتی حاجی عەبدوڵا هات و من وتۆش دەرچووین یان لەشـەڕەکەی ئەیوب-دا کە لوتیم شـکاند ئەوانیش بۆمن دانیشـتن لێمبـدەنەوە، هەر تۆ فریـام کەوتی نەتهێشـت کەرامەتم بشکێنن.

ئەوان زۆر بوون من هەر خۆم بووم، هیچم لەبیر ناچێتەوە.

برایم: بەخوا خۆش بوو، جگەرەیەکی دەرهێنـا لە چیلکە دەچوو ئەوەنـدە باریك بوو. دایگرسینە بەیادی جاران.

ماکوان: من جگەرە ناکێشم بلە گیان

برایم: بەتەڵاقم ئەیکێشی جگەرە ناخەمەوە ناو پاکەتم.

ماکوان: رۆڵە خۆ گەزۆم نادەیتی جگەرەیە.

برایم: دەبیکێشە تازە تەڵاقم خواردووە.

ماکوان: برایم خەریکی چیت ئێستا کارت چییە؟

برایم: وەڵا ئەو تەکسییە شەق و شڕەم پێیە شەڕە تەقەیەکی پێدەکەم، بەڵام بەخوا قەیرانە خەسرەوی برام ئیش نییە.

ماکوان: چەند منداڵت هەیە بلە گیان؟

برایم: ٦ منداڵم هەیە.

ماکوان: خوا لێت نەسێنێت.

لەم قسانەدا بووین پێشڕەوی برام تەلەفونی کرد، وتی کاکە سەیارەکەی دڵشاد شکاوە ناتوانین بچین بۆ کەرکوك ئەمڕۆش، با- بیخەینە رۆژێکی تر. منیش پێم ناخۆش بوو، دەموچاوم دابەیەکدا و تەماشام کرد کاتژمێر ٩ ی بەیانی بوو.

برایم: ئەوە چیە سورە بۆ وا بێتاقەت بوویت؟

ماکوان: دەمەوێت بچم بۆ کەرکوك ئیشم هەیە ئەوە چەند ڕۆژە ڕێك ناکەویت.

برایم: جا ئەوەی بۆچییە من ئەتبەم، هەستە با بڕۆین.

ماکوان: ئاخر پێوویستم بە پێشڕەوی برام و یەك دوانێکی تر هەیە لەگەڵم بن.

برایم: دەی با بڕۆین ئەوانیش هەڵدەگرین.

ماکوان: ئاخر نازانم پێیان دەکرێت یان نا ئەمڕۆ، با تەلەفونیان بۆ بکەم. تەلەفونم کرد تەنها یەکێك لە ئامۆزاکانم بۆی دەکرا وتی دێم لەگەڵت. کەچی برایم وتی وەڵا من قسەم نییە لەگەڵیدا.

ماکوان: بەهەرحاڵ، سیلاحت هەیە؟

هێشتا قسەکە لەدەمم تەواو نەبوو

برایم: بەقوربانی ئەو خوایەت بم شەڕە؟ ئەی بۆ لە بەیانییەوە قسە ناکەیت بەخوا شەش مانگە شەڕم نەکردووە گیانم دەخورێت بۆ شەڕ، ئەرێ وەڵڵا کڵاشینکۆفم هەیە، دەمانچەم هەیە. چیت دەوێت پەیدای دەکەم خەمیشت نەبیت موعتەمیدی ئاسایشم.

ماکوان: نەوەڵا شەڕ نییە خەڵك ترساندنە.

برایم: بەخوا دووبە دوو دەڕۆین لایبە با زۆر نەبین دوای کۆنترۆڵ ناکرێن خۆم وخۆت بەیەکەوە دنیا وێران دەکەین، با کەس نەیەت باشە سورە گیان.

ماکوان: باشە بابچم تۆزیك پارە لای وەستا ئارام بهێنم بەیەکەوە دەڕۆین، چەکەکان بهێنەو بیخەرە ناو سەیارەکەو ئیتر دەڕۆین.

برایم: مەڕۆ پارەم پێیە خەمی پارەت نەبێت، چەك ئامادەیە لە سەر ڕێگاماندایە ماڵم لە گەڕەکی ڕاپەڕینە.

ماکوان: خۆم پێویستمە.

چووم بۆلای وەستا ئارام-ی بلەی بەهار ملیۆنێك دینارم لێوەرگرت، وەستا ئارام وتی پارە نەیەیەت بە بلە شەقاوە ئەیخوات و نییەتی بداتەوە، پارەی دوونەفەری منی لایە پارەی پێنییە بیدات، ئەوە لەبەرچاوی تۆدا فشە فش دەکات. دەنا فلسی پێنییە، سەیارەکەشی خەزووری بۆی کڕیوە. کە ئارام وای

وت زۆر بەزییم پێدا هاتەوە زانیم نەبوونی نەبێت هەرگیز بلە تەنازول ناکات، بەڵام دیارە کە نەبووە پارەی پێ نییە. گەڕامەوە بۆلای ٢٠٠ هەزار دینارم جیاکردەوە خێرا وتم تۆ مەسرەف بکە ئەوە بدە بە مەسرەف دوایی قسە دەکەینەوە.

هەرچی سوێندی خوارد نابێت و هەمووی عایدی خۆمە.

ماکوان: با ئەوەت پێبێت کە گەڕاینەوە حساب دەکەینەوە لێت وەردەگرمەوە جارێ تۆ مەسرەف بکە باشە، هەرچۆن بوو ڕازیم کرد دەشمزانی درۆ دەکات.

لەڕێگادا تەلەفونم کرد بۆ عەبە هەولێری ڕەفیقم و ئازیزی خێزانی، هەرچیان کردووە ناوی ساحیرەکەم بۆ بهێنن لای ڕوناك خان و ڕۆشنای کچی.

باش بوو ناوو ناونیشانەکەیان وەرگرتبوو بۆم، لەڕێگا هەموو شتێکم بۆ برایم باس کرد. چووینە مەطعەم عەبدوڵا لە کەرکوك لەوێ نانێکی ترمان خوارد دیسانەوە بۆم باس کرد کەدەچینە سەر ساحیرێك و خۆی ناوناوە بەشێخ و سحیری لە من کردووە هەستم پێکرد دەترسا، بەڵام هیچی نەووت.

گەیشتنە بەردەرگای ماڵی ساحیرە کە، چوومە ژوورەوە چەند وێنەی ئایەتی قورئانی هەڵواسی بوو هەندێکیانی سەروخوار هەڵواسی بوو یاخود بەلاری.

پلانیشمان وابوو کە تەلەفونی هەردووکمان کراوە بێت،کە من چوومە ژوورەوە تەلەفۆنەکە لە گیرفانمدا بێت و ئەویش لە سەرخەت بێت گوێی لێمان بێت، کە پێم وت وەرە ژوورەوە بە کڵاشینکۆفەکەوە دێیتە ژورەوە.

دەمانچەکەش بە خۆم بوو بردمە ژوورەوە بۆلای مامە شـێخەی سـاختەچی ساحیر.

کەسێك هات بەدەمەوە وتی فەرموو حەیاتم.

منیش دەسـتم کرد بە گیرفانمدا ٣٠ هەزار دینارم دایە، وتم دەبیت جەنابی شێخ ببینم و بچمە خزمەتی، بەڵام بەتەنها زۆر زەرورم. کچێکم خۆش دەوێت ئەو ئیشـەم بۆ بکات چی دەوێت ئەیدەمێ لە سـلێمانیشـەوە هاتووم ڕێگام دوورە.

وتی: بـاشـە چاوەڕێ بکە، دوو میوانی لایە بـا بڕۆن تۆ دەکەمە ژوورەوە. هەرچەندە لێرە جەنابی شـێخ سـەرە دادەنێ، ئەگەر لە دوورەوە نەهاتیتایە ئەوە ئیزنی ئەدایت.

ماکوان: ئەزانم خوا خێرتان بنووسیت پیاوەتی خۆتانە.

نزیکەی ٧ خولەك چاوەڕێم کرد، هـاتەوە وتی جەنـابی شـێخ دەڵێـت بـا بفەرموێت.

کەچووم پیاوێکی ناشیرین چاوی بە کل ڕشتبوو زل لە ورچی شەل دەچوو.

شێخ: فەرموو جەنابت چیت دەوێت؟

ماکوان: جەنابی شـێخ دەمەوێت دووبە دوو قسـە بکەین ئەو برادەرە با بڕوات. کەسـەکە خۆی چووە دەرەوە دووبارە وتم من ناوم ڕێبازە حاجی فەتاحم پێدەڵێن خەڵکی شـارۆچکەی بازیانم حەزم لە کچێکە ناوی پڕشـنگە،

باوكی نایدا بەمن دەڵێت تۆ پیاو كوژی، من كچ نایەم بە پیاو كوژ. جا قوربان چۆن دەتوانیت ئەو باوك و كچەم بۆ ڕازی بكەیت؟

شێخ: ڕێباز گیان دایكت ناوی چییە؟

ماكوان: دایكم ناوی حەلاوە.

شـێخ: ڕێبازی كوڕی حەلاو ئەو كارە زۆری تێدەچێت، بەڵام دڵنیابە ١٠٠٪ بۆت دەكەم.

ماكوان: یا شێخ گیان مەمنونت دەبم و چەند دەڵێیت دەیخەمە سەر چاوم.

شێخ:١٠ وەرەقە.

ماكوان: جا ١٠ وەرقە چییە تۆ بۆم بكە من دەفتەریكت ئەدەمێ پارە.

شێخ: بڕۆ پاش دووكاتژمێری تر وەرەوە بۆت دەكەم.

ماكوان: چیم بۆ دەكەیت، تۆ پەلە مەكە نەنكی ئەو كچەی من خۆشم دەوێت ،موشتەری خۆتە. ئەو منی ناردوە بۆلای تۆ، ئەزانی كێ دەڵێم؟

شێخ: نا نازانم

ماكوان: شەمسە خانی دایكی كاك سەڵاح.

شێخ: ئەها دەزانم ئەوە موشتەری هەمیشەی خۆمە.

ماكوان: ئەو كەسـەی كە ماڵی منی كاول كردووە كەسـێك بەناوی ماكوان لە نەرویج دەژی هاوڕێی سـەڵاحی كوڕی شـەمسـە خانە، وتیان تۆ سـیحرێكت لێكردووە سیحرەكە كاریگەری نەماوە (چونكە هەموو ساحیرێك ساختەچی و درۆزنە زوو شـتی بیر دەچێتەوە نەیزانی بوو چۆن سـیحر لەمن كراوە، بەڵام بیرم خستەوە نەی پرسی چۆنت زانیوە هەرچەندە ئەگەر بی پرسیایە وەڵامم بۆ ئەوەش دانابوو، دەموت كچەكەی سەڵاح وتویەتی سیحرمان لێكردووە)

شێخ: ئەو كوڕە ناوی چییە؟

ماكوان: ناوی ماكوان-ە.

شـێخ: ئەی دایكی ناوی چییە؟ (هەمیشـە سـاحیرەكان ناوی دایك دەپرسـن، چونكە سیحرەكان لەڕێگای ناوی دایكەوە دەكەن نەك باوك)

ماكوان: ماكوان-ی كوڕی ئامینە.

شێخ: ئەوە سیحری لێكراوە كاك ڕێباز.

ماكوان: دەزانم شێخ گیان (بۆیە باسی سیحرم لەگەڵدا كردووە دەمزانی ئاگای لە خۆی نەماوە لە تاو پارە تەمسیل كردنی لە بیر چۆتەوە، لەگەڵیشیدا خۆش خۆش دەیوت سـیحرم لێكردووە)، بەڵام من دەمەوێت راسـتیت پێبڵێم، لای شـێخ (...) لە سلێمانییەوە هاتووم ئەو فەرمووی تۆ سـیحرت لێكردووە، بەڵام كاریگەری نییە، ئەگەر سـیحرەكە بهێنیـت بەتـاڵی بكەیتەوە سـەرلەنوێ سـیحرێكی رەشـی لێبكەیت، چونكە ئەو سـیحرە كە شـێخ (...) بە تەمایە بیكایت كاریگەری نابێت تا ئەم سیحرەی تۆ بەتاڵ نەكرێتەوە.

جەنابت هەرچی بڵێیت دەیخەمە خزمەتان ئەگەر شـوێنی سـیحرەکەمان پێ بڵێیت.

شێخ: ئەوە تا لە قەبرستانێکی مەسیحیەکان لە گەڕەکی ئەڵماسە، بە ئێسقانی حەیوان سیحرەکەم لێکردووە.

ماکوان: یاشێخ ئەتوانیت بچیت بیهێنیت؟

شـــێخ: نا- من ناچم چونکە قەبرســـتانەکە گیراوە بە تەلبەند و جارێك کە چوومە ناوەوە لەڕێگای کڵیســایەکەوە چوومە ناوی، ئینجا ســیحرەکەم لەوێ کردووە ئەویش بۆ شەمسە خانم کرد لەبەر ئەوەی موشتەری خۆمە. بەلامەوە سەیرە ئەو شیخە دەڵێت ناتوانم سیحری لێبکەم کە سیحری تری لێکرابێت.

ماکوان: دەی ئاسـاییە جەنابی شـێخ ئەگەر بکرێت تۆ ناونیشـانی قەبرەکەمان پێبڵێ دەیهێنین.

شــێخ: قەبرەکان ئەوەندە زۆر نین لەدەرەوەی کڵێســاکەدایە، کە دەچیتە ناو حەوشـەی کڵێسـاکە لە پشـتەوە هەشـتەم قەبرە لای چەپەیەوە شـاردومەتەوە لە ناو کۆمەڵێك دەزوو ئیســقان و لە قوتویەکی بچوکدا دوعام تێدا نوســیوە، ئەگەر توانیتان بیهێنن.

کەشـوێنەکەی وت ئیتر زۆر گوێم پێنەدا، دەمانچەکەم زۆر بەسـادەی دەرهێنا وتم دەزانی من کێم؟

شێخ: خۆت ماکوان-ی؟

ماکوان: جنۆکەکانت پێیان وتی ؟

شێخ: ئەی چۆن دەمانچە لە من دەردەهێنیت؟ ئێستا پێیان بڵێم لێت بدەن و گۆج و ئیفلیجت بکەن. کلکە دەمانچەیەکم دا بەسەر شانیدا و دوو فیشەکم تەقاند لە ژوورەکەیدا کە بلە هاتە ژوورەوە ٣ ئافرەت و دوو پیاوی بە کڵاشینکۆفەکەی هێنایە ژوورەوە. دەمانچەکەم لەسەر کەللە سەری دانابوو. ئایەتەلکورسی و دوعام دەخوێند هیچی پێنەکرا

جادووبازەکە کە خۆی ناوناوە بە شێخ: پارەت دەوێت؟

ماکوان: نا - پارەی حەرامی خۆت بۆ خۆت نامانەوێت، بەڵام سوێند بەخوا درۆ بکەیت وەك سەگ ئەتتۆپینم. ٣٠ هەزارم داوە بە کابرایە تا هاتومەتە ژوورەوە، پێی بڵێ ئەو پارەیەمان بداتەوە، ئەوەیانم دەوێتەوە. دەچین بۆ ئەو جێگایە، بۆ زانیاریشت ئەو ٣ ئافرەتەی لێرەن هەرسێکیان لەشفرۆشن، ئەزانم بۆچی هاتوون و بۆچیش بەکاریان دەهێنیت یەکێکیش لەو پیاوانە دەیوثە.

خاڵە ڕاقی ئەی چپاند بەگوێمدا ئەو زانیاری ئەدامێ.

جادووبازەکە هەڵسا دەستم ماچ بکات، وتی ئەمە کۆیلەت چیت دەوێت بۆتی دەکەم بەس وازم لێبێنە، هەر دەیوت بە جێیان هێشتم هەموویان بەجێیان هێشتم.

ماکوان: ئەزانی بۆچی بە ئاسـایشـم نەوتوە ئەگەر بزانم درۆ دەکەیت خۆم ئەمجارە پێستت دەگوورم بەس ڕاستم لەگەڵ بکەیت ئەتبەخشم، بەمەرجێك واز لەم کارە قۆڕە بهێنیت، باشە؟

جادووباز: تۆ چی دەڵێیت بەقسە دەکەم.

پـارەی سـەیـارەو بەنزین و بلیتی فڕۆکە و هەموو مەسروفێکـت لێ وەردەگرمەوە ئەگەر درۆ بکەیت جادووبازی ساختەچی.

بەرەو قەبرسـتانی ئەڵماس کەوتینە ڕێ، کە گەیشـتین دووپاسـەوانی لێبوو ڕێگەیان لێگرتین نەیانهێشت بچینە ژوورەوە.

## قەبرسانی ئەڵماس و برایم و قەشە

لەدوای ئەوەی لای شێخی ساختەچی هاتینە دەرەوە، بە برایمی هاوڕێم وت باشە ئەوە ئاسایش و پۆلیس بۆ ئەمانە ناگرێت؟

برایم: بڕوا مەکە کێ حەقی هەیە بەسەر ئەمانەوە.

ماکوان: بەخوا ئەمانە لە تیرۆرو ئیرهاب خراپترن، ماڵ و سەروەت و سامانی خەڵکی دەخۆن، دەبوو وەزارەتی ناوخۆ ڕەچاوی ئەم جۆرە ماڵانەی بکردایەوە ئێرەش وەك ماڵی لەشفرۆش وایە.

برایم: جا کاکە تۆ لە کوردستان نیت لێرە ماڵی لەشفرۆش و دوکانی مەشروب زۆر بەڕێزنو حورمەتیان لێی دەگیریت کار ئاسانی دنیایان بۆ دەکرێت، بە تایبەت لە سلێمانیو هەولێر ئەو دوو شوێنە جێگای ڕێزی دەسەڵاتدارانن بە پێشکەوتنی دەزانن.

ماکوان: راستدەکەیت بۆیە حاڵمان زۆر جوانە ئەو خەڵکەشیان بەخۆیانەوە سەرگەردان کردووە. چووین بەرەو کڵێسای ئەڵماس- ئەوەی کە قەبری مەسیحییەکانی لێیە، کڵێسایەکی بچوکە بە پشتییەوە قەبرستانێکی تری لێیە نەمزانی هەر مەسیحیەکان خاوەنی ئەو قەبرسانەن یاخود مسوڵمانان. لەگەڵ برایم چوینە کڵێساکە وتمان سەردانی قەبرێك دەکەین هاوڕێمان بووە.

زانیان وانییە وتیان ببورن ئێمە لێرە دانراوین بۆ ئەوەی كەس نەچێتە ژوورەوە ناهێڵین بڕۆن، برایم دەستی كرد بە دەنگە دەنگ نەمهێشت زۆر لەسەری بڕوات باڵم گرتوو وتم بابڕۆین.

برایم: هیچ فیكرەیەكت لایە؟

ماكوان: نەبەخوا مێشكم هیچی تێدانییە، بەڵام نامەوێت تێكی بدەم جارێ. بڕۆ با بڕۆین كات درەنگە با بگەڕێینەوە بۆ سلێمانی.

برایم: كاكە ئیستا ئەچم هەردووكیان چەك دەكەم و ئەوەی ئەتەوێت دەری بێنە.

ماكوان: كاكە ئێرە شاری بێ حاكم نییە، منو تۆ چۆن دەستمان هەیەو خۆمان بە ئازا دەزانین ئەوانیش دەستیان هەیەو خاوەنی غیرەتن. خۆ ئەگەر بیریش لەو فیكرەی تۆ بكەمەوە لەبەر تۆ هەر نایكەم، خاوەنی ٦ منداڵی بڕۆ لێخوڕە بۆ سلێمانی. هەرچۆن بوو قەناعەتم پێكرد گەڕاینەوە بۆسلێمانی لەڕێگا وتم خۆت ئامادەكە بۆ بەیانی دەگەڕێینەوە، زوو وەرە بەشوێنمدا كەس نەزانێت، ئەوەی كە ڕوویداوە لای كەس باسی نەكەیت، بەڵكو خوای گەورە ئاسانی بكات.

بەیانی كاتژمێر شەشی بەیانی بوو لەدەرگای داو قەیماغ و نانی گەرمی هێنا بۆ ماڵەوە، دایكم وتی خێرە برایمی كۆنە ڕەفیقت هاتووە؟

خێرا هەڵسام و وتم برایم زوو وەرە، بەڵام نەمووت ببە بە كرێكاری خەباتە! لەدوای نوێژی بەیانی خەوم لێكەوتووە.

برایم: نـانی گەرم و قەیماغم بۆ هێنـاویـت و درەنگە نـانەكەت بخۆ بـا زوو بڕۆین.

دایكم وتی بۆ كوێ دەڕۆن؟

ماكوان: لە كەركوك كۆڕێكم هەیە كاكە برایم دەمبات.

دایكم: ئەی پێشڕەو لەگەڵت نایەت؟

ماكوان: نا پێویست ناكات، برایمم لەگەڵدایە.

برایم: ئامینە خان خەمت نەبێت منیش هەر وەك پێشڕەو وام.

دایكم: زیاتریشـی برایم گیان خوا تۆمان لێنەسـێنیت، بەس من لە منداڵیەوە تەماشـــاتان دەكەم كاتێك تۆو خەسرەو یەك بگرن دنیا وێران دەكەن، دڵم لێیداوە ئەڵێم بۆ شەڕ دەڕۆن.

ماكوان: بۆ خاتری خوا كوا تەمەنی شەڕمان ماوە.

برایم: دادە ئامین گیان خەمت نەبێت، خۆم ئەدەم بە كوشت لەسەری و كێ حەددی هەیە شەڕی لەگەڵ بكات.

دایكم چای لێناو چووە ئەودیو.

ماكوان: باشە خۆ من وتم با كەس نەزانێت.

برایم: دە چی بکەم ماڵت ئاوابێت چوزانم دایکت نەیزانیوە، خەسرەو وەڵاهی دایکت بەچاوی منداڵی تەماشـــامان دەکات وا دەزانێت شـــەڕە گەڕەکەکەی جارانە. ئەشزانێت هەردووکمان چۆنین.

ماکوان: دایك منداڵەکەی برســـی بێت دەزانێت چ جای ئەوەی کێشـــەی هەبێت.

بەرەو کەرکوك دەرچووین لە چەمچەماڵ برایم وتی چی بکەین؟

ماکوان: نازانم تا ئێستا هیچ لە مێشکمدا نییە.

لەڕاســـتیدا چاوەڕوانی راقی-م دەکرد دوێنی چەند دەقەیەك بینیم ئیتر دیار نەما.. نەمدەزانی چی بکەم.

برایم دەچین لەگەڵ قەشەی کڵیساکە قسە دەکەین زۆر بە مەعقولی هەموو شتەکانی پێدەڵێین، دڵنیام هاوکاریمان دەکات.

برایم: لەو بڕوایە دای هاوکاریمان بکات؟

ماکوان: خۆ دزی ناکەین حەتمەن پیاوێکی باشـە لە شـت حاڵی دەبێت، بەڵام با خۆمان تۆزێک تەئخیر بکەین، نەوەکو ئەو دوو پاســەوانە لەوێ بن، بەڵکو ڕۆیشتبن و کەسی تر لە جێگاکەیان بێت.

چوینە بەردەم کڵیســـاکە لە جەرەســـماندا دەرگا کرایەوە پیاوێك هات بەرەو ڕوومان وتی تفضل.

بەعەرەبی قســەم لەگەڵ کرد و عەرزیم کرد جەنابت لێرە کارت چییە و ناوی بەڕێزت چییە؟

لەوەلامدا وتی: ناوم لوئەی-یە جێگیری ئیدارەی ئەم کڵیسایەم.

ماکوان: بەڕێز لوئەی کێشــەیەکمان هەیە، ئەگەر هاوکاریمان بکەیت زۆر مەمنون دەبم.

لوئەی: لێرە تەنها نوێژو دوعا دەخوێنین، بڕۆن بۆ کڵیســـا گەورەکە لەوێ باوکمانی لێیە هاوکاریتان دەکات، ئەگەر خەوتان بینیوە یان مردووتان هەیە یاخود خۆتـان پاك دەكەنەوە و بەدوای خەلاص دەگەڕێن لەوێ دەکرێـت. هەندێك شتی تریشی وت باش لێی تێنەگەیشتم یەکەم جاربوو بیبیستم.

ماکوان: بەڕێز لوئەی کێشــەکەمان لێرەیە ئەویش لەم قەبرســـتانەی ئێوەدا ســاحیرێکی پیس ســیحری کردووە ئەگەر هاوکاریمان بکەیت چەند خولەکێ دەچین ســـیحرەکە دەهێنین و بەتاڵی دەکەینەوە زۆر ســـوپاســـی جەنابت دەکەین.

لوئەی: تورە بوو چۆن تورە بوونێك، دەنگی بەرز کردەوە بەسەرماندا خەریك بوو تەحمولم نەمێنیت، بەڵام سوپاس بۆ خوا دانم بەخۆمدا گرت.

برایم تەحمولی نەماو هاواریکرد بەســـەریدا، لەجیاتی ئەوەی دەســـتی بگرم کوڵام لە پێکەنیندا. بەدەنگی بەرز هاواری کردو پێی وت لایخۆی تۆ مەلای، کەی مەلا تورە دەبێت!

ماکوان: ئەی بەدبەخت برایم، مەلای چی ئەوە قەشەیە.

لوئەی: بە چی پێدەکەنیت؟

ماکوان: بە هاوڕێکەم وا دەزانێت تۆ مەلایت! دەڵێت مەلا چۆن تورە دەبێت.

لوئەی: کورە دەبڕۆن لە خۆتان و مەلاکانیشـــاتان بەم! کەی کاتی ڕابواردنە، دەی بڕۆن ملتان بشکێنن.

کەوای وت چاوم ڕەشی تیا نەما، ڕێك کێشام بەدەمیا خستم لەسەر پلیکانەی دەرگاکە، وەڵا برایمیش نەیهێشـــت خۆی ڕاپرســـکێنێت یەك دوولەقەی پیا کێشـــاو پشـــت ملی گرت و دەمانچەی لێدەرهێنا، دەســـتی پێبەرز کردەوە و هەرچی پێبوو هەمووی لێسەند.

برایم: (بە کوردی) گوێم لەدەنگت نەبێت.

لوئەی: بۆ خاتری خوا نەمکوژن (بەکوردی).

برایم سەیرێکی منی کرد بزەیەك گرتی و وتی شەق فێری کوردی کرد. چووینە کڵیسـاکەوە باش بەسـتییەوە گوریسـەکەشـی بە خۆی هێنا، پاشـان خسـتییە یەکێـك لە توالێتەکـانەوە و دەرگەکەمـان داخســـت و بـرایم پێـی وت گۆرەویەکانت داکەنە.

ماکوان: گۆرەوی ئەوت بۆچیە؟

برایم: ئەیخەمە دەمی نەکو هاوار بکات.

ماكوان: نا - ئاقڵە ئێمە هەمووی نیو كاتژمێرمان پێدەچێت دەنگە دەنگ ناكات، گۆڕەوی ناوێت، بۆ ئەوەی بیترسێنم وتم، ئەگەر دەنگی لێوە هات فیشەكێك بخەن بەدەمیدا.

برایم: بیكوژم خێرم دەگات.

ماكوان: كاتی ئەوە نییە وازی لێبێهنە با بڕۆین، بەڵام لوئەی گوێم لە دەنگت نەبێت باشە؟

لوئەی: باش.

بە ئیسراحەت چووینە ناو قەبرسانەكەوە بە برایم-م وت جوان حەرەسیات بگرە تا دەیدۆزمەوە. یەك دوو قەبر گەڕام نەبوو، لە سێیەمدا خەریك بووم لەپڕ گوێم لەدەنگە دەنگ بوو.

ماكوان: برایم بەخوا قوڕ كرا بەسەرماندا، دیارە ئەو سەگ بابە تەلەفونی كردووە.

برایم: نا مۆبایلی لای منە، ناتوانێت تەلەفون بكات.

ماكوان: ئەی ئەو قەرەباڵغیە چییە؟

برایم: نازانم

ماكوان: وەرە ئێرە هەڵكەنە هەر ئێسقانێكت دۆزییەوە خێرا هەڵیگرە ئەگەر لێرەنەبێت، گومانم لەو قەبرەی بەرانبەری هەیە. من دەچم بزانم چییە

دەمانچەکەم بدەرێ، ئەگەر منیش گیرام توانات بوو ڕاکە تواناشت نەبوو خۆ نامانکوژن دەگیرێین، دوایی ئازادمان دەکەن.

برایم: بڕۆ بێخەم بە·بزانە چییان دەوێت.

چووم دەرگام کردەوە جەنازەیەکیان پێبوو هێنابوویان بۆ ئەوەی بینێژن، پرسیم چییە؟ وایان زانی من قەشەم، وتیان باوکە ئەو مردووەمان لێ مردووە وەرە نزاکان بخوێنە، بەڵکو عیسا-ی مەسیح لێیخۆش بێت. عەرزمکردن من پاسەوانم لێرە، ئێستا جەنابی قەشەکە دەگەڕێتەوە بفەرموون جەنازەکەتان بهێننە ژوورەوە.

هاتنە ژوورەوە پێش ئەوان چووم مەوزوعەکەم بۆ برایم باسکرد، وتم جەنازەیان پێیە هیچ نییە بەس بڕۆ تەماشایەکی قەشەکە بکە، نەوەکو هاوار بکات، پێمان بزانن شەق بەشەق دەڵێت جێگامان بکەرەوە. بڕۆ تورە بە لێی و بە تەلەفونەکەی تەلەفونێکیش بۆ من بکە، بزانم ژمارەکەی چەندە، هەر وام وت خێرا بە ژمارەکەی قەشەکە تەلەفونی بۆ کردم و چووە ژوورەوە بۆلای.

ئەو خانەوادەیە کە مردووەکەیان پێبوو دەگریان و سەرقاڵی مردووەکەیان بوون، لەو قەبرستانەدا چەند قەبرێکی ئامادەکراوی لێبوو بەدوای قەبرێکی باشی رووکندا دەگەڕان! دیاربوو ڕێك نەدەکەوتن لەکوێدا بینێژن، منیش دەستم کرد بەهەڵکەندی جێگاکەی تر و سیحرەکەم دۆزییەوە لەخۆشیدا هاوارم کرد پێدەکەنیم کە دۆزیمەوە هەموویان تەماشای منیان کرد، وتم بۆ خۆتان و مردووەکەشتان هیلاك دەکەن دە لە جێگایەکدا بینێژن با ئارام

بگرێت. هاوارم کرد برایم ئەوە چیت لێهات؟ هاتەوە بۆلام وتی: خەمت نەبێت ئەوەندە ترساوە میزی بە خۆیدا کردووە.

ماکوان: بابڕۆین ژمارەکەی من بکوژێنەرەوە لە مۆبایلەکەیدا و بمدەرێ، چووین بۆلای خەڵکەکە بە برایم-م وت سەرخۆشییەکیان لێدەکەین و دەڕۆین زۆر ئاسایی بە.

کەچی هەر چووینە پێشەوە برایم دەڵێت (رحم الله لمن أعاده ئەلفاتیحه)!

من کولام لەپێکەنینا هەرچۆن بوو دانم بەخۆمدا گرت، بەڵام هەرچی مەسیحی بوو بەقەبرەکانیشەوە تەماشایان دەکردین، وتم ببورن بەڕێزان برایم نازانێ لەگەڵ خۆمدا پاسەوانە، ئەوە تەلەفونی جەنابی قەشە لوئەیە داویەتی بەمن نیوکاتژمێری تر دەگەڕیتەوە لاتان، با لای یەکێکتان بێت تا دێتەوە، ئێمە دەبێت بڕۆین دەوامامان تەواو بووە. لە بەغداد دەوامامان هەیە لە وەزارەتی داخلی، دەبێت فریای سەیارە بکەین بۆ بەغداد دەڕۆین.

ماڵئاوایمان لەهاوڕێ مەسیحییەکانمان کردو لە قەرەباڵغی ناو کەرکوك دەرچووین هاتینە سەر جادەی چەمچەماڵ، تەلەفونم دەکرد بۆ تەلەفونەکەی لوئەی چوار جار کەس هەڵینەگرت، سەری پێنجەم جار هەڵگیرا، چونکە تەلەفونەکەی خۆم وا لێکردبوو کە ژمارەم نیشان نەدات، باش بوو هەڵگیراو وتم بڕۆن قەشە خۆی پیس کردووە لە تەوالێتەکەدایە با تەلقینی مردوەکەتان بۆ بدات، بیکەنەوە با نەمرێت لە برساندا، تەلەفونم داخستەوە.

دوای نیو کاتژمێر تەلەفونێکی ترم کرد لوئەی بوو.

ماکوان: بەڕێز لوئەی انا ماکوان - مع الف ســـلامة. هاواری دەکرد بە کوردی جنێوی ئەدا ویســـتم دایخمەوە برایم لێی وەرگرتم وتی ئەوە بۆوا قســـە دەکەیت بگەڕێمەوە بۆت!؟

## من و حەزقیل و پاصێك جنۆكە

بەڕێگاوە بووین گەیشـــتینە لای بازیان برایم وتی تو خوا دڵم مەشـــكێنە با یەكەوە گۆرانییەكەی مامڵێ بڵێین بیری منداڵیم دەكەوێتەوە.

ماكوان: كورە برایم تازە كوا تاقەتی ئەو شـتانەم ماوە، سـەرو یشـم هەموو سپیی بووە.

برایم: تو خوای گەورە سـورەی برام وامەڵێ ئێسـتاش ماشـاء الله زۆر گەنجو قۆزیت. بیرتە شـــەوەكە گۆرانیت دەوت لە بەردەم دوكانەكانی كاك عومەر مۆریاسی لە سەر ۳۰ مەترییەكە، هەرچی گەڕەك بوو هاتنە دەرەوە ڕەحمەتی باوكیشـــت هات لەترسـا ڕات كرد، وتی ڕامەكە پێنج دیناری دایتێ و وتی گۆرانی بڵێ! حەزی لەو گۆرانییە بوو ئەوە بڵێ.

ماكوان: ئەزانی بۆچی ڕامكرد برایم؟

برایم: نەوەڵا نازانم!

ئەو ئێوارەیە پەنجەرەی ماڵی شـــاهۆ و حەمەی پورە كافیە-م شـــكاندبوو، شـكاتم لێكرابوو باوكیشـم بەڕەحمەت بێت زۆر حەزی بەدەنگی مامڵێ بوو، كەوتی گۆرانی بڵێ واتای ئەوە بوو كە لێم خۆش بووە. منیش دەستم كرد بەو گۆرانییەی كە ئەو حەزی لێدەكرد بەناوی ئەو (گوڵەی مەشهوری گشت عالەم

بوو کوا یادی بەخێر) بۆ ئەوەی لێیان نەخۆم، کردمان بە حەفلە، شـــەوێکی خۆش بوو، بەڵام کاک فوئاد سەرخۆش بوو هات تێکی دا.

برایم: توخوا تا دەگەینەوە ســـلێمانی تۆزێك بەیەکەوە دەڵێین، باوکتم زۆر خۆش دەویســـت، ئەویش لە ڕەفیقەکانی تۆ بیرمە بەس من و دلاوەری خۆش دەویست وابوو؟

ماکوان: ڕاســـت دەکەیت، ئەزانی ئێســـتاش دلاوەر هەر وەك جاران دێت بۆ لای دایکم و منیش هەرچی بێمەوە بۆ کوردستان، دێت بۆلام.

برایم: دەســتی کرد بە گۆرانی وتن بەدەنگێکی خۆش و منیش وەڵامم داوە تا سلێمانی.

گەیشـــتینەوە ســـلێمانی و کاتی نوێژی شـــێوان بوو چووم بۆ مزگەوتی عەلی کەمال و نوێژمان کردو گەڕامەوە ماڵەوە، ئیتر برایمیش بەجێی هێشتم ڕۆشتم بۆ مەخزەنەکەم لە ســـلێمانی، هەرچی کتێبم چاپ دەکرێت دەچێتەوە ئەو مەخزەنە. لەوێ تەماشـــای ئەو کتێب و گۆڤارانەم دەکرد کە ماونەتەوە، لەپڕ حەزقیل پەیدا بوو.

ماکوان: ئەوە لەکوێیت پاییزە برا؟ خۆشحاڵم لە کوردستان ئەتبینم ئەوە ڕاقی چی بەسەر هات؟

هیچ وەڵامی نەدامەوە، هەر وەك منداڵێك پێم بڵێت قسەت لەگەڵ ناکەم.

ماکوان: ئەوە چییە حەزە گیان؟ نازدەکەیت بەســـەرمدا، وەرە پێم بڵێ ئەو سیحرە چۆن بەتاڵ بکەمەوە؟

حەزقیل: ماکوان زۆر تورەم لێت!

ماکوان: بۆ حەزە گیان؟

حەزقیل: ئەوە بۆ لەم کتێبەی کە چاپت کردووە دەڵێیت حەزقیل مردووە؟

ماکوان: حەزەگیان تۆش کتێب دەخوێنیتەوە؟ تەمەن درێژ بیت یاخوا، بەڵام ئەو هیچو پوچە مەبەســـتم ســـەســـیل-ە وتی حەزقیل مردووە، خۆت باش دەزانیت منیش لە بەشــی یەکەمدا باســی جەنابتم کرد کە مردوویت، ئەزانی ئەو خەڵکە چەندی پێناخۆش بوو، دوایی دڵنیابە زیندوو دەبیتەوە دەتکەمە پاڵەوانی ئەم چیرۆکە، وەعد بێت منداڵ بەم ناوە ناوبنێن ڕازیت؟

حەزقیل: بەخوا من تۆم زۆر خۆش دەوێت ماکوان.

ماکوان: تەنها من یان هەموو مرۆڤەکان؟

حەزقیل: بەخوای پەروەردگار ئەوەی چاکە خواز بێت لە ناو ئێوەدا ئێمەی جنۆکەی موسوڵمان خۆشمان دەوێت، کاکە ئێمەش براتانین.

ماکوان: بەخوا ڕۆحی حەزە گیان، ئەرێ ئەو ســـیحرە چۆن بەتاڵ بکەمەوە، ئەوە هێناومەتەوە لە ناو ئەو پەڕۆدایە، بیهێنم؟

حەزقیل: هاوڕێیکەم هێناوە بۆ ئەوەی پێت بڵێ ناوی (نەســـناس)ە ئەو لێی دەزانێت.

نەسناس: السلام علیکم، ماکوان چۆنی؟

ماکوان: کە ئاوڕمداوە تەماشـا دەکەم کوڕێکی گەنجی زۆر باڵا بەرز بە جل و بەرگی زۆر جوان و پۆشـتەو پەرداخ شـێوەی جلەکانی لە هیندی دەچوو. وتم خوا ئیمانت بداتێ نەسناس گیان وعلیکم السلام.

نەسـناس: ماکوان ئەو ئێسـقانانە ئێسـقانی کەمتیارە بیشـکێنە تا جوان ورد دەبێت، ئینجا لەگەڵ خۆڵدا با تێکەڵ بێت زیاد لەچەند جارێك سـوڕەتی فاتیحە بخوێنە و دوایی ئایەتەلکورسی بەسەردا بخوێنە.

ماکوان: چەند جار؟ دیاری بکە.

نەسناس: لە ١٠ جار کەمتر نەبێت زیاتریش بێت باشترە، پاشان ٣ جار سوڕەتی قل هو الله احد و پاشان ئایەتەکانی سیحری بەسەردا بخوێنە.

ماکوان: ئایەتەکانی سیحر کامانەن؟

نەسناس: من لەبەرم نییە.

تەماشای حەزقیلم کرد وتم تۆ دەیزانیت؟

حەزقیل: نەوەڵڵا.

ماکوان: ئەی چارە؟

نەسناس: ئەچم زولاب- بانگ دەکەم بزانم ئەو نایزانێت.

ماکوان: دەبڕۆ چی دەکەیت لێرە ڕاکە بەسـاقت بم، دەی ڕەحمەت لە خۆت و دایك وباوکت. لەپڕ نەمان. بەردەوام بووم لە تەماشـا کردن و چاککردنی

کتێبەکانم، گیزە گیزێك هات زانیم ئەوانن حەزقیل و ڕاقی و حەنانە فێر بووبوون وەك ئاگادارییەك گیزە گیزێکی وەك ڕەشەبا ئاسایان دەکردو خۆیان نیشان ئەدام بۆ ئەوەی دانەچڵەکێم و نەترسم.

ئەوەندەم زانی پاصێك جنۆکە هاتن وپەیدابوون لە مەخزەنەکەمدا لەوانەی دەمناسین ڕاقی، حەزقیل، حەنانە و نەسناس بوون، ئینجا زولات و سعالات و میهلە ونەشەق.

تعارڕوفمان کرد و ئەوانەی ئافرەت بوون میهلە و حەنانە و نەشەق بوون، باقی پیاو بوون خۆشحاڵی خۆمم دەربڕی و نەسناس ڕووی کردە زولات وتی ئایەتی سحر کامانەن کە لە قوڕئاندا دابەزیوە، با ئەو سیحرەی بەتاڵ بکاتەوە.

دەستی کرد بە خوێندنەوەی منیش ئەمنوسی لەوانە سورەتی الاعراف:

﴿۞وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنۡ أَلۡقِ عَصَاكَۖ فَإِذَا هِيَ تَلۡقَفُ مَا يَأۡفِكُونَ ١١٧ فَوَقَعَ ٱلۡحَقُّ وَبَطَلَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١١٨ فَغُلِبُواْ هُنَالِكَ وَٱنقَلَبُواْ صَٰغِرِينَ ١١٩ وَأُلۡقِيَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ ١٢٠﴾ [الأعراف]

واتە: ئینجا وەحیمان نارد بۆ موسا کە گۆچانەکەی فڕێ بدات (هەر کە فڕێی دا) هەرچی فڕو فێڵیان هەبوو هەرهەمووی قوت دا١١٧.واتە: ئینجا وەحیان چەسپاو هەرچییەکیان کردبوو بەتاڵ بووەوە١١٨.واتە: (فیرعەون و دارودەستەکەی) ئیتر شکستیان خواردو سەرکزو ڕیسوا بوون١١٩. واتە: (ئیتر دەستبەجێ) هەموو جادووگەران بە سوجدەدا چوون (کاتێك کە دڵنیا بوون کە ئەوە موعجیزەیەو لە دەسەڵاتی ئادەمیزاد دا نییە)١٢٠.

سورەتی یونس:

﴿وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ ٱئۡتُونِي بِكُلِّ سَٰحِرٍ عَلِيمٖ ٧٩ فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ قَالَ لَهُم مُّوسَىٰٓ
أَلۡقُواْ مَآ أَنتُم مُّلۡقُونَ ٨٠ فَلَمَّآ أَلۡقَوۡاْ قَالَ مُوسَىٰ مَا جِئۡتُم بِهِ ٱلسِّحۡرُۖ إِنَّ ٱللَّهَ
سَيُبۡطِلُهُۥٓ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُصۡلِحُ عَمَلَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ٨١ وَيُحِقُّ ٱللَّهُ ٱلۡحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦ
وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُجۡرِمُونَ ٨٢ فَمَآ ءَامَنَ لِمُوسَىٰٓ إِلَّا ذُرِّيَّةٞ مِّن قَوۡمِهِۦ عَلَىٰ خَوۡفٖ مِّن
فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِمۡ أَن يَفۡتِنَهُمۡۚ وَإِنَّ فِرۡعَوۡنَ لَعَالٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَإِنَّهُۥ لَمِنَ
ٱلۡمُسۡرِفِينَ ٨٣ وَقَالَ مُوسَىٰ يَٰقَوۡمِ إِن كُنتُمۡ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ فَعَلَيۡهِ تَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم
مُّسۡلِمِينَ ٨٤ فَقَالُواْ عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلۡنَا رَبَّنَا لَا تَجۡعَلۡنَا فِتۡنَةٗ لِّلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ٨٥ وَنَجِّنَا
بِرَحۡمَتِكَ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٨٦ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰ وَأَخِيهِ أَن تَبَوَّءَا لِقَوۡمِكُمَا
بِمِصۡرَ بُيُوتٗا وَٱجۡعَلُواْ بُيُوتَكُمۡ قِبۡلَةٗ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَۗ وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٨٧ وَقَالَ
مُوسَىٰ رَبَّنَآ إِنَّكَ ءَاتَيۡتَ فِرۡعَوۡنَ وَمَلَأَهُۥ زِينَةٗ وَأَمۡوَٰلٗا فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا رَبَّنَا
لِيُضِلُّواْ عَن سَبِيلِكَۖ رَبَّنَا ٱطۡمِسۡ عَلَىٰٓ أَمۡوَٰلِهِمۡ وَٱشۡدُدۡ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ فَلَا يُؤۡمِنُواْ
حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ ٨٨﴾ [یونس]

واتە: (ئینجا فیرعەون فەرمانیدا) وتی: ئادەی هەرچی جادووگەری زاناو شارەزا هەیە بیهێننو بۆم کۆبکەنەوە٧٩.واتە: جا کاتێك جادووگەران هاتن و (بڕیار درا جادووگەری خۆیان بنوێنن و موعجیزەی موسا بەتاڵ بکەنەوە٠ موسا پێی وتن: دەی چیتان هەیە فڕێی بدەن و بیخەنە ڕوو٨٠! واتە: ئەوسا (جادووگەران، جادووی خۆیان نواند) موسا وتی: هەرچی

کردووتانە و نیشانی ئەو خەڵکەتان داوە جادووە و هیچی تر، بێگومان خوا دوای تاوێکی تر پووچی دەکاتەوە، بەڕاستی خوا کردەوەی ئەوانەی کە تۆوی خراپە دەچێنن چاك و سەرکەوتوو ناکات﴿٨١﴾.واتە: بەڵکو خوا حەق و ڕاستی دەچەسپێنێت بە فەرمان و ویستەکانی خۆی ئەگەرچی تاوانکارو تاوانباران پێیان ناخۆش بێت﴿٨٢﴾. واتە: سەرئەنجام کەس باوەڕی بە موسا نەهێنا جگە لە چەند لاوێك (چونکە زۆربەی خەڵکەکە) دەترسان فیرعەون و دارودەستەکەی کە بەڵایان بەسەر بهێنن و تووشی ئازارو ئەشکەنجەیان بکەن، بەڕاستی فیرعەون خۆی بە گەورەو بڵند دەزانی لە زەویدا، بەڕاستی ئەو لە سنوور ترازاوان بوو﴿٨٣﴾. واتە: موساش بە قەومەکەی وت: ئەی قەوم و عەشیرەتم، ئەگەر ئێوە بەڕاستی باوەڕتان بەخوا هێناوە، ئەوە ئیتر هەر پشت بەو ببەستن ئەگەر مسوڵمان و ملکەچن﴿٨٤﴾ واتە: ئەوسا (ئیمانداران) وتیان: ئێمە ئیتر هەر پشتمان بە خوا بەستووە، پەروەردگارا مەمانگێرە بە هۆکاری سەرگەردانی بۆ قەومی ستەمکاران (کە هەم ئێمە ئازار بدەن و هەم خۆشیان گوناهبار بن و دوور بکەونەوە لە ئیمان)﴿٨٥﴾. واتە: هەروەها بە ڕەحمەت و میهرەبانی خۆت (دەرووی خێرمان لێ بکەرەوە) ڕزگارمان بکە لەدەست هۆزو دەستەی بێ باوەڕان﴿٨٦﴾. واتە: ئێمە سرووشمان نارد بۆ موسا -علیه السلام- و براکەی تا لە میسردا چەند ژوورێك ئامادە بکەن و ئەم ژوورانەش بکەنە شوێنی خواپەرستی و ڕووی تێبکەن و پێمان ووتن نوێژەکانتان بەچاکی ئەنجام بدەن، مژدەش بدە بە ئیمانداران﴿٨٧﴾. (جا کاتێك ستەمی فیرعەون لە سنوور دەرچوو) واتە: موسا نزای کردو وتی: پەروەردگارا، بەڕاستی تۆ لە ژیانی دنیادا نازو نیعمەت و ماڵ و حاڵ وجێگە و ڕێگەی ڕازاوەت بەخشیوە بە فیرعەون دارودەستەی، پەروەردگارا، ئەو شتانە بۆتە هۆی ئەوەی کە (خەڵکی) لە ڕێبازو بەرنامەی تۆ وێڵ و گومڕا بن، پەروەردگارا: ماڵ و سامانیان تەفرو توونا بکەو کوێری بکەرەوە، دڵیان

بگوشە(تا هەست بە خۆشی نەكەن) ئەمانە باوەڕ ناهێنن هەتا سزاو ئازاری بە ئێش نەبینن(٨٨).

سورەتی طە:

﴿قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ إِمَّآ أَن تُلۡقِيَ وَإِمَّآ أَن نَّكُونَ أَوَّلَ مَنۡ أَلۡقَىٰ(٦٥) قَالَ بَلۡ أَلۡقُواْۖ فَإِذَا
حِبَالُهُمۡ وَعِصِيُّهُمۡ يُخَيَّلُ إِلَيۡهِ مِن سِحۡرِهِمۡ أَنَّهَا تَسۡعَىٰ(٦٦) فَأَوۡجَسَ فِي نَفۡسِهِۦ
خِيفَةٗ مُّوسَىٰ(٦٧) قُلۡنَا لَا تَخَفۡ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡأَعۡلَىٰ(٦٨) وَأَلۡقِ مَا فِي يَمِينِكَ تَلۡقَفۡ مَا
صَنَعُوٓاْۖ إِنَّمَا صَنَعُواْ كَيۡدُ سَٰحِرٖۖ وَلَا يُفۡلِحُ ٱلسَّاحِرُ حَيۡثُ أَتَىٰ(٦٩) فَأُلۡقِيَ ٱلسَّحَرَةُ
سُجَّدٗا قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ هَٰرُونَ وَمُوسَىٰ(٧٠) قَالَ ءَامَنتُمۡ لَهُۥ قَبۡلَ أَنۡ ءَاذَنَ لَكُمۡۖ
إِنَّهُۥ لَكَبِيرُكُمُ ٱلَّذِي عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحۡرَۖ فَلَأُقَطِّعَنَّ أَيۡدِيَكُمۡ وَأَرۡجُلَكُم مِّنۡ
خِلَٰفٖ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمۡ فِي جُذُوعِ ٱلنَّخۡلِ وَلَتَعۡلَمُنَّ أَيُّنَآ أَشَدُّ عَذَابٗا وَأَبۡقَىٰ(٧١) قَالُواْ
لَن نُّؤۡثِرَكَ عَلَىٰ مَا جَآءَنَا مِنَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلَّذِي فَطَرَنَاۖ فَٱقۡضِ مَآ أَنتَ قَاضٍۖ إِنَّمَا
تَقۡضِي هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَآ(٧٢) إِنَّآ ءَامَنَّا بِرَبِّنَا لِيَغۡفِرَ لَنَا خَطَٰيَٰنَا وَمَآ أَكۡرَهۡتَنَا
عَلَيۡهِ مِنَ ٱلسِّحۡرِۗ وَٱللَّهُ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰٓ(٧٣) إِنَّهُۥ مَن يَأۡتِ رَبَّهُۥ مُجۡرِمٗا فَإِنَّ لَهُۥ جَهَنَّمَ
لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحۡيَىٰ(٧٤) وَمَن يَأۡتِهِۦ مُؤۡمِنٗا قَدۡ عَمِلَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ
ٱلدَّرَجَٰتُ ٱلۡعُلَىٰ(٧٥) جَنَّٰتُ عَدۡنٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ وَذَٰلِكَ
جَزَآءُ مَن تَزَكَّىٰ(٧٦)﴾ [طه]

واتە: ئەوسا جادووگەران وتیان: ئەی موسا؛ یان تۆ دەست بەكار بەو (دار عەسای خۆت) فڕێ بدە، یان ئێمە سەرەتا دەست پێ دەكەین و فڕێی دەدەین(٦٥)؟ واتە: موسا وتی: نەخێر؛ ئێوە لە پێشدا دەست پێ بكەن، جا

هەر کە دەستیان پێ کرد پەت و گوریس و دارو چێوەکانیان وا دەهێنرایە بەرچاوی بەهۆی جادوویانەوە، بێگومان وەك مار بەخێرایی دەڕوات﴿٦٦﴾. واتە: ئەوسا موسا هەستی کرد بە ترسێك لەدڵ و دەروونیدا﴿٦٧﴾ واتە: (ئێمەش نیگامان بۆ کرد) وتمان: مەترسە و دلنیا بە چونکە بەڕاستی هەر تۆ بەرزو سەرکەوتوویت﴿٦٨﴾. واتە: ئەوەش لە دەستی ڕاستتدایە (واتە عەساکەت) فڕێ بدە، هەرچی ئەوانە کردوویانە دەیماشێتەوە و قوتی دەدات، چونکە بێگومان ئەوەی کردوویانە تەنها فێڵ و تەڵەکەی جادووگەرە، جادووگەریش بۆ هەرکوێ بچێت و هەرچی بکات سەرکەوتوو نابێت﴿٦٩﴾. واتە: ئەوسا ئیتر هەموو جادووگەران، خران بەڕوودا و سوجدەیان برد بۆ خوا (ڕاستییان بۆ دەرکەوت) وتیان: ئیتر ئێمە باوەڕێکی بەتینمان هێناوە بە پەروەردگاری هاروون و موسا﴿٧٠﴾.واتە: فیرعەون وتی: ئایا ئێوە هەر ئاوا باوەڕ دەهێنن بەر لەوەی ڕازی بم؟ بەڕاستی دیارە موسا گەورەو مامۆستاتانەو هەر ئەو فێری جادووگەری کردوون، شەرت بێت دەست و قاچتان بە پێچەوانەوە بقرتێنم و هەڵتانواسم بە قەدی دارخورمادا ئەوسا چاك دەزانن کە کاممان (من، یان خوای موسا) سزامان توندو تیژو بەردەوامە٧١! واتە: (جادووگەرانی تاوێك لەمەوبەر، بەباوەڕێکی بەتینەوە)وتیان: هەرگیز تازە باوی تۆ نادەین بەسەر ئەم بەڵگەو نیشانانەدا کە بۆمان هاتووە، سوێند بەو کەسەی کە دروستی کردووین، چیت لەدەست دێت ئەنجامی بدە و درێغی مەکە، بەڕاستی تۆ هەر دەتوانیت ژیانی ئەم دونیایەمان لێ زەوت بکەیت﴿٧٢﴾. واتە: ئێمە ئیتر بەڕاستی باوەڕمان هێناوە بە پەروەردگارمان، تا لە گوناهەکانمان خۆش ببێت و لەو جادووگەرییەش کە بە زۆر پێت کردین، هەمیشە خوای گەورە لە هەموو کەس چاکترە و لە هەموو کەس پایەدارتر و بەردەوامترە﴿٧٣﴾. واتە: ئێمە دڵنیاین لەوەی، کە ئەوەی بە تاوان و گوناهەوە بگەڕێتەوە بۆلای

پەروەردگاری، بێگومان ئەوە دۆزەخ بۆی ئامادەیە کە نە دەمرێت تیایدا (تا لە سزا ڕزگاری ببێت) نە دەژی (بەئارامی و ئاسودەیی)﴿٧٤﴾. ئەو کەسەش بە ئیمانەوە بگەڕێتەوە بۆلای و بەڕاستی کردەوە چاکەکانی ئەنجام دابێت، ئەوە بۆ ئەوانە پلەو پایەی بەرزو بڵند ئامادەیە﴿٧٥﴾. واتە: بەهەشتی -عەدنە- کە باخەکانی چڕ و پرە دەچنە ناوی، چەندەها ڕووبار بەژێر درەختەکانیدا دەڕوات، هاوڕێ لەگەڵ ژیانی هەمیشەیی و نەبڕاوەدا، ئەوەش پاداشتی کەسێکە دڵ و دەروون و ڕەوشتی خۆی خاوێن کردبێت.
زولات: ماکوان ئەم ڕوقیە بخوێنە زۆر گرنگە، چونکە جوبریل سـەلامی خوای لێبێت، بۆ پێغەمبەری خوێندوە. ئەگەر ئازارت بوو یان هەستت کرد سیحرت لێکراوە بۆ هەرجارێکی تریش بەتاڵ دەبێتەوە لەگەڵ ئایەتەکاندا﴿٧٦﴾.

بسمِ اللّهِ أرقيكَ، من كلِّ شيءٍ يؤذيكَ، من شرِّ كلِّ نفسٍ وعينٍ حاسده، بِسمِ اللّهِ أرقيكَ، واللّهُ يشفيكَ

یاخود پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە روقیەی کردووە بۆ کەسـوکارەکەی خۆی ئەمەی خوێندوە، تۆش بیخوێنە ئەوە سیحرەکە بسوتێنە با کۆتایی بێت و بڵێ

اللهمَّ ربَّ الناسِ أذْهِبْ الباسَ، اشفِه وأنتَ الشَّافِي، لا شفاءَ إلا شفَاؤُكَ، شفاءً لا يغادِرُ سَقَماً

ماکوان: هەندێك سـیحر هەیە ناتوانرێت بیدۆزیتەوە، خەڵکی لەکوێ ئێوەی دەست دەکەوێت بۆی بیدۆزنەوە ئەی چۆن ئەوە بەتاڵ دەکرێتەوە؟

زولات: هەر هەمان شـێوەیە، بەڵام خڵتەیەکی دەرمان هەیە بیخوات چاك دەبیتو هیچ کاریگەری نامێنێت.

ماکوان: کەی فێرم دەکەن؟

نەسناس: بەدڵنیاییەوە فێرت دەکەین، بەڵام دەبێت ئێستا بڕۆین. هەوڵبدە بە زووترین کات سیحرەکەی خۆت بەتاڵ بکەرەوە بۆ ئەوەی کاریگەری هیچ نەمێنێت.

ماکوان: باشە ئێستا دەست پێدەکەم بە پشتیوانی خوا، چاوم تروکاند کەسیان نەمان. بۆ خۆشی لەبەر خۆمەوە وتم تەماشایان کە دەڵێی جنۆکەن خۆ کەسیان نەمان!

ئەوەی ئەوان وتیان کردم، سوپاس بۆ خوا هەمووی تەواو بوو لەو کاتەوە تا ئێستا سەر ئێشەی وام نەگرتووە هیچ عەیبم نەماوە.

لەگەڵ ماڵەوە دانیشتبووم لە سلێمانی خەریکی خوێندنەوەی کتێبێك بووم، لە پڕ لە جەڕەس درا هەڵسام بڕۆم بیکەمەوە، پێشڕەو ڕۆیشت و هاتەوە وتی: کاك ماکوان ژنێك دەگری لە بەر دەرگا داوای تۆ دەکات.

ماکوان: کێیە؟ نایناسیت؟

پێشڕەو: یەکەم جارە بیبینم.

ماکوان: بڵێ با بێتە ماڵەوە.

پێشڕەو: لەدەرگا نەماوە دیار نییە دیارە ڕۆشتووە.

ماکوان: بزانە هەژار بووە.

پێشڕه‌و: ئه‌ی چۆن ناوی تۆ ده‌زانێت؟

ماكوان: ئاخر له‌وانه‌یه به‌هۆكاری فه‌یســبوك و شــته‌وه زانیبێتی هاتومه‌ته‌وه داوای هاوكاری بكات.

پێشڕه‌و: ئه‌ی باشه چی لێهات.

ماكوان: جا چوزانم لای تۆ نیم منیش، له‌وانه‌یه سواری ته‌كسی بووبێت.

له‌ده‌رگا درایه‌وه دایكم وتی دوو پیاو له‌ماڵه‌كه‌دان من بڕۆم ده‌رگا بكه‌مه‌وه!

ماكوان: نا وا چووم، چوومه خواره‌وه ته‌ماشــا ده‌كه‌م ژنێك له‌ده‌رگا وه‌ســتاوه، وتم فه‌رموو خوشكم ئه‌مركه.

هه‌ر وام وت چه‌قۆی ده‌رهێنا له خه‌نجه‌ر گه‌وره تر بوو، چه‌قۆیه‌كی ســـتیلی ترسناك دای هێنایه‌وه بۆ سه‌رسنگم، ڕامكرده دواوه بۆ ئه‌وه‌ی به‌رم نه‌كه‌وێت هاوارم كرد پێشـــڕه‌و فریاكه‌وه ده‌مانچه‌كه‌م بۆ بێهینه. هه‌ر وام وت ژنه دیار نه‌ما، ڕامكرد به‌شوێنیدا ئه‌مسه‌ر ئه‌وسه‌ر گه‌ڕام هیچ دیار نه‌بوو.

به‌په‌له هاتمه‌وه سه‌ره‌وه دایكم وتی ڕۆڵه بۆ سوور هه‌ڵگه‌ڕاویت چی بووه،!؟ منیش به توڕه‌یه‌وه وتم پێشڕه‌و ئه‌وه هاوارم لێكردی بۆ وه‌ڵامت نه‌دامه‌وه.

پێشڕه‌و: به‌خوا گوێم له‌ده‌نگی تۆ نه‌بووه، چی بووه بۆ ڕه‌نگت تێك چووه؟

ماكوان: هیچ ئه‌و ژنه داوای پاره‌ی كرد ویســـتم پاره‌ی بۆ بهێنیت، ئیتر خۆم دامێ!

دایکم: رۆڵە ناوی تۆ بەدەوڵەمەند ڕۆیشتوە ئەوەندە دەست مەکە بەگیرفانتا بۆ ئەم و ئەو هەندێك کەس درۆ دەکەن.

ماکوان: باشە بەسەرچاو لە دەرگا درایەوە، دەستم دایە دەمانچەکەم و ئینجا چوومە دەرەوە، تەماشام کرد مامەم بوو وتی کاکە لەماڵییت میوانت نییە؟

ماکوان: نەخێر قوربان تەشریف بهێنە ژوورەوە.

هاتە سەرەوە و دوای دە خولەك لە جەرەس درایەوە، بەپەلە ڕامکرد وتم نەکو پێشڕەو بچێت، چەقۆیەك بدات لە پێشڕەوی برام یان دایکم بڕوات. خۆم ڕۆیشتم دیسان میوانی ترم هاتبوون، ماڵی کچێکی پورم بوون بۆ بەخێرهاتنەوەم هاتبوون. دوای چارەکێك لەدەرگا درا هەمان ژن بوو.

## فرت و فێڵێکی نوێ

لەدەرگای ماڵمان درا پێشـڕەوی برام چوو وتی کەسـێك هەواڵت دەپرسـێت، وتم بابێتە سـەرەوە دیار نەمابوو، کە خۆم چووم ژنێکی ئاسـایی دەم و چاوی لە پەنجا سـاڵ دەچوو، هەر ئەوەندە منی بینی وتم فەرموو خوشـکم هێرشـی بۆ هێنام، چەقۆیەکی دەرهێنا زۆر ترسـام لە شـێوەی سـتیلدا بوو بۆ سـنگمی داهێنایەوە و منیش لە ترسـاندا ڕامکردە سـەر پلیکانەی ماڵەکەمان و هاتمە دواوە بە خێرایی و هاواری دەمانچەکەمم لە پێشڕەوی برام کرد فریام بخات، رامکردە دەرەوە ژنەکە نەمابوو.

کاتژمێری ٧:٣٠ شـەو بوو لەدەرگا درایەوە ماڵی مامم بوو، دوای ئەوانیش ماڵی کچێکی پورم هاتن، دیسـان لەدەرگا درایەوە هەر خۆم چووم بەدەم دەرگاکەوە هەمان ژن بوو، بەڵام دایکم هەسـتی پێکرد بووم کە تەواو نیم بەدوامدا هات نەمزانی لە دوامەوەیە، میلی دەمانچەم هێنایەوە وردە وردە بەرەو ڕووی بڕۆم تەقەی لێبکەم. کەچی دایکم وتی ڕۆڵە ئەوە چی دەکەیت، سەبری خان فەرموو وەرە ماڵەوە.

ماکوان: سـەبری خان کێییە؟ کامە سـەبری خانە؟ سـبحان الله کەوای وت ئەهوەن بوومەوە زۆریش قەلەق بووم.

دایکم: ڕۆڵە ئەوە سەبری خانی دراوسێمانە ماڵیان لەسەرو خۆمانەوەیە ژنی حاجی حوسێن-ە.

ماكوان: سـەبرى خان ئێسـتا جەنابت نەبوويت هاتى بۆ ئێرە، خەت رەجعيم دانا، نەكو شەو بووبێت و لێم تێك چووبێت.

ســەبرى خـان: نەوەڵا بـاوكم من نەبووم، ئـامينە خـان ئەمە كوڕەكەتە كە لەخاريجە؟

دايكم: ئەرەوەڵا سەبرى خان گيان، ئەمە خەسرەو-ى كوڕمە.

دايكم ئەڵێى وەســفى ســەلاحەدينى ئەيوبى بۆ دەكرد! چوونە ســەرەوە تەماشاى پێشرەوم كرد زۆر ئاسايى بوو تەماشام كرد وتى سەبرى خان بەخێر بێيت، ئەى بۆ كاك حاجى حوسێن نەهات؟

سەبرى خان: وەڵڵا منيش بۆ ميوانى نەهاتووم، هاتم بزانم تەعزێكەى برايمى مامە عەزە لە كوێيە؟ تەلەفونم زۆر كردبوو بۆ ئامينە خان بۆ دەســتييەكەت هەڵى نەگرت.

دايكم: ئۆيى وەڵڵا ڕاسـت دەكەيت بە خەسرەو گيانە شـەحنى تێدانەماوە لە سەفەر بووە.

منيش هەموو گيانم ڕقە بۆ سـەبرى خان، كەچى لەماڵى ئێمەدا سـەبرى خان زۆر ڕێزى لێدەگيرێت. تۆزێك پێش ئێسـتا خەريك بوو بمكوژێت نەمدەوێرا لەبەر دايكم و جەمـاعەت هيچ بڵێم دەترســام دوايى بڵێن شــێت بووە، ئەوەندەش توڕە بووم خەريك بوو فيشـەكى پێوە بنێم، تا لەترسـاندا فيشـەكى دەمانچەكەم لە پێشەوە لابرد.

مامم هەستی کرد کە ماندوو دیارم زوو هەڵسا ڕۆیشت و ماڵی کچەکەی پوریشم زوو ڕۆیشتن ، نەمدەزانی ئایا باسی ئەو ڕووداوە بکەم بۆ دایکم و پێشڕەو یان نا، بەڵام دوایی هیچم نەوت و هەر باسم نەکرد.

شەو چوومە سەربانی ماڵی خۆمان، بەڵکو - حەزقیل یان جەماعەتەکەی لە شوێنێکەوە دەرکەون، بەڵام کەس دیار نەبوو. زۆر لەسەربان بووم دایکم بانگی کردم وتی: ڕۆڵە ئەوە چی دەکەیت، خۆ جارانیشت نییە بڵێم دڵداری لەگەڵ کچانی دراوسێ دەکەیت.

ماکوان: دەستم کرد بە پێکەنین، عەرزی دایکمم کرد حەز دەکەم تەماشای سلێمانی بکەم، خۆ ئەم سلێمانییە ئەگەر وازی لێبهێنی هەرگیز ئەو وازت لێناهێنیت ئەوەندە جوان و خۆشە.

هاتە سەرەوە بۆ سەربان بۆلام، دەستم کرد بە قسە کردن لەگەڵیدا.

ماکوان: ئەرێ بەڕاست ئەو سەبری خانە کێ بوو؟

دایکم: ژنی حاجی حوسێن خەڵکی شارباژێرن، کاتی خۆی لە دەرەوە لە ناوچەکانی دەرمیانەو و قەڵاتێ و جارخ و پارێزان، مێردی ئەم سەبری خانە پێشمەرگە بوو لای باوکت و زیاتر نامەی باوکتی ئەبرد بۆ سەرکردایەتی، ئەوە ماوەی ساڵێکە ماڵیان هاتۆتە ئەم گەڕەکە پێشتر لە زەرگەتە بوون. هەتا بڵێیت ماڵێکی چاکن و کوڕێکی هەیە ئەویش لە ئەڵمانیایە.

منیش هەرچی تەماشام کرد ژنێکی ئاسایی بوو، زۆر مێشکم مەشغوڵ و ئاڵۆز بوو بەو ژنەوە.

خەوتم و نوێژی بەیانی چووم بۆ مزگەوتی (عەلی كەمال) لەتەنیشـــتمەوە مامۆســـتا ئەحمەدی مەلا فایەق بوو، عەرزمكرد دوعام بۆ بكە پێویســـتم بە دوعای خێرە دڵم زۆ تەنگە و ترسێكیش لە دڵمدا دێت و دەڕوات.

هەر ئەو بەیانییە لە مزگەوتی (عەلی كەمال) فەرمووی: ئەم دوعایە بخوێنە چاك دەبیت، هەســـتم كرد ئەو پیاوە زۆر موبارەكە، خوای گەورە مەحفوزی بكات. یەكەمجاریشـم بوو بەخزمەتی بگەم ئەویش منی نەدەناســی، لەگەڵ ئـارامی جگەرچی بەیەكەوە چووین بۆ مزگەوت ڕەفیقی ئـارامی بلە بەهـار بوو. دوعـاكە بریتی بوو لە: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِـكَ مِنَ الْهَمِّ وَالْحَزَنِ، وَالْعَجْزِ وَالْكَسَـلِ، وَالْبُخْلِ وَالْجُبْنِ، وَضَلَعِ الدَّيْنِ، وَغَلَبَةِ الرِّجَالِ. واتە: یاڕەبی خوایە پەنا ئەگرم بەتۆ لە خەمو خەفەت، لە دڵتەنگی لە تەمەڵی و تەوەزەلی، لە بەخیلی و ترسنۆكی، لە كەڵەكە بوونی قەرز لەسەرم، وە زاڵبونی خەڵكی بەسەرمدا

لەگەڵ وەستا ئارامی جگەرچی، ناسراو بە ئارامی حاجی حەسەنی بلەی بەهار لە مزگەوت هاتینە دەرەوە.

ئارام: خالە خەسرەو بڕۆین بۆ كەڵەشێر خواردن یان سەروپێ؟

ماكوان: بە ئارەزووی خۆت.

چووین بۆ ســـەروپێ لە ژێر پردەكە، دوای تەواو بوونمـان ئەو چوو بۆ قەسابخانەو منیش بە پێ سەركەوتم بەرەو هەوارە بەرزە. بەیانییەكی وشكە سەرمای سلێمانی بوو، لای زانكۆی سلێمانییەوە سەركەوتم ڕووە و ئیسكان. تەماشا دەكەم كەسێك لەو بەرمەوە دەڕوات كە ئاوڕم داوە بەلایەوە پیاوێكی ئاسایی بوو، نزیك بوەوە لێم وتی ماكوان نەسناس- م.

زۆر تورە بووم لێی، وتم کاکە یان هاوڕێیەتیم مەکەن یان کاتێك پێویســـتم پێتان بوو وەرن بۆ لام ناکرێت بە ئارەزووی دڵی خۆتان ئامادە بن. ناکرێت دوێنی شـــەو ســـەگبابێك خەریك بوو بمکوژێت، هەرچی چاوەڕێتان بووم نە حەزقیل نە ررقی کەستان دیار نەبوو.

نەسناس: ماکوان تۆ ئێمەت موسەخەر نەکردووە تا ئێمە لەبەردەستا بین، خۆ کۆیلەنین لای تۆ. ئەزانم دوێنێ شـــەو زۆر بێتـاقەت بوویـت، بەڵام ئێمە ناتوانین بەئارەزووی دڵی تۆ لەلات بین.

ماکوان: ئەی ئێسـتا چی دەکەیت، فەرموو ملت شـکێنە، لاچۆ با فیشـەکێکت پێوە نەنێم لاچۆ لەبەر چاوم.

لەدوامەوە حەزقیل پەیدابوو.

حەزقیل: ماکوان بۆ وا تورەی کاکە وانا بێت.

خوا شاهیدە مەترێك بەرز بوومەوە بە ئاسماندا ئەوەندە ترسام.

ماکوان: بەخوا حەزقیل تۆ لەوان بێناموســتری. کاکە دوێنێ شـەو خەریك بوو بمکوژن ئێوەش بە ئارەزووی خۆتان دێن و دەڕۆن ئاخر وانابێت.

نەسناس قسەی نەکرد، بەڵام منیش پەشیمان بوومەوە وتم ببورن زۆر تورەم.

نەســـناس: لێت تێدەگەم ئاســـاییە تۆ برای ئێمەیت، گیزە گیزی جنۆکە هات ئەوەندەم زانی ڕاقی و زولاب دەرکەوتن.

ماکوان: ئەوە چییە ماشـــاءالله ئەڵێی ســـتافێکن بەیەکەوە، یان لە کۆرســـی گۆرانی دەچن کاکە. من شتێکم لە ئێوە ئەوێت ئەگەر هاوڕێیەتی من دەکەن با شـــتێك لە بەینماندا هەبێت کە بتوانم ئێوە بانگ بکەم. تەنها ئەو داوایەم لێتان هەیە.

وردە وردە دنیا ڕوناك بوویەوە تەکســیيەك بەرەو خوار دەڕۆیشـــت ســـایەق تەکســـییەکە لەدوورەوە جـامەکەی دایـایەوە، هـاواری کرد ئەوە مەعـاش نەهاتووە سەری لە تۆش داوە لەگەڵ خۆت قسە دەکەیت!

ماکوان: نەوەڵڵا من کێشـەی مەعاشـم نییە، لەگەڵ جنۆکە قسـە دەکەم ئەگەر پێت خۆشـــە دابەزە با تەعروفێکتان پێبکەم. هەر وام وت خەریك بوو خۆی بکێشـــێت، بە دیواری بنکەی شـــورطەی ئیســـکاندا کە جاران بەطەوارییەکە ناسراوبوو. جەماعەت پێی پێدەکەنین.

ڕاقی: ماکوان مامۆســـتاکەی ئێمە دەیەوێت ئەمڕۆ قســـەت لەگەڵ بکات و بتبینێت.

ماکوان: جا لەخزمەتیدام نۆرەی ئەمە، قەیچییەکا با ئەویش بناسین.

زولاب: چۆن ئێوە بانگخوازو مەلاو زاناتان هەیە، ئەو کەســـەش مامۆســـتای ئێمەیە و زانایەو لە ولاتی سعودیە خوێندویەتی لەخزمەت زانایانی ئێوەدا.

ماکوان: بەڕاست! وەڵڵا ئەمە گرنگە، ناوی چییە؟

نەسناس: ناوی شێخ (بەرقان)ە، یان مامۆستا بەرقان، حەز دەکەیت بڕۆین؟

ماکوان: ئەرێ وەڵڵا مەمنونیش دەبم.

خەتێکیان کێشـــا بە دەورمدا و وتیان چاو بنوقێنە تەکانێکم دا وەك تەکانی مەصــعەد وابوو. لە ترســاندا چاوم کردەوە تەماشــام کرد ئیســکانی چی و سـلێمانی چی لە نێوانی دوو شـاخدام و چواردەورم هەموو دارە و کەسـم لە تەنیشت نییە، جەماعەتیش لام نەماون.

ماکوان: هاوارم کرد.. ڕاقی.. حەزە.. نەسناس.. حەزە.. ڕاقی.. کاکە من لە کوێم بیکەن بەخاتری خوا.

هەندێك ئایەتم خوێندو زکرو دوعام خوێند، لەپڕ گوێم لە خوڕەی کانیاوێك بوو لە دوامەوە کە ئاوڕمداوە پیاوێکی ڕیش ســپی لە ســۆفییەکانی هەورامان دەچوو، جلی ئەفغانی لەبەردا بوو وتی مامۆستا ماکوان السلام علیکم ورحمة الله وبرکاته.

ماکوان: وعلیکم السلام ورحمة الله وبرکاته.. جەنابتان مامۆستا بەرقان-ن؟

بەرقان: بەڵی مامۆستا ماکوان من ئەوم، براکانمان نانمان بۆ ئامادە دەکەن.

ماکوان: لەدڵی خۆمدا وتم ئێستا ئێسـقانی دنیا دەرخواردمان ئەدەن! سـوپاس من نانم خواردوە.

بەرقان: برســـیت دەبێتەوە تا ئامادەی دەکەن. کاکە ماکوان من ناردوومە بەشوێن تۆدا بۆ ئەوەی هەندێك شت هەیە بیزانیت!

بەشـی یەکەمی مەملەکەتی شـەیتانم خوێندوەتەوە، لەگەڵ ئەو برایەی ئێمەدا کاری باشـتان کردووە و شـتێکی باشـت نووسـیوە، بەڵام نوقسـانی زۆرە. بۆیە بانگم کردی تا بتوانیت ئەو نوقســـانییانە پڕ بکەیتەوە، چونکە لە ناو وڵات و مەملەکەتی ئێوەدا ئەو زانیـارییـانە نییە. بـاخەڵکیش بە بۆنەی تۆ و بەبۆنەی ئێمەشەوە تووشی فیتە نەبێت، هاوکاریان بکەو ئێمەش هاوکاریت دەکەین.

ماکوان: بارك الله فیکم؛ قوربان وەڵاهی ئەم قسـەیەم زۆر بەدڵە، بەڵام کێشـە لەوەدایە، پیاو مەبەســـتم ئێمەی مرۆڤە، بەتایبەت خۆم دەڵێم بڕوام بە هیچ نەماوە زۆر جار ئەڵێم تۆ بڵێی شێت بووبم و حاڵەتی نەفسیم تەواو نەبێت؟

بەرقان: نا - مامۆسـتا ماکوان خێرێکی باشـت دەسـت دەکەوێت و ئێمەش و ئێوەش لەدەست یەکتر نەجاتمان دەبێت.

ماکوان: جا -چۆن؟ ئەزانی من دوێنێ شـەو شـتێکی زۆر سـەیرم بەسـەردا هات جەنابی شێخ بەرقان، جەنابی نەسناس-یش دەڵێت ئاگادار بووین. دوێنێ شـەو خەرێـك بوو بمکوژن، کەچی ئەو برایەمـان دەڵێـت ئـاگـادار بووین، ئـاخر برا ئاگاداری شتی وابێت ئەوە برایە؟

بەرقان: ڕاســـت دەکات، ئاگادار بووین دوای ڕووداوەکە خۆ ئێمەش عیلمی غەیبمان پێنییە، وایە؟

مـاکوان: بەڵێ وایە من بـاســـی عیلمی غەیـب نـاکەم، بەڵکو ئێوە جیهـانێکی تایبەت و لە ئێمەی مرۆڤ زووتر زانیاریتان دەست دەکەوێت.

بەرقان: ئەوەی دوێنێ شەو هیچ نەبوو، ترساندنی سەسیل بوو بۆ تۆ و بەس، ئەو چەقۆیە هیچ نییە بەریشت بکەوتایە لەوانەیە ببورایتایەتەوە لەترسا، بەڵام هیچ نەبوو چەقۆ نەبوو، لە بەرچاوی تۆدا کرابووە چەقۆ، ئێمە ناتوانین ئالەتی خۆتان بەکار بهێنین، بەس دەتوانین بتان ڕفێنین و بتانخنکێنین، ئەویش ئەوکارە ئێمەی موسوڵمان نایکەین، بەڵکو بەشێك لە شەیتانەکان دەیکەن، ئەوانەی کە پەیمان و کۆنتراکتیان هەیە لەگەڵ ئەو خەڵکانەدا کە دوورن لە خوای پەروەردگارمانەوە، یان کۆمەڵێکی زۆر لە ئێمەی جنی بەیەکەوە بین و لێمان بکوژن. ئەوکات ئازارتان پێدەگەیەنینەوە، دەنا - چەقۆ و ڕووبەڕووی ئێوە زۆر ئاستەمەو بیریشی لێمەکەرەوە ئەوە فرتو فێڵی سەسیل-ە، پێشتر دەبوو بتزانیبایە لەگەڵ شاهین قەڵەو ئەو کارەیان نیشان دابوویت، وایە؟

ماکوان: ئەها ڕاست دەکەیت، وابوو شێخ شاهین کە هات بۆلام دوو چەقۆی دا لەخۆی لە قاوەخانەکدا و هیچی لێنەهات، ئەو کچەی لە قاوەخانەکە کاری دەکرد بینی بۆیە تەلەفونی کردبوو بۆ پۆلیس، وەڵاهی ڕاست دەفەرموویت.

بەرقان: کاکە ماکوان ئەزانی بۆچی تۆم هەڵبژاردوە قسە بکەین بەیەکەوە؟

ماکوان: نەوەڵڵا

بەرقان: ئەم هەموو جنۆکەت لەبەر دەستدا بووە، داوای هیچت نەکردووە بۆ خۆت، خۆت هەست ناکەیت ئەوە شتێکی زۆر سەیرە لە ئێوەی مرۆڤدا؟

ماکوان: ڕاستە، هەمووجارێك ویستومە داوای شتێك بکەم لەڕاستیدا، بەڵام بەهۆکاری کێشەو سەرقاڵی خۆم بیرم چۆتەوە، خۆ ماڵی ئەو برایانی لای تۆشم

ئاواکرد بەئارەزووی خۆیان پەیدا دەبن و دێن و دەڕۆن. ئەمڕۆ گلەیی ئەوەم لێکردن.

بەرقان: ئاخر ئەگەر وانەبێت ئەوکات تۆش دەبیت بەساحیرو لە ساحیرەکان ئاماژەت بۆ دەکرێت.

ماکوان: پەنا دەگرم بەخوا، خوای گەورە بمان پارێزێت لە سیحر و جادوو، چۆن شتی وادەکەم.

بەرقان: دەزانم تۆ شتی وا ناکەیت، شێخ عوسەیمین و شێخ بن باز لەفتواکانیاندا دەفەرموون دەشێت جنی وەك ئێمە هاوڕێیەتی لەگەڵ مرۆڤدا بکەن، بەڵام مسولمان نابێت داوای هیچ لە جنۆکەکانی برای بکات، چونکە دەبیتە شەریك بۆ خوا دانان و بابی جادووبازی وسیحرەوە.

زۆر جار لە پیاو چاکانی ئێوە کەسی باشی ئێمە هاوڕێی بووە تاکە کارێك کە کردوویەتی لەگەڵیدا بۆ شەو نوێژ خەبەری کردۆتەوە یان بۆ نوێژی بەیانیان.

ماکوان: جا - جەنابی بەرقان من زیاد لە ٢٠٠ بەردەی گران بەهای چاکم لە حەزقیل و ڕاقی داواکردووە، کەواتە ئەوە سیحرە؟ پاشان سەرچاوەکانی شێخ عوسەیمین و بن باز-م پێ بڵێ بێزەحمەت؟

بەرقان: بەڵێ بەدڵنیاییەوە پێت دەڵێم لە کتێبی (المجموع الفتاوى) ژە هەردووکیاندا هەیە، لە بابی سیحرو جن و مەلائیکەت. ئەو بەردانەش وەرتگرتووە ئەوە جائیز نییە کە بە منیشیان وت لێیان توڕە بووم. هەروەها لە مجموع فتاوی شێخ بن باز-دا هاتووە بەهیچ شێوەیەك مرۆڤ نابێت داوا لە

بەرقان: ئەوەی دوێنێ شەو هیچ نەبوو، ترساندنی سەسیل بوو بۆ تۆ و بەس، ئەو چەقۆیە هیچ نییە بەریشت بکەوتایە لەوانەیە ببورایتایەتەوە لەترسا، بەڵام هیچ نەبوو چەقۆ نەبوو، لە بەرچاوی تۆدا کرابووە چەقۆ، ئێمە ناتوانین ئالەتی خۆتان بەکار بهێنین، بەس دەتوانین بتان ڕفێنین و بتانخنکێنین، ئەویش ئەوکارە ئێمەی موسوڵمان نایکەین، بەڵکو بەشێك لە شەیتانەکان دەیکەن، ئەوانەی کە پەیمان و کۆنتراکتیان هەیە لەگەڵ ئەو خەڵکانەدا کە دوورن لە خوای پەروەردگارمانەوە، یان کۆمەڵێکی زۆر لە ئێمەی جنی بەیەکەوە بین و لێمان بکوژن. ئەوکات ئازارتان پێدەگەیەنینەوە، دەنا - چەقۆ و ڕووبەڕووی ئێوە زۆر ئاستەمەو بیریشی لێمەکەرەوە ئەوە فرتو فێڵی سەسیل-ە، پێشتر دەبوو بتزانیبایە لەگەڵ شاهین قەڵەو ئەو کارەیان نیشان دابوویت، وایە؟

ماکوان: ئەها ڕاست دەکەیت، وابوو شێخ شاهین کە هات بۆلام دوو چەقۆی دا لەخۆی لە قاوەخانەکدا و هیچی لێنەهات، ئەو کچەی لە قاوەخانەکە کاری دەکرد بینی بۆیە تەلەفونی کردبوو بۆ پۆلیس، وەڵاهی ڕاست دەفەرموویت.

بەرقان: کاکە ماکوان ئەزانی بۆچی تۆم هەڵبژاردوە قسە بکەین بەیەکەوە؟

ماکوان: نەوەڵڵا

بەرقان: ئەم هەموو جنۆکەت لەبەر دەستدا بووە، داوای هیچت نەکردووە بۆ خۆت، خۆت هەست ناکەیت ئەوە شتێکی زۆر سەیرە لە ئێوەی مرۆڤدا؟

ماکوان: ڕاستە، هەمووجارێك ویستومە داوای شتێك بکەم لەڕاستیدا، بەڵام بەهۆکاری کێشەو سەرقاڵی خۆم بیرم چۆتەوە، خۆ ماڵی ئەو برایانی لای تۆشم

ئاواکرد بەئارەزووی خۆیان پەیدا دەبن و دێن و دەڕۆن. ئەمرۆ گلەیی ئەوەم لێکردن.

بەرقان: ئاخر ئەگەر وانەبێت ئەوکات تۆش دەبیت بەساحیرو لە ساحیرەکان ئاماژەت بۆ دەکرێت.

ماکوان: پەنا دەگرم بەخوا، خوای گەورە بمان پارێزێت لە سیحر و جادوو، چۆن شتی وادەکەم.

بەرقان: دەزانم تۆ شتی وا ناکەیت، شێخ عوسەیمین و شێخ بن باز لەفتواکانیاندا دەفەرموون دەشێت جنی وەك ئێمە هاوڕێیەتی لەگەڵ مرۆڤدا بکەن، بەڵام مسوڵمان نابێت داوای هیچ لە جنۆکەکانی برای بکات، چونکە دەبیتە شەریك بۆ خوا دانان و بابی جادووبازی وسیحرەوە.

زۆر جار لە پیاو چاکانی ئێوە کەسی باشی ئێمە هاوڕێی بووە تاکە کارێك کە کردوویەتی لەگەڵیدا بۆ شەو نوێژ خەبەری کردۆتەوە یان بۆ نوێژی بەیانیان.

ماکوان: جا - جەنابی بەرقان من زیاد لە ٢٠٠ بەردەی گران بەهای چاکم لە حەزقیل و ڕاقی داواکردووە، کەواتە ئەوە سیحرە؟ پاشان سەرچاوەکانی شێخ عوسەیمین و بن باز-م پێ بڵێ بێزەحمەت؟

بەرقان: بەڵێ بەدڵنیاییەوە پێت دەڵێم لە کتێبی (المجموع الفتاوی) ژە هەردووکیاندا هەیە، لە بابی سیحرو جن و مەلائیکەت. ئەو بەردانەش وەرتگرتووە ئەوە جائیز نییە کە بە منیشیان وت لێیان توڕە بووم. هەروەها لە مجموع فتاوی شێخ بن باز-دا هاتووە بەهیچ شێوەیەك مرۆڤ نابێت داوا لە

جنی بكات كەهاوكاری بكات بۆ بەدەســتهێنانی گەنجینەی كۆن و نوێ لە ژێر خاك، یاخود دۆزینەوەی ئەو تاوانانەی كە مرۆڤ لەنێوان خۆیاندا دەیكەن با ئێمەش بیزانین. دەبێتە شــەریك بۆ خوا دانان ئەگەر بە ئێوەی موســوڵمانیشــی بڵێین. تەنانەت شــێخ عوســەیمین دەفەرموێت ئەگەر بێت و دوو مســوڵمان پارەی یەكێكیانی دزی بێت جنی بۆی نییە ئاگاداریان بكاتەوە، چونكە شــەرعی ئیسلام ئەگەر بێت و ئەو ڕێگایەی بدایە، ئەوا فیتنەی زۆری لێ دروست دەبوو وە سـەری دەكێشا بۆ شـتی تریش. تاكە كارێك كە لە تۆمان بینیوە داوای پارەو ســەروەت و ســامان و گەنجینە و ئەوشــتانەت نەكردووە، ئەو بەردانەی عەبدوڕەحمان حەزقیـل-یش ئـامۆژگاریـت دەكەم بیگەڕێنیتەوە بۆ ئەویش و ڕاقی-ش.

ماكوان: بە خۆشــحاڵییەوە هەر چوومەوە نەرویج هەمووی ئەدەمەوە، لێرە چەند دانەیەكم بۆ دایكم و ئەوان هێناوەتەوە دوای ئەیدەمە دەســت یەكێك لەو بەڕێزانەی لای جەنابتان.

عەبدوڕەحمان حەزقیل و ڕاقی لەلاماندا پەیدا بوون وتیان: جەنابی بەرقان، ناكرێت بەدیاری ئێمە پێشكەشی ماكوانی بكەین؟

بەرقان: بە مەرجێك داوای شتی تر نەكات و ئێوەش هیچی بە قسە ناكەن.

ماكوان: نا دەستان خۆش بێت من دینەكەم لا گرنگە هیچم ناوێت، ئەوانەشیان ئەدەمەوە، سوپاسی حەزقیل و ڕاقی گیان دەكەم. بۆچیمە خۆ نایكەمە ملم.

بەرقان: ئاســاییە و بۆ دین و قیامەتی خۆتان دەڵێم، مادام ئێوە هەموو ئەهلی ئیمانن خوای گەورەش پشــت و پەناتان بێت، چونكە ئەو دیارییە كە دراوە بۆ

خۆشەویستی نێوانمانە. پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: دیاری پێشکەشی یەکتر بکەن بۆ ئەوەی خۆشەویستی زیاد بێت.

ماکوان: باشە سوپاس تان دەکەم، ئەی جەنابی شێخ بەرقان ئەو ئافرەتەم بۆ باس بکە، دوایی بوو بە ناسیاوی دایکم و سەبری خان، سەبری خان شوێنی کەوتبوون.

بەرقان: هەرچەندە بۆم باس کردی کە ئەوە ئەو ژنە نەبوو، بەڵکو دەیانزانی ئەو ژنە بەرەو ماڵی ئێوە کەوتۆتە ڕێ ویستییان فیتنەیەك دروست بکەن بۆ ئەوەی دوایی کە هاتە بەردەرگاکە تۆ فیشەکێکی پێوە بنێیت یان چەقۆیەکی لێبدەیت و لەو بەینا فیتنەیەك دروست ببێت ، دەنا ئەو ئافرەتە ئاگای لە هیچ نییە. تەنها فیتنەی سەسیل و کۆمەڵەکەیەتی کە ویستیان بۆ تۆی دروست بکەن، بەڵام خوای پەروەردگار پاراستیتی.

ماکوان: ئەی چۆن دەتوانن خۆیان والێبکەن؟ چۆن ئەو ڕێکخستنەیان بۆ دروست دەبێت؟

بەرقان: بەهۆکاری تاوانی خۆتانە، ئەو بەیانییە لە تاو سەروپێ خواردن لەبیرت چوو زیکرەکانیش بخوێنیت، ئەو زانایە دوعایەکی فێرکردی هەر ئەوەت دەخوێند زیکرەکانی تریشت لەبیر چوو. بزانە هەرکات ویردەکانی بەیانی و ئێوا!رەت لەبیر بچێت سەسیل دێت بۆلات، وایە؟

ماکوان: بەزاتی خوا ڕاست دەکەی زۆر زۆر وایە، منیش دیقەتم داوە.

بەرقان: جا بزانە قەرینی ئەوان هەوڵی داوە زانیویەتی کەدێت بۆ ماڵی ئێوە، ئەویش وتویەتی دەچین بۆ ماڵی ئامینە خان، ئیتر زانیویانە دایکی ماکوانە. ئەو ماڵەش نوێژو خواناســـی بە باشـــی تێدا ناکرێت، ماڵەکە ماڵی شـــەیتانە کوڕێکیان هەیە هەمیشە خەریکی مەشروب خواردن و کاری خراپەیە.

فەرموو ماندووم کردی بابڕۆین بۆ ناو مەجلیســـی ئێمەو بڕۆین بۆ باڵەخانەو ماڵەکانمان ببینە، نان ئامادەکراوە بیخۆین.

ماکوان: جەنابی شێخ ئێوە هەر ئیسقان ناخۆن؟

بەرقان: کە چووین خۆت بڕیار بدە، ئێمەش شتی حەڵاڵ و شتی باش دەخۆین، ئێســـقانی ئەو گۆشـــتیە ئێوەی موســـوڵمان دەیخۆن بەدڵنیاییەوە خواردنی موفە ضەلی ئێمەیە، چونکە بســـم اللەی لێکراوە. هەر خواردنێکیش ئێوەی مرۆڤ بســـم اللەی لێنەکەن ئەوە خواردنی شـــەیتانەکانە. زۆر جار لەتاو جەهالەتی ئێوە و بیرچوونەوەتان کەناڵێن بســـم اللە خەمی ورگتانە خواردنمان دەست ناکەوێت بیخۆین، باشترین خواردنمان لەگەڵ ئێوەدایە دەست و دڵتان زۆر باشە بۆ شەیتان، بەڵام بۆ براکانتان بیرتان نییە بڵێن بسم اللە.

کەوتینە ڕێ و لە نێوانی دوو شـــاخەکەدا باڵەخانەیەکم بینی شـــتی وا جوانم نەدیبوو فراوان و بەرز.

## بەرقان و خەڵکی کوردستان

شێخ بەرقان داوای لێکردم بچینە ناو باڵەخانەکەیان لەوێ پشوویەك بدەین و نانێك بخۆین، لەخزمەتی ئەو جنۆکە بەڕێزەدا بە پیاسە کەوتینە ڕێ کە قاچم دەنا بەخاکدا، ئەو خاکەی ژێر پێم گڵێکی تەڕی شێدار بوو زۆر خۆش بوو بۆ ڕۆیشتن.

بەدەم ڕێگاوە عەرزم کرد جەنابی شێخ بەرقان زۆرێک لە خەڵکی وڵاتی ئێمە تووشی جادو و سیحر بوون و شەیتان چۆتە لاشەیانەوە. خەڵکێکی زۆریش دوکان و بازاڕیان بۆداناوە و پارە لەو خەڵکە ڕەشوڕووتە دەسێنن.

بەرقان: بڕوا بکە مامۆستا ماکوان ئەو کەسانەی کە لە هەموو هەرێمی کوردستاندا شەیتان چۆتە لاشەیانەوە بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن، ئەگەر بڵێم من دەزانم کێن بڕوام پێبکە.

ماکوان: ئەوە باسی چی دەکەیت قوربان ئێستا مۆدیلە لە کوردستان، هەر ماڵێك کەسێکی تێدا نەبێت تووشی ئەوە بووبێت کە جنۆکە چوبێتە لاشەیەوە بەڕاستی عەیبە، چەند شتێك مۆدێلە ئێستا چوون بۆ عومرەو قەسطەرەی دڵ و نەخۆشی نەفسی کە جن چۆتە لاشەی و سیحری لێکراوە. چەند ساڵێکە ئەمانە مۆدێلن لە کوردستان.

بەرقان: بڕوابکە مامۆستا ماکوان ئەو خەڵکە ئێمەی جنۆکە نەچووینەتە ناو لاشەیان، بەڵکو - یەکێتی و پارتی و حیزبەکانی خۆیان چۆتە ناو لاشەیان،

سـەروەت و سـامانیان دەدزن ژیانیان وێران کردوون، ئەو خەڵکەیان تووشـی فەشـەل کردووە. خەڵکی کوردسـتان دەرەقەتی حکومەت نایەت ئیتر شـەڕ بە ئێمە دەفرۆشن.

هەریەکێك لەوانە کێشـەی ئابوریيان هەیە پارە کەمە ژیان ناڕوات مەعاشـیان نییە، ئیتر هەریەکە بیانوویەك ئەدۆزێتەوە. وەك خۆت فەرمووت ئەو دوکان و بازاڕەی بەناوی شـێخ و مەلا و پیاوچاکانەوە دانراوە، ئەوەی ئەو کارە دەکات زۆربەی نەخوێندەوارە هیچ لەبارەی بیروباوەڕی ئیسـلامی شـارەزایی نییە، خۆی و ئەوخەڵکەش تووشی تاوان دەکات.

ماکوان: واتا ئەو کارە ناکرێت مەبەسـتم ئەوەیە جنۆکە ناچێتە ناو لاشـەی خەڵکەوە، یاخود سیحر ناکرێت لە کوردستاندا.

بەرقان: بەدڵنیاییەوە دەچێت و سـیحریش دەکریت، بەڵام بەو پلە گەورەو زۆرە نییە کە باس دەکرێت، مرۆڤەکان خۆیان تووشـی فەشـەل دەبن بۆیە دەڵێن سیحرمان لێکراوە و جنۆکە چۆتە لاشەمان.

ماکوان: (بەپێکەنینەوە) قسـەکانی جەنابت زۆر لە قسـەکانی حەنانەی ڕەفیقمان دەچێت.

بەرقان: (بە پێکەنینەوە)، لەبەر ئەوەی کچمە.

ماکوان: بەڕاست کچی جەنابتە؟

بەرقان: بەڵێ شووی بە مامۆستا ڕاقی کردووە.

ماکوان: لەدڵی خۆمدا وتم ڕۆشنبیری حەنان و بەرقان زۆر لەیەك نزیکن.

بەرقان: قوتابی خۆمە بۆیە.

ماکوان: جەنابی شێخ پرسیارێکی زۆر گرنگم هەیە ئەویش ئەوەیە، سیحر بۆ خۆی چییە و چۆنەو ئەم کارە چییە؟ تکایە ئەگەر شـــارەزاییت هەیە وەڵام بدەرەوە.

بەرقان: سیحر من شارەزایم لێی نییەو نایکەم، خۆت دەزانی مرۆڤ و جنۆکە کافر دەکات هەر کەس بیکات و هەر کەس بۆی بڕوات و هەر کەس فێری بێت و هەرکەسیش ڕێگا نیشاندەری بێت. وایە؟

ماکوان: وایە

بەرقان: کەواتە سـیحر مەخلوقێکی ناسـکی شـاراوەیە کە ئێوە نایبینن یاخود ئێمەش نـایبینین و هۆکارەکەی واتا ســەبەبەکەی دیار نییە، هەرچی وابوو ئەوە سیحرە.

ماکوان: واتا ئەگەر کەســێك بە فێڵیش بیکات دەچێتە بابی ســیحرەوە کە سەبەب دیار نەبوو، خۆ ئەوە ناویان لێناوە فەن و هونەر و سێرك.

بەرقان: زانایانی ئیسلام ئەوەشیان ناو ناوە سیحر.

ماکوان: کام زانا؟

بەرقان: زانایانی ئەهلی ئەم ئیســلامە لە مرۆڤەکان، بۆ زانیاریت زانا لە ناو جنۆکەدا بۆ زانســتی شــەرعی قســەی لێوەرناگیرێت تەنها لە مرۆڤ قســە

وەردەگیریـت، زانـاکـانی ئەم ئیســـلامە زۆر بەجوانی ڕوونیـان کردۆتەوە، بەڵگەشـــیان ســـاحیرەکانی فیرعەونە خوای گەورە دەفەرموێت: لەبەرچاوی خەڵکی گوریس و عەصـاو دارەکانیان دەکرد بەمارو دەڕۆیشــت، خۆ راسـتی نەبوو فێڵ بوو ئەوەی کە ئێسـتا مرۆڤ ناوی ناوە فەن و هونەر، کەواتە فرتو فێڵی هەر شتێك بەچاوی خەڵکی هۆکاری دیار نەبێت ئەوە سیحرە.

ئایەتەکە دەفەرموێت: ﴿قَالَ لَهُم مُّوسَىٰٓ أَلْقُواْ مَآ أَنتُم مُّلْقُونَ۝٤٣﴾
واتە: (پاشان لە ڕۆژو کاتی دیاریکراودا) موسا بە (جادووگەرانی) وت: چیتان پێیە فڕێی بدەن و (چیتان لەدەست دێ درێغی مەکەن؟!).

﴿فَأَلْقَوْاْ حِبَالَهُمْ وَعِصِيَّهُمْ وَقَالُواْ بِعِزَّةِ فِرْعَوْنَ إِنَّا لَنَحْنُ ٱلْغَٰلِبُونَ۝٤٤﴾

واتە: (جـادووگـەران) هەرچی پەت و گوریس و دارو گۆچـانیـان هەیە فڕێیـان داو وتیـان: بـە یـارمـەتی و دەســـەڵاتی فیرعـەون هـەر ئێمـە سەردەکەوین و هەر ئێمە دەیبەینەوە.
﴿فَأَلْقَىٰ مُوسَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِىَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ۝٤٥﴾

واتە: موســـا گۆچـانەکەی فڕێدا هەرچی درۆو دەلەســـەو گوریس و داریان هەبوو، هەرهەمووی هەڵلووشی ولەناوی دا.
﴿فَأُلْقِىَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ۝٤٦﴾

واتە: ئیتر دەســـتبـەجێ جـادووگـەران (خۆیـان پێنەگیرا لـەبـەرانبـەر حەقیقەتەوە) سوژدەیان برد (بۆ پەروەردگاری باڵادەست).

﴿قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ۝٤٧﴾ [الشعراء]

وتیان: ئێمە باوەڕمان هێناوە بە پەروەردگاری جیهانەکان.

ماکوان: جەنابی شێخ سیحر چەند بەشی هەیە؟

بەرقان: دوو بەشی هەیە

بەشـێکیان دەرمان و پرژاندنە، نوشـتەکردنە لە شـێوەی دوعا (هەرچەندە ناویان ناوە دەرمان دەنا هیچ دەردێك چارە ناکات، بەڵکو خەڵکی دەردەدار دەکات) بەشـێکی تری بەسـتن و فووتێکردن و عەقدە، قوربانی کردنە بۆ شەیتان.

بەشی یەکەمیان: خەڵطەی سیحرەکان دەگیرێتەوە و دەرخواردی ئەو کەسە ئەدرێت کە سـیحری لێدەکرێت، یان دەپرژێنرێت بە ماڵدا و بەسـەیارەدا، یاخود لە شێوەی نووسین و طەلیسم و دوعا کردندا دەکرێت لەگەڵ ئیسقان و موو هەندێك شتی تریش.

بەشـی دووەمیان: تایبەتە زیاتر بە سـاحیرو شـەیتانەکانەوە وەك ئەوەی بەسـتنی خەڵکی و نزیککردنەوەی دووکەس لەیەکترو قوربـانی کردن بۆ شـەیتان و بەندایەتی کردن بۆ شـەیتان، یاخود شـەریك دروسـتکردن بۆ خوا، ساحیرو شەیتانەکان ئەوەیان زۆر پێخۆشە!

ماکوان: باسـی بەشـەکانمان کردو پێناسـەی سـیحریشـم زانی، ئەی جۆرەکانی سیحر چین و چەند بەشە؟

بەرقان: سیحر حەوت جۆری هەیە.

یەکەم: سیحری درۆزنەکان و کژدانییەکان یان کلدانییەکان. ئەم جۆرە جادووە لە خاکی بابلەوە هاتووە کە ئەستێرەو بورجەکانیان دەپەرست، واهەستیان دەکرد گۆڕانکارییان بۆ دەکات تا خوای گەورە پێغەمبەر ئیبراهیم (علیه السلام)ی بۆ ناردن، ئەمەش ئیبن کثیر باسی کردووە ڕەحمەتی خوای لێبێت.

دووەم: جادووی وەهم و ڕۆح و کەسایەتییە بەهێزەکانە. ئەمجۆرەیان لە ڕێگای جنەکانەوە ساحیر خۆی فەرز دەکات بەسەر موریدو ئەو خەڵکانەی دێنە بەردەستی، تاوایان لێدەکات هەموو بە پیرۆز تەماشای بکەن، کاریگەری لەڕێگای شەیتان و جنۆکە خراپەکانەوە دروست دەکات لەسەر خەڵکی بەردەستی.

سێیەم: جادووی جنی زەوی (الجان الارضي)، ئەم جۆرە جادووە جادووبازەکە هەرچی جۆری شەیتان هەیە بەکاری دەهێنێت لە جادو و سیحرەکەیدا، واتا دەبێتە کۆیلەی شەیتانەکان و قوربانیان بۆ دەکات تا سیحرەکەی سەربگرێت.

چوارەم: وابەستەبوونی دڵ. ئەم جادووە بانگەشە بۆ ئەوە دەکات کە گوایە ئیسمی ئەعظمی لایەو بەدڵنیاییەوە بەس بانگەشەی درۆیە، ئەم جۆرە بۆ ئەوەیە کە گوایە ناوی (هەرەگەورە)ی خوای لایەو بەوناوەوە داوا دەکات، ئیتر هەرچی بووێت خوا ئەیداتێ، ئەمەش زۆرێك لە شێخ و ئەوانەی بەناوی طەریقەتەوە ئەو ساختە چێتیە دەکەن.

پێنجەم: تێکەڵکردنی دەرمان و مادە کیمابیەکان. بۆ سەرلێشێواندنی خەڵکی و تێکەڵکردنی ئەو مادانەو دروستکردنی تەقینەوە و دوکەڵ و ئەو جۆرە شتانە ئەمەش هەرجۆرێکی ترە کە زانایانی ئیسلام باسیان کردووە.

شەشەم: جادووی ڕێكخستنی ئەندازەیی. ئەمەش لە ڕێگای طەلیسمەكانەوەیە كە هەمووی نووسینی شەیتانە بەگەورە ڕاگرتنییەتی شەیتان و قسە وتنە بەخوای پەروەردگارو جاری واهەیە لەڕێگای وشە قورئانییەكانەوە دەنووسریت، بەڵام پێچەوانە دەكرێتەوە بۆ شەیتان خوای گەورە بە كەم ئەناسێنێت، پەنا بەخوا.

حەوتەم: جادووی نەمیمەیی و فیتنەی نێوانی خەڵك كە لەڕێگای جنۆكەكانەوە دەكرێت، دەڵێت خەسووت ڕقی لێتە، یان كێ فڵانە كەسی كوشتووە..هتد.

هەموو ئەمانەی باسم كرد زانایانی ئەهلی ئیسلام ئیبن و كەسیرو ئیبنو حەزم و ئیبن قەیم و ئیبن تەیمییەو تەنانەت زانایانی موعتەزیلەو ئەشعەریش هەمان ڕایان هەیە.

هەندێك لەزانایانی سەردەم سیحرێكی تریان دۆزیوەتەوە بەناوی سیحری سوفلی. كە بە جۆری هەشتەم حسابی بۆ دەكرێت ئەویش ئەوەیە كە خەڵكانیك لە دیندارو بێدین و مولحید و خوانەناس بە عەمدەن و بێ ئاگاداربوونیان شەیتانەكان تووشیان دەكەن و ئەوە دەبیتە هۆكاری ئەو سیحرە سوفلییانە. ئەم جۆری سیحرە كە ئێستا زۆر بڵاوە لە جیهاندا، بەتەواوەتی دەچێتە بەردەستی شەیتانەكان و دەبێت ئیبلیس بەخوای خۆت بزانیت و كوفر بە هەرچی دینەكانە بیكەیت لە پێش هەموویانەوە ئیسلام و دوایی مەسیحی و ئینجا جولەكە.

ماكوان: جەنابی شــێخ ئەمانەی كە باســت كرد هەمووی لەســەرچاوەكانی ئەهلی ئیسلامدا هەیە واتا دڵنیای لەو ناوانەی كە فەرمووت.

بەرقان: بەدڵنیاییەوە مامۆســتا ماكوان هەمووی هەیە، دەتوانیت بگەڕێیتەوە بۆ ئەو ســەرچاوانەی باســمكردووە لە باســی ســیحرو هاروت و ماروت و دروستبوونی ئێمەی جنۆكە و ئەو باسانەی كە لە بیروباوەڕدا كراوە.

ماكوان: بەدڵنیاییەوە منیش سیقەم بە جەنابتانە، خۆشت باش دەزانی ئێمەی ئەهلی سوننەتو جەماعە لەسەربنەمای بەڵگە قسە وەردەگرین وایە؟

بەرقان: بەڵێ، هەر دەبێت وابێت.

ماكوان: ئەرێ شــێخ بەرقان ئێمە هەر دەڕۆین و ناگەینە ئەو باڵەخانەیە یان ئێمە وەســتاوین لەجێگای خۆمان؟ هەســت دەكەم ئەو باڵەخانەیە هەنگاوێكیش لێی نزیك نەبووینەتەوە؟

بەرقان: مەرج نییە هەموو باڵەخانەیەكی جوان مرۆڤ پێی بگات، گرنگە مرۆڤ بە مێشك و زانستی گەورەترین باڵەخانە دروست بكات. زۆر شت هەیە لای ئێمەی جن دەلالەتە لە پێگەیشــتن و ڕوشــدی ئەقڵ، كەی كامڵ بویت لە ڕوشد و زانستی شەرعی ئەوە دەتوانی دەرگای هەرچی باڵەخانەو قەڵایە بۆت بكرێتەوە.

تەماشــای ئاســمان بكە و چاو بنوقێنە بزانە لەكردنەوەیدا چەندە مەل و چۆلەكە دەبینی.

سەیری ئاسمانم کرد و چاوم نوقاند هەمان تەکانی جاری پێشووم خواردەوە کە هێنایانم بۆ لای شێخ بەرقان. کەچاوم کردەوە لە شاری سلێمانیم لای قوتابخانەی کاوە، هەر خۆم بووم بە تەنها.

سوپاسی خوای پەروەردگارم کرد، لە دڵی خۆمدا وتم بەس نییە لەسەر ئەم جادە جێیانهێشتم بیانخستمایەتە سەربانی ماڵێك لەوانە بوو (١٠٠١) شەقم بۆ تەواو بکەن! نەشم دەوێرا زۆر ئەملاولا بکەم ئەو ناوە قەرەباڵغ بوو لای گەڕەکی ئیسکان. تەلەفونەکەم لێیدا تەماشام کرد دایکمە.

دایکم: ڕۆڵە ئەوە لە کوێیت؟ بۆ ئەو تەلەفونە هەڵناگریت زیاد لە (١٠) تەلەفونم بۆ کردی هەر دەیوت لە دەرەوەی بازنەدایە.

ماکوان: لەماڵی شیخ بەرقان.

دایکم: لەهەولێری؟

ماکوان: نا

دایکم: ئەی ئەم شێخ بەرقان-ە کێیە؟

ماکوان: خەڵکی ئەولایە ئێستا دێمەوە بۆ ماڵەوە بۆ ئەوەی مەوزوعەکەی لەبیر بەرمەوە.

دایکم: میوانت هاتووە وەرەوە بۆ ماڵەوە چاوەڕێی تۆین.

ماکوان: وا هاتمەوە بە پشتیوانی خوا چەند خولەکێکی کە دەگەمەوە ماڵەوە لە نزیك توی مەلیکم.

گەیشــتمەوە ماڵەوە پێشــڕەو لەســەر قادرمەکان بوو جگەرەی دەکێشــا، لێم پرســـی کــاکە کێیە میوانەکـانمـان؟ وەڵامی دامەوە وتی: بەخوا لە خەڵکی شـــارەزوور دەچن، لەوانەیە داوای یـارمەتی بکەن. کە خۆم کرد بە ژووردا تەماشا دەکەم سەسیل و ئافرەتێك دانیشتوون.

# شەڕێکی ترسناك

کە لای شـێخ بەرقان گەڕامەوە دایکم تەلەفونی کرد کە زوو بگەڕێمەوە ماڵەوە میوانم هاتووە.

لەگەڵ پێشـــڕەو وەســـتابووم، دایکم هاتە لام و وتی: ئەو ژن و پیاوە دەمێکە چاوەڕێی تۆن، بڕۆ بۆلایان بزانە چیان دەوێت.

ماکوان: نەیان وت کێن و لە کوێوە هاتوون؟

دایکم: با، لە کەرکوکەوە هاتوون.

تەماشایەکی پێشڕەوم کرد وتی وا هەستم کردووە شارەزووری بن.

کەچوومە ژوورەوە سەسیل دانیشتووە لەتەنیشت ژنێکی بەتەمەن، سڵاوم کرد دایکیشـــم بەدوامدا هاتە ژوورەوە لەبەر دایکم هیچم نەوت، بەخێر هاتنی ژنەکەم کرد و زۆر گوێم نەدا بە ســەســیل. ئەویش بەگەرمی مەرحەبای کردم، دانیشـــتم و بێ دەنگی ژوورەکەی گرتبوو دایکم هەڵســا چوو چا و شــیرینی بهێنێت.

ماکوان: فەرموون، ئەمەی لەگەڵتایە سەسیل نییە؟

ناوی تۆ چییە خاتوون؟

ژنەكە وتی: من ناوم خورشیدە و ئەمەش شێخ ئەسعەدە خەڵكی قۆریەشكاوە. هاتووینەتە خزمەتی جەنابت بۆ ئەوەی بەڵكو - سەلاّحی كوڕم و ژنەكەی ئاشت بكەیتەوە (كێشای بەسەر دڵی خۆیدا) خوا بیباتەوە بۆ خۆی چۆن غەدری كردووە لە كوڕم، منداڵەكانی لێسەندۆتەوە، لە نەرویجیش شكاتی لێكردووە بەڵكو ڕێكیان بخەیتەوە. خێرت دەگاتێ كاكە ماكوان گیان، بەڵكو نوشتەیەك دوعایەكیش بۆ سەلاّحی كوڕم بكەیت دەڵێن تۆش دەم و نوفوزت باشە، بەڵكو ئەو ژنە لەگەڵ ئەو كوڕەم ڕێك بكەونەوە. شێخ ئەسعەدیش هاتووە لەگەڵمدا، خوا ماڵەكەی ئاوابكات زۆر هاوكاریم دەكات پیاوێكی موبارەكە لە كەركوكەوە هاتووە بۆلات بۆ ئەوەی بەخزمەتی جەنابت بگات.

ماكوان: ڕوومكردە سەسیل و وتم شیخ ئەسعەد تۆ دەڵێی چی؟ خورشید خان بەو باشییە باسی تۆ دەكات، ئەی دوعایەك شتێكی بۆ بۆ ناكەیت؟

شێخ ئەسعەد: كاك ماكوان منیش ناردویانم بۆلای جەنابت وتیان بەڕێزتان هاوكاری خەڵكی زۆر دەكەن، دوێنی لە ڕادیۆی رووداو و نەوا باسی جەنابتیان كرد كە هاوكاری ئافرەتێكت كردووە.

ماكوان: لەبەرچاومدا شێوەی دەمو چاوی شێخ ئەسعەد دەگۆڕا ، ڕوخساری لە سەسیل دەگۆڕا بۆ دەموچاوی كەسێكی تر، بەڵام نزیك بوو لە شێوەی سەسیل. لەخزمەتاندام قوربان ئیجازەم بدە ئێستا دێمەوە خزمەتت، هەڵسام چووم دەست و دەموچاوم بە صابون شۆردو دەستنوێژم گرت وتم نەكو ماندووبم، ئایەتەلكورسی و مەعوزەتیین و زۆرێكی تر لە دوعاكانم خوێند. شێخ ئەسعەد دانیشت بوو قسەی زلی دەكرد لەگەڵ دایكم و خورشیدخان دا. لەو ژورەدا نوێژم كرد كە ئەوانی لێبوون.

دایکم: ڕۆڵە خۆ هێشتا نیوەڕۆ نەبووە.

ماکوان: نوێژی چیشتەنگاو بوو، لە بیرم چووبوو بیکەم بە قەزا گێڕامەوە.

شێخ ئەسعەد: ئەی باوکەکەی باوکم، ئەم ئیسلامییانە دەڵێن نوێژ ناگەڕێتەوە تۆ کارێکی باش دەکەیت دەیگێڕیتەوە (نەیدەزانی من نوێژی سوونەتم گێڕاوەتەوە)!

ماکوان: شیخ ئەسعەد تۆ نوێژ دەگێڕیتەوە؟ زانیم فڕی بە نوێژەوە نییەو ئاگای لە نوێژ نییە.

شێخ ئەسعەد: ئەی چۆن نایگێڕمەوە باوکی من.

ماکوان: شێخ جەنابت لە بنەماڵەوە شێخن یان لەبەرماڵەوە؟

شێخ ئەسعەد: کاکە ماکوان ئێمە شێخی ئەصڵین، ئەولادی پێغەمبەرین (ﷺ).

ماکوان: جا کاك شێخ کوا پێغەمبەر (ﷺ) منداڵی هەبووە تا ئێوە لە نەوەی ئەو زاتە بن؟

شێخ ئەسعەد: نا کاکە ماکوان ئێمە دەچینەوە سەر حەسەن و حوسەین.

ماکوان: جا ئەوانە کوا دەچنەوە سەر پشتی پێغەمبەری خوا، ئەو دوو کچەزا بەڕێزەی پێغەمبەری خوا دەچنەوە سەر ئەبوتالیب و ئەویش کافرە ئیتر ئەوشێخایەتییە لە کوێوە سەرچاوەی گرتوە؟! زانیم جاهیلە زۆر بە ناشرینی قسەم لەگەڵ دەکرد، چونکە من گومانم هەبوو لە ٪۹۰ کە سەسیل بێت، بەڵام

هەرچیم دەکرد لەو مەتەڵە تێنەدەگەیشــتم. خەریك بوو تووشــی ئەعصــاب دەبووم، شــەرم و ترســم لە دایکم بوو، ئەگەر ئەو نەبوایە هەر کە چوومە ژوورەوە بە نیازی ئەوە بووم پەلاماری بدەم، دەمزانی دوایی دایکم دڵی لێم زویر دەبێت لە میوان تورەبم.

دایکم بانگی کردم لە ژوورەکە هەڵسام ڕۆیشتمە دەرەوە، بەتوورەییەوە وتی: ڕۆڵە ئەوە کێ فێری کردویت ئابەوشــێوە قســە لەگەڵ میوان بکەیت؟ ئەوانە ئەگەر دوژمنیش بن لە ماڵی باوکتدا دانیشتوون ئیحترامی باوکت و منیش بگرە، بۆ بەوشێوە قسە دەکەیت دەیانناسیت؟

ماکوان: نەوەڵا بەس هەست دەکەم ساختە چین.

دایکم: بە هەســتی تۆ نابێت، داوای هیچیان نەکردووە، لە ماڵی دنیا داوای یارمەتی دەکەن لێت یان بەڵێ - یان نەخێر تۆ حەقت چیە بەسەر شێخ و ئەم هەموو پرسیارە لە پیاوە دەکەیت، عەیبە ڕۆڵە لەماڵەکەماندان.

ماکوان: باشــە، چوومە ژوورەوە لەبەر خاتری دایکم دەســتم کرد بە پێکەنین و ڕوومکردەوە خورشــەخان، چی بە من بکرێت لەخزمەتاندام، کاك شــێخیش خۆشەویستی هەمووانە.

دایکم هاتە ژوورەوە وتی ئەوە بۆ عەزێتان کێشــاوە ئەو هەموو هەنگوینەتان هێناوە، پێویســتی بەو عەزێتە نەبوو. کە دایکم وای وت هەڵســـام چوومە دەرەوە، زانیم ئەو هەنگوینە سـیحری تێدایە و هەنگوین نییە چەواشــەکارییە، دوای ماوەیەکی کەم دایکم قسـەی لەگەڵ خورشـید خان دەکرد بانگم کرد وتم وەرە تەلەفونە. دایکم هات و پرسیم کوا ئەو شتانەی هێناویانە؟

خستومەتە ناو تاکی کەوانتەرەکە، ئەگەر دەیخۆیت بۆت بکەمە ناوقاپێك؟

ماکوان: دایکە بیکە بەخاتری خوا کەس لەو شتانە نەخوات، زۆر خەتەرە.

دایکم: چی بووە ڕۆڵە، ئەمانە کێن؟

ماکوان: نازانم؛ بەڵام لەو تاکەدا دایبنێ تا- دەڕۆن نەهێڵیت کەس بیخوات باشە؟!

دایکم: باشە بێخەمبە.

هاتمەوە بۆلای میوانەکان پرسیم خورشەخانم من چی بکەم بۆ کاك سەڵاح و ڕوناك خانی هاوسەری؟ چۆن زانیت من پەیوەندیم لەگەڵ ئەوان هەیە؟

خورشەخانم: ڕۆڵە وەڵڵا ڕۆشنای کچی پێی وتم، کوڕ و کۆبوونەوەکانتایان لە شاری هەڵەبجە بینیبوو باسی تۆی بۆ کردم، وتی کاك ماکوان دەتوانێت هاوکاری دایکم و باوکم بکات، بۆ ئەوەی بچنەوە لای یەکتر.

ماکوان: بەسەر چاو بەیەك مەرج ئەوەی من دەمەوێت لە جەنابت بیکەیت و بەقسەم بکەیت.

خورشەخانم: بەسەر چاوەکەم کاکە ماکوان گیان تۆ چی بڵێیت من وا دەکەم.

ماکوان: هەرچی نوشتەو دوعات بۆ کراوە بۆم بهێنیت و لای کێ کردوتە کێ بۆی کردویت هەموویم بەڕاستی پێبڵێیت، باشە؟ منیش دێم بۆ کەرکوك بۆ خزمەتتان قوبوڵتە؟

خورشەخان: وەڵڵا کوڕەکەی خۆم تۆ چی بڵێیت بەقسەت دەکەم.

شێخ ئەسعەد: کاك ماکوان وەرە بۆ تەکییەکەی ئێمەش لەوێ لە حەلەقەیەکی زیکردا بەشداربە زۆر سوودی دەبێت، گەورەمان دەکەیت بێیتە تەکییەکەمان لە کەرکوك.

ماکوان: خۆتان گەورەو بەڕێزن کاك شێخ گیان.

سنگم خەریك بوو ئەتەقی لەگەڵیاندا دانیشتبووم ئەوەندە دانیشتنێکی ناخۆش و بێزارکەر بوو، سروشتی خۆم وایە کە مەجلیسم پێخۆش نەبێت، زۆر بێتاقەت دەبم کە قسەشم پێبکەن وەك ئەوە وایە بە شەق قسەم پێبکەن.

باش بوو ڕۆیشتن هەرچەندە دایکم زۆر خولقی گەرمی کردن کە بمێننەوە، دایکم ماڵی ئاوابێت هەر نەیدەهێشت بڕۆن. هەستم بەوە کردبوو کە ئەوانە شەیتانی دنیایان پێوەیە.

مێشکم ماندوو بوو خۆم کردە ناو جێگا خەوم لێکەوت، پاش تێپەڕ بوونی چەند ڕۆژێك لە هاتنی ئەوان چووم بۆ کتێبخانەی سەرمەد بۆلای کاك عەبدوسەلام بۆ ئەو سەرچاوانەی کە شێخ بەرقان باسی کرد، لەوێ هەندێکیم دەستکەوت هەندێکیش لە ئینتەرنێت تەماشام کرد هەمووی ڕاستە، بەڵام ئەوەی بۆم شیتەڵ نەدەکرا شێخ ئەسعەد و ڕوخساری سەسیل بوو

بەقەدەر هەموو ئەم جیهانە پێویستم بە عەلی یەمەنییە و ئەویش لە جێگای حەقی خۆیدایە، ماندووم زۆریش ماندووم لەو هەموو ڕووداوە سەیرو سەمەرانەی کە دەیبینم.

هەمووی جێگای باسە لە خۆم ئەترسم تووشی وەهم بووبم، ئەترسم لەناو دنیای سیحردا بم ئاگام لە خۆم نەبێت، تاكە دڵخۆشیم ئەوە بوو كە سوپاسی خوام دەكردو دینداری و ئیمانم بەهێزەو بیركردنەوەشم زۆر بەهێزەو ڕووداوەكانی پێشووترم لە منداڵییەوە دەهێنایەوە مێشكم تا ئەوكاتەی بێداربووم بۆ ئەوەی بزانم دەتوانم زاكیرەو فیكرو تواناكانی بیركردنەوەم بجوڵێنم.

چونكە هەر كەسێك جنۆكە لەلاشەیدا بێت ناتوانێت بیركردنەوەی ڕێك بخات، قسەی حەلەق و پەلەق دەكات و توانای ڕەبتی باسەكانی نییە بەیەكەوە، من ڕۆژانە كۆڕم هەبوو لە هەڵەبجەو خۆرماڵ و سلێمانی و هەولێرو كۆیە، هیچ خەوێكی ناخۆش نابینم، بەڵكو هەر خەو نابینم. چونكە ئەوەندە ماندوو دەبووم كە سەرم دەكردە سەر سەرین یەكسەر خەوم لێدەكەوت، دەشمزانی ئەوكەسانەی كە سیحریان لێكراوە خەوی ناخۆش زۆر دەبینن و تەنانەت لە كاتی خەودا چەندجار ڕادەپەڕن، من كاتژمێرێك و تەلەفونێكم لەسەر زەنگ دادەنا بۆ نوێژی بەیانی ئینجا خەبەرم نەدەبووەوە تا دایكم لەخەو هەڵیدەساندم.

بەهەمووشێوەیەك لە نیشانەكانی سیحرو جنۆكە لەلاشەدا بوون دوور بووم ، خواردنیشم باش بوو بەیانیان بەقەدەر دووكەس نان و چایم دەخوارد، چونكە من خۆم لادێیم زۆر حەزم لە كەبابە ڕۆژانە دەچووم بۆ كەباب خواردن و ئیتر لەماڵیشەوە هەر دەمخوارد.

هیچ شوێنێكم ئازاری نەبوو وە لە بەندایەتیدا تەمەڵ نەبووم، حەزم بەدینداری بوو، كاتی ئەوەم نەبوو گوێ لە گۆرانی و مۆسیقاو ئەوشتانە بگرم و ئولفەتی پێوە بگرم.

ئاسایی بوو لەلام گوێ لە موسیقاو دەنگە خۆشەكانی وەك هێمن پێنجوینی و بیلال كەیوانی و شەهرام و..هتد بگرم، بەڵام زۆر بەكەمی گوێم بۆ دەگرتن.

لەولایشەوە مێشكم پڕبوو بوو لە قسەكانی شێخ بەرقان، قسەكانی زۆر جوانو لۆژیكی بوون زوو دەچووە دڵەوە لە هەمانكاتدا ئیمانی وشـــەرعی بوو، دوای ئەوەش بیرم لەوە دەكردەوە ئەمەوێت بچمەوە لایان و دنیایەك كارم پێیانە، هەمووی هەفتەیەكم ماوە لە كوردســـتان دەبێت بگەڕێمەوە بۆ نەرویج، ئەو جێگایەی كە بۆی چووم كوێ بوو؟

بۆ منیان نەبردە باڵەخانە كە؟

دنیایەك پرسیار لە مێشكمدایە، لە هەمووی سەیرتر قسەی ناڕاستم لە حەزقیل و حەنانە و ڕاقی بیستووە.

ئێوارەیەك لە بازاڕەوە دەگەڕامەوە چەند كوڕێكی بەڕێزم لەگەڵدابوون، بەرەو جادەی پیرەمێرد دەڕۆیشـــتین جێگایەكیان نیشـــان ئەدام كە گوایە چاپی زۆر هەرزانە، لەڕێگا حەزقیل و ڕاقیم بینی تەماشـــا دەكەم بەوبەری جادەكەوە پیاسە دەكەن.

منیش ئۆتۆماتیكی ئاگام لە خۆم نەماو هاوارم كرد حەزقیل، ڕاقی.

ئەو كوڕانەی لەگەڵمدا بوون دەســـتیان كرد بە پێكەنین و وتیان كاك ماكوان مەگەر حەزقیل نەمردووە؟ خۆ تۆ لە مەملەكەتی شـــەیتان دەڵێیت حەزقیل مردووە و كوشتوویانە!

منیش هاتمەوە سـەرخۆم و دەسـتم كرد بە پێكەنین و وتم: بەو كوڕەی ڕەفیقم دەڵێم حەزقیل ئاگای لێمان نەبوو ڕۆیشت.

ئاوڕێكیشیان لێنەدامەوە، بەڵام چاوم لە سەریانە. داوای ئیزنم كرد لەو كوڕانەی هاوڕێم وتم ئێوە بڕۆن وردە وردە من پێویســـتم بەو هاوڕێیەمە دەگەڕێمەوە لاتان. یەكێك لە كوڕەكان ناوی كاك ئالان بووبە پێكەنینەوە وتی دەچیت بۆ لای حەزقیل؟

پێكەنیمەوە وەڵامم داوە بەڵێ، مامە ئالان گیان ئێستا دێمەوە خزمەتتان.

چوومە جادەی ئەوبەر ئێوارانی ســـلێمانیش قەرەباڵغە بەتایبەت ئەو جادەیە، هەرچەند بەپەلە ڕۆیشتم لێم ون بوون بۆم نەدۆزرانەوە.

زۆر بێزار بووم چوومەوە بۆ لای هاوڕێكانم، چووینە چاپخانەكەو دوای ئەوەی كارەكەمان تەواوكردو جیابووینەوە، منیش تەكســـیەكم گرت بەرەو ماڵەوە لە ترافیكی پەیكەرە كۆنەكەی كاوەی ئاسـنگەر بە بەری ئیبراهیم پاشـاوە دیسـان حەزە و ڕاقی-م بینی. بە ســـایەق تەكســـییەكەم وت لەوبەر دادەبەزم خێرا دابەزیم و چووم بۆ لای حەزقیل و ڕاقی.

ماكوان: ئەرێ بەڕاست ئێوە بۆ لە بازاڕ وادەكەن بۆ خۆتان ون كرد؟

ڕاقی: ئێماڵت ئاوابێت لە سلێمانی لەناو ئەو خەڵکەدا ئێمەت لەگەڵ بووینایە و بۆ ئێمە قسـەت بکردایە، خۆ هەرچی خەڵکی لەویا بوون دەکەوتنە شـوێنت و دەیانوت ماکوان کەریم شێت بووە بۆ خۆی قسە دەکات!

لێرەوە وەرە بە ئارەزووی خۆت قسـە بکەین و بە پیاسـە لەم کۆڵانانەوە سـەر دەکەوین، بەڵام با تەلەفونەکەت بەدەسـتەوە بێت هەر کۆڵانێك خەڵکی زۆر تێدابوو قسە بۆ تەلەفونەکەت بکە، ئیتر کەس هەستت پێناکات!

حەزقیل: ماکوان چۆنی؟ شێخ بەرقان بەلاتەوە چۆن بوو ؟

ماکوان: بیرم کەوتەوە، حەنانە کچی شێخ بەرقانە؟

ڕاقی: نا - وەك کچی وایە، چونکە دایکی حەنانە-ی موسـوڵمان کردووە ئەوی هێناوە. حەنانە کچی کەسـێکی ترە، بەڵام دایکی حەنانە خێزانی شـێخ بەرقانە ئەویش فێری زانستی شەرعی کردووە.

ماکوان: پێویسـتە بگەڕێمەوە بۆلای شـێخ بەرقان کاری زۆرم پێیەتی، چۆن بگەڕێینەوە بۆلای؟

حەزقیل: ئەوە بەدەسـت ئێمە نییە، تا شـێخ خۆی ڕێگەمان پێنەدات ناتوانین، بەڵام بۆ شتێك هاتووم بۆلات بۆ ئەوەی بۆت ڕوون بکەمەوە.

ماکوان: خێر حەزەگیان؟

حەزقیل: کە خۆت کرد بەماڵی خۆتاندا شێخ ئەسعەدت بینی ڕوخساری لە کێ دەچوو؟

ماکوان: سەسیل

حەزقیل: جوان بیر بکەرەوە، کاتیك لە ماڵی مام موستەفا بووین لە نەرویج کە تۆ لەگەڵ هێرۆ و ئازیزو دواتر عەلی یەمەنی دانیشتبوویت، خوا لە هەموویان خۆش بیت کە مردوون، تەمەنی ئازیزیش درێژ بیت، کە باوکی هاتە ژوورەوە ڕوخساری لە کێ دەچوو؟

ماکوان: لە تۆ.

حەزقیل: ئەی ئافەرین، کەواتە کاریگەری شەیتانەکانی لەسەرە و شەیتان بەئارەزوی خۆی یاری پێدەکات، تێگەیشتی؟

ماکوان: ئەی رەحمەتت لێبێت وەڵاهی ڕاست دەکەیت، ئێستا تێگەیشتم.

ڕاقی: جا ماکوان گیان ئێستا بۆ ئەوە هاتین...

لەپڕ حەنانە هات و وتی سەیارەیەك دێت ماکوان هەڵدەگرێت.

کە ئاوڕمداوە کوڕێکی ئامۆزام بوو، وتی کاکە سەرکەوە بۆ بەتەنها ئاوا دەگەڕێیت؟!

سڵاوم لێکردو سواری سەیارەکەی بووم جەماعەتیش نەمان، هاتمە ماڵەوە ٣ ڕۆژم ماوە بۆ گەڕانەوە دایکیشم دەڵێت ناچی بۆ ماڵی ئەوژنە بۆ کەرکوك ؟ لەڕاستیدا حەزم بە ڕۆیشتن نییە و دەڵێم ئیشەکەی ئەوان لە نەرویج حەل دەکرێت.

دایکم: ئەرێ ڕۆڵە ئەو هەنگوین و شتانەی هێناویانە چی لێکەم؟

ماکوان: بێجگە هەنگوین شتی تر چییە؟

دایکم: تۆزێك بنێشتی کوردی و گەزۆی سەوزەی خواییە.

ماکوان: دایە گیان بێزەحمەت لەکوێدایە؟ شـوێنەکەی نیشـاندام و هەموویم فڕێدا.

دایکم: بەخوا لە تۆ تێناگەم نازانم بۆ ئەو شتانەت فڕێدا؟

لەو قسـانەدا بووین خورشـەخانم پەیوەندی کرد وتی: کاك ماکوان گیان کەی دێیت بۆ ماڵمان؟

عەرزمکرد بەخوا کاتم نەماوە، إنشـاءالله بۆ کاتێکی تر دێمە خزمەتتان، سـێ ڕۆژی تر دەگەڕێمەوە بۆ نەرویج و بەخوا سەیارەشم نییە بێم.

وتی: جـا ڕۆڵە گیـان سـەلاحی کوڕم دەنێرم بێتە خزمەتـت بـت هێنیـت و بشـتباتەوە. ڕۆڵە هەر پێم خۆشـە نانێك لە ماڵەکەماندا بخۆیت و دایکی جەنابیشتان بێنن ئامینە خانم، بەخوا بە قەدەر خوشکێکی خۆم خۆشم دەوێت دڵم پێی دەکرێتەوە.

ماکوان: بەسـەر چاو دێمە خزمەتتان، بەیانی دێم لەگەڵ کاك پێشـڕەوی برام لەخزمەتتاندا دەبم پێویسـت ناکات کاك سـەلاح بێت خۆمان بەسـەیارەی کرێ دێین.

دایکیشم وتی منیش دێم.

ماکوان: نا - مەیە تۆ ماندوو دەبیت و کەرکوك خەتەرە نەکو تەقینەوە رووبدات.

دایکم: جا کەوایە ئێوەش مەڕۆن.

ماکوان: ناچارم ئەوەندەی وت وەرە لەبەر دڵی ئەو دەڕۆم، هەرچۆن بوو قەناعەتم کرد بە دایکم کە نەیەت، چونکە نامەوێت دایکم هاوڕێیەتی ئەو ژنە بکات. دەزانم خراپەو خەریکی جادو و سیحرە بە بێ ئەوەی بە خۆی بزانێت.

## ماڵی خورشیدخان و شێخ ئەسعەد دیدێکی نوێ

دوای تەلەفونەکەی خورشـــیـدخـان، تەلەفونم کرد بۆ برایمی رەفیقم وتم تاقەتت هەیە بەیەکەوە بۆ کەرکوك بڕۆین ؟

برایم: لەخزمەتدام بەیانی نانی گەرمیش دێنم بەیەکەوە نان دەخۆین، یان وەرە بۆلای ئارام بەیەکەوە لەوێ نان بخۆین.

ماکوان: بەیانی مەلا بانگدان نـاڕۆین خۆ کەرکوك پاریس نییە دوور بێت، بەکاتژمێریك دەگەین دەونیوی بەیانی دەچین وەرە نیوەڕۆ دەعوتین لەماڵێك زۆر مەخۆ بەیەکەوە دەچین نانێك دەخۆین و دێینەوە باشە برا؟

برایم: باشە بەیانی دێم بەشوێنتا.

پێشڕەو: کاکە من نەیەم؟

ماکوان: نا پێویســـت ناکات لە دوکان بە، برایمم لەگەڵدایە، دایکم حەزی دەکرد بێت.

وتم دایکشـــم نابەم ئەمە یەکەم جارە جارێ تر کە هاتمەوە دەچین، ئێســـتا بزانم ئەم ماڵە چین و چۆنن.

تەلەفونم کردەوە بۆ ماڵی خورشەخان و عەرزیم کرد کە کاك سەڵاح نەنێرێت بەیانی خۆم دەچمە خزمەتیان و هەر بە تەلەفون تەعاروفێکمان کرد لەگەڵ کاك سەڵاح و ناونیشان و گەڕەکەکەیانم وەرگرت لێی.

ئەوەشـــم پێ ڕاگەیاندن کەوا بەیانی دەوربەری کاتژمێر دوانزە بۆ یەك بە پشتیوانی خوا دەگەینە خزمەتتان.

ئەوانیش خۆشحاڵی خۆیان دەربڕی.

بەیانی برایم هات بەشـوێنماندا‌و دایکم هەندێك دیاری بۆ پێچامەوە بۆ ماڵی خورشەخان و خستمە پشتی سەیارەکەی برایم، تەماشا دەکەم بیکەیسیەك و کلاشینکۆفێك و پڕە لە فیشەك.

ماکوان: برا ناچین بۆ جەبهە دەچین بۆ میوانی!

برایم: ئەی ئەگەر تووشی شەڕبووین، با هەرشتێکمان پێبێت.

ماکوان: برایم بیکە بە خاتری خوا لە ســەیتەرەکاندا داماندەبەزێنن، من خۆم وەزعم زۆر باش نییە دارو دنیا لێم بە بیانووە لایبە ئەم چەکانە، دەمانچەیەکم پێیە و تۆش دەمانچەکەی خۆت بێنەو تەواو.

برایم: کاکە خەمت نەبێت من خۆم لە هێزەکانی ٧٠م هەموو چەکەکان ڕێگە پێدراوە.

توڕە بووم، وتم ئەگەر بگیرێین دەڵێم من بەکرێ ســەرکەتووم، دەلایبە بیبە ماڵی ئێمە تا دێینەوە.

برایم: وەڵلا دەیهێنم بیشــگیرێم دەڵێم من حیمایەی خەسرەوم و ئەوە مەسولەکەمەو سەیتەرەکەشت بۆ چەک دەکەم!

بەهەرحاڵ بەقســەی نەکردم بەرەو کەرکوك چووین لەبازگەی تاســڵوجە وەســتاندینیان خوای گەورە ڕەحمی کرد ڕەفیقێکی خۆی لێبوو کردیان بە هاتوو هاوارێك ئاسایشەکە، وتی کاکە بڕۆن.

دیار بوو ترســیشــی نەبوو ئەوانە هەموو ڕێگا پێدراو بوون، چونکە ١٥ ڕۆژ جارێك دەچوو بۆ دەوام.

گەیشتینە کەرکوك چووینە ماڵی خورشەخان و کاك سەڵاح هات بەدەممانەوە ودەموچاوی بەلامەوە ڕۆشــنا بوو و ڕێزێکی زۆری لێگرتین و لەگەڵ کاك ســەڵاح دەســتمان کرد بە قســەکردن لە کوێ ژیاویت و چۆن لە نەرویج ئیقامەت وەرگرتووە؟ هەنــدێــك موجــاملەی یەکتریمان کرد، دوای ئەوەی یەکترمان ناسیەوە کە لەیەك ساڵدا خۆمان تەسلیم کردبوو لە وڵاتی نەرویج و لە کەمپی مۆقەت بووین، بەڵام لەبەر قەرەباڵغی و زوو جیابونەوەمان بیرمان چووبوەوە.

دەســتکرا بە نان خواردن تەنها منو کاك ســەڵاح و برایم بووین لەســەر سفرەکە.

ماکوان: ئەی خورشەخان کوانێ؟

سەڵاح: کاك ماکوان ئەو نایەت لەگەڵمان نان ناخوات.

ماکوان: بۆ؟

سەڵاح: نەزری كردووە كە تا ٤٠ رۆژ لەگەڵ كۆمەڵە سەگێك لەو كەلاوەیەدان لەگەڵ ئەو سەگانە نان بخوات.

ماكوان: بۆ خاتری خوا بانگی بكە.

خورشـــەخان هات و عەرزم كرد ئەوەی دەیكەیت لە دیندا جێگای نابێتەوە، بیكە بە خاتری خوا، نان نەخۆیت لەگەڵماندا منیش نان ناخۆم، ئەوكارەی تۆ جائیز نییە لە ئیسلامدا جێگای نابێتەوە، ئەمە كێ پێی وتویت وا بكەیت؟

خورشـــەخان: مامۆســـتا ماكوان گیان ئەوە ئەو شـــێخە بەڕێزانە فەرموویانە، بەڵكو سەڵاح گیان چاك بێتەوە لەگەڵ ئەو ژنەی دا.

ماكوان: وەڵاهی خورشـــەخان من لەمماڵەدا نان ناخۆم هەتا تۆ لەگەڵ ئێمە دانەنیشت و نانەكەت نەخۆیت و ئەونەزرە نەشكێنیت. ئەوە نەزری ئیسلام نییە ئەوە نەزری شـــەیتانە، ئەوەی پێی وتوی ســـاختەچی و درۆزنە، هیچ كەسـێك بە نان خواردنی لەگەڵ ســـەگدا دڵی شـــكاوی كەســـی بۆ نانرێتەوە بەیەكەوە. تۆ ئەگەر بەقســـەی كوڕی خۆت بكەیت من كارەكەت بۆ دەكەم، بە پشتیوانی خوا!

خورشەخان: ئاخر دەترسم ئازارو عەزێت بگەیەنن بە سەڵاحی كوڕم.

دوایی لەقســـەكانیدا بۆم دەركەوت كە ئەم ژنە خاوەنی دوو كوڕی تر بووە بێجگە لە كاك ســـەڵاح هەردووكیان لەكەركوك بەدەســـتی رژێمی ئەفلەقی بەعســـی كوژراون، ئەوەندە خەفەتی خواردووە نەیویســـتوە ئەم كوڕەشـــی لەدەست بچێت، بۆیە پەنای بردووە بۆ ئەم ساحیر و جادو بازانە.

هەرچۆن بوو نەزرەکەم پێشکاند، بەڵام نەیدەوێرا نان بخوات. برنجم بۆ کردە ناوقاپ و ماشاء الله چێشت و نانێکی زۆر جوانی دروست کردبوو کەرکویش ناسراون بە خواردنی خۆش، مریشك و گۆشتم دەخستە بەردەستی هەر دەم وت بخۆ بڵێ بسم الله، سبحان الله.

ئەو ژنەم نەدی بڵێ بسـم الله، چەندجار وتم خورشـید خان بڵێ بسـم الله سـونەتە بڵێ بسـم الله هەر نەی وت. نەمویسـت زەختی لێبکەم دەترسـام پەشـیمان بێتەوە. دوای نانخواردن چووم دەسـتم شـۆردو دەسـتنوێژم گرت تەماشـام کرد لەماڵەکەیاندا کەس نوێژ ناکات تەنانەت خورشـەخانیش نوێژ ناکات.

من و برایم نوێژمان کردو دوای ئەوە چای هێنا و دەسـتمان کرد بە قسـە، بۆ ئەوەی زۆر سـوود لە کات وەربگرم راسـتەوخۆ چوومە ناو مەوزوعەکەوە بە کاك سـەلاحم وت: براکەی خۆم هیوام وایە گوێم بۆ بگریت، هەر ئەم جارە قسـەت بۆ دەکەم بەقسـەت کردم باشـە بەقسـەت نەکردم دوایی هاوکاریت ناکەم، سـوێند بەخالقی گەورە تەنها وەفای ئەوەم بۆت دەبێت کەیەکجار لەماڵی جەنابتاندا نانم خواردوە. با دایکی بەڕێزیشـت دابنیشێت، ڕووم کردە دایکی و وتم ماڵی ئێوە کانی شەیتان و جنۆکە یە. ئەشێت بڕوا بە من نەکەن، بەڵام دووشتتان بۆ باس دەکەم بۆ ئەوەی باش بزانن کە لەخۆوە قسە ناکەم.

خورشـەخان باش گوێبگرە، نە خێزانی کاك سـەلاحی لێیە نە کەس بەس خۆمانین، بەخوای پەروەردگار قەسـەم هەموو تۆ هۆکاری جیابوونەوەی بوکەکەت و کوڕەکەتی، ئەوان هاتبوونەوە بۆ ئێرە کە لەگەڵ تۆ بژین، کەچی تۆ ماڵی کوڕەکەت و بووکەکەت وێران کرد.

تۆ بەبێ ئەوەی بە خۆت بزانیت ئەم ماڵەت پڕ كردووە لە جنۆكەو شـــەیتان تۆ وەعدت بە مندا كە هەرچی دوعاو نوشتەیە بیهێنیت نیشانی منی بدەیت وایە خورشەخانم؟

خورشەخان: بەڵێ وایە.

ماكوان: دەبڕۆ بیهێنە بزانە چەند ســحرو جادووتان لێكراوە بەبێ ئەوەی بە خۆتان بزانن.

ڕۆیشـــت بۆم بهێنێت قســـەم لەگەڵ كاك ســـەلاح كرد و پێم وت: كاكە خۆ سوپاس بۆ خوا تۆ موئمینی؟

ســـەلاح: وەڵاهی كاك ماكوان من ئیماندارم بەس لە تەمەنی نوێژو شـــتی وا ناكەم، كەسـیش نەبووە هیچم پێ بڵێتم، ئیتر هەروا ڕاهاتووم دەنا من بۆخۆم كەسێكی باوەڕدارم بە خوا، بە ئیسلام و ڕێزی دین لەسەر سەرو سەرچاومە.

ماكوان: براكەم دەســـت بكە بەنوێژو ڕووژو و تاعەت و عیبادەتەكانت، ئاخر وانابێت تەمەنت وا لەسەرو پەنجا ساڵە وەیت، تۆ لە ژیانتا سوجدەیەكت بۆ خوا نەبردوە ئیتر خوا چۆن فریات دەكەوێت.

سەڵاح: بەخوا زۆر دڵم پاكەو باشەو خێرو خێرات زۆر دەكەم.

ماكوان: بەخوا براكەم دڵێكی باش نویژ بۆ خوا دەكات، دڵی پاك ســـوجدە بۆخوا دەبات، دڵی ســـاغ خێرو خێرات دەكات. تۆ خێروخێراتـت كردووە بەزەییت بە خەڵكدا هاتۆتەوە ویژدان جوڵاندویتی نەك خواناسی و بەهەشت و جەهەنم. ئەمەش بۆ قیامەتت هیچ كاریگەری نییە.

لەم قسانە دابووین خورشەخانم عەلاگەیەك نوشتەو جادوو سیحری خستە بەردەستم.

وامزانی بایەعی وەرگرتوە! پرسیم ئەمە چیە خورشەخان؟

خورشەخان: وەڵلا رۆڵە ئەوە هەموو بۆ سەڵاح گیان و منداڵەکانی سەڵاحم کردووە خوا بیان پارێزێت لە چاونوفوز!

ماکوان: دەستم کرد بەکردنەوەی هەندێکیان، سوبحان الله سیحر بەدوای سیحردا دەمکردەوە هەموو قسە بەخوا و پێغەمبەر و قورئان و جادوو بازی بوو. نیشانمدان وتم ئەمە هەمووی سیحرە، لە حەوشەکەیاندا دەیان سیحرو جادووی ترمان دەرهێنا کە هەمووی لە رێگای شەیتان و جنۆکەکانەوە کراوە.

هەرچۆن بوو دەمویست ئەوە بگەیەنمە خورشید خان ئەمانەی کە کراوە هیچی بۆ خوا نەبووە هەموو کارکردن بووە بۆ شەیتان.

نەمدەزانی چۆن ئەو باسە بکەمەوە، چونکە زۆر قورسبوو بۆ من لەوکاتەدا، نەم دەزانی بە چ شێوازێك خورشەخان تێبگەیەنم ئەمە کوفرە و زۆر ترسناکە. ئەو ماوەیەکی زۆربوو لەگەڵ ئەم ساحیرانەدا تێکەڵ بوبو بە پیاوچاکی دەزانین!

نمونەی گوێدرێژەکەی - شێخ خواجە جوحام - هێنایەوە لەگەڵ شێخەکەیدا، خواجە جوحا ماوەی چەند ساڵێك بوو لە مەرقەدی شێخێکدا خزمەتی دەکرد، کوڕی شێخەکە ناوی جەبار بوو ناسرابوو بە شێخ نەجمەدین.

دەستم کرد بە گێڕانەوەی ئەو چیرۆکە بۆ خورشەخان و کاك سەڵاح و برایم.

عەرزمکردن؛ کە خواجە جوحا داوای ئەو گوێدرێژە دەکات لە شێخەکەی کە ڕۆژانە ئاودێنێت بۆ مەرقەدی باوکی شێخ نەجمەدین، دەڵێت سەفەرێکی کورتم لە پێشە با ئەو گوێدرێژە بەرم لەگەڵ خۆمداو بە قەرز دەیبەم و دەیهێنمەوە. شێخ ڕازی دەبێت بەو پێیەی خواجە جوحا دەمێکە خزمەتکاری خۆی و مەرقەدەکەی باوکێتی.

خواجە دەکەوێتە ڕێ لەڕێگادا قەدەری خوای پەروەردگار وادەبێت گوێدرێژەکە دەتۆپێت، خواجە زۆری پێناخۆش دەبێت، چونکە گوێدرێژەکەی شێخە هێناویەتی بەقەرز ئیحترامەن بۆ گوێدرێژی شێخەکەی قەبرێکی بۆ هەڵدەکەنێت و گوێدرێژەکەی تێدەخات. خەڵکی خواجە جوحا دەناسن کە لەو مەرقەدە خزمەتکاربووە، بەدیار ئەم قەبری گوێدرێژەوە دەمێنیتەوە خەڵکی دێن بۆلای و پارەی زۆر لەسەر قەبەری گوێدرێژەکە دادەنێن و تا وای لێدێت خواجە زۆر دەوڵەمەند دەبێت و دەبێتە خاوەن پارەو کەپرو چواردەوری قەبری گویدرێژەکە دەکات بە مەرقەد و ئیتر ئیشی خۆیەتی باشی لێدەزانیت.

شێخە کۆنەکەی پێی دەزانێت و بانگی دەکات، دەڵێت من گوێدریژێکم دایتێ پێی بڕۆیت و بێیتەوە ئێستا ئەم شێخە کێیە ئاوا بوویتە خزمەتکاری، خواجەش دەڵێت: قوربان ئەگەر لێم خۆشبیت و لێم ڕازی بیت ئەوا ڕاستییەکە دەڵێم، ئەویش ئەوەیە کە ئەو مەرقەدە گوێدرێژەکەیە کە تۆپیوە لەوێدا ناشتومەو خەڵکی دێن بۆ زیارەتی، ئەوە هەموو چیرۆکەکەیە لەترسی جەنابت نەمتوانی بێمەوە بۆ ئێرەو لەوێدا مامەوە.

شـــێخ نەجمەدینیش دەڵێت زۆر باشـــە بڕۆرەوە بۆ جێگای خۆت و لەوێ خەریکی ئەو کارە بە بەس باکەس نەزانێت و پارەکەی بەشـــەریکی، چونکە شێخ دەیزانی سوودو قانزاجی چۆنە دەیکات بەشەریك!

خواجە جوحا پرســـیاری لێدەکات و دەڵێت: ئاخر باوکی جەنابت لە قەبرەکە لێمان تورە نابێت؟

شێخ نەجمەدین دەڵێت: ئەوەی کە لە قەبرەکەدا مردووە باوکی گوێدرێژەکەی لای تۆیە!

جـا دیـارە ئەو گوێـدرێژانە بە خـانەوادە خێرو بەرەکەت بوون بۆ شـــیخ نەجمەدین و خواجە جوحا.

ئەوەشـی بۆم باس کردن بەداخەوە زۆر ڕاستیەو لە مێژووی مسـوڵمانان تۆمار کراوە و لە وڵاتی تورکیا ڕوویداوە.

جا خورشـــەخانم ئەوکەســـانەی کارەکانیان بۆ تۆ کردووە هەندێکی لەو جۆرە شێخانە بوون، هەندێکی تریشیان فڕیان بە ئیسلام و خواناسی و دیندارییەوە نییە کافری موطلەقن.

ماڵی خۆت و کوڕەکەت و بوکەکەشت وێران کردووە سیحرو جادوو لەوانیش و لە خۆشت و لە ماڵومنداڵی کردووە.

جا - ئیجازەم بدە هەموو ســـیحرەکان بەتاڵ بکەمەوە و هەموو شـــتەکان کۆتایی دێت و فێریشـــت دەکەم چۆن ماڵەکەت پاك بکەیتەوە لەو ســـیحرو جادووانەی کە کردوتە، ئیتر تەوبە بکەو خواناس بەو تەمەنت بەشـــی ئەوەی

پێوەنەماوە هیوام وایە بەقســەم بکەیـت، چونکە من کـاتی زۆرم نەمـاوە لەگەڵتاندا بیبەمە سەر تکام وایە کاك سەڵاحیش بەقسەم بکات.

پێش هەموو شتێك تەلەفون بکات بۆ خێزانی و لەگەڵیدا ئاشت ببێتەوە ئەوە باشترین چارەسەرە لە جیاتی ئەوەی پەنا بەرن بۆ سیحرو جادوو، خۆتان ئەو کارە بکەن برای خۆم.

سەڵاح: ئاخر من تەڵاقم داوە.

ماکوان: چۆن تەڵاقت داوە؟

ســەڵاح: وتم ئەگەر بڕۆیتەوە بۆ نەرویج ژنی من نیت، ئەویش بەدزی منەوە چووە بۆ نەرویج منداڵەکانیشی لە ڕێگای پۆلیسی نەرویجیەوە لێبردووم.

ماکوان: بەڵێ ئاگادارم، بێجگە لەو قسەیە هیچی ترت وتوە؟

سەڵاح: نا، هیچی ترم نەوتووە.

ماکوان: دەتوانیت بچیتەوە لای و ژیان پێك بهێننەوە ئاســاییە، دوو تەڵاقت ماوە، ئەگەر تەڵاقەکەی یەکەمیشــت بیدعی نەبێت واتا معلەق -. لە ئێســتا کاتی ئەوەم نییە بۆت باس بکەم، بەڵام کارەکە ئاســانە بە پشــتیوانی خوای پەروەردگار، کە وام وت ئاگام لێبوو سەڵاح زۆری پێخۆش بوو.

سەڵاح: وەڵڵا ماڵت ئاوابێت وامزانی تەڵاقم کەوتووە.

ماکوان: تەڵاقێکت کەوتوە، جارێ دووانت ماوە.

سەڵاح: هەر باشە

ماکوان: من ماڵێك لە نەرویج دەناسـم ئاشـنایەتییان هەیە لەگەڵ خێزانت لە ڕێگای ئەوانەوە بزانم قسەیەك ناکەم لەگەڵ خێزانتا.

سەڵاح: کاك ماکوان ئەو پیاوەتییە تاماوم لە بیرم ناچێتەوە.

ماکوان: لەبەرچاوی خورشـەخان وکاك سـەڵاحدا تەلەفونم کرد بۆ عەبدوڵڵا و ئازیز، هۆکاری پەیوەندی کردنەکەم بەوانەوە بۆ دوو مەبەست بوو.

یەکەم: دەمویست بیسەلمێنم کاری چاك بە موسوڵمان دەکرێت کە دوورە لە کاری سیحرو جادوو.

دووەم: کاری شەیتان ئەوەیە کە هەمیشە ژن و مێرد لە یەك جیابکاتەوە، ئەو خێرەشـمان دەسـت بکەویت خانەوادەیەك نەهێڵین سـەریان لێ تێك بچێت بەهۆکاری سـیحرو جادووبازی و پارە خۆرەکان کە وەك دوکانی لاکۆڵان خەریکی ئەو کارە ناشەرعی و کوفرانەن. لەگەڵ عەبدوڵڵا دا قسەم کرد و پێم وت هەرچیت کردووە تا دەگەڕێمەوە دڵی ڕوناك خان چاك بکەو پێشی بڵێ: ماکوان هەموو سـیحرەکانی بەتاڵ کردۆتەوە با دڵی خۆش بێت و دڵنیاشـی بکەرەوە بە پشـتیوان و ئیزنی خوای پەروەردگار لە ئازارو ناڕەحەتییەکانی چاك دەبێتەوە. ئەوەشـی پێ بڵێ کە من بەهیچ شـێوەیەك دڵم نەئێشـاوە و هەروەکو خوشـك و کەسـوکاری خۆم تەماشـای دەکەم و هەسـت بە موعاناتیشی دەکەم.

عەبدوڵڵا: هەمووی وەك خۆی دەگەیەنم بێخەمبە برا، خوا حافیزیمان لەیەك كرد.

ماكوان: زۆر بە ڕاشكاوانە دوای داخستنەوەی تەلەفونەكەم لەگەڵ عەبدوڵادا، ڕووم كردە خورشەخان و پێم وت كە ماڵەكەت پڕە لە جنۆكەو شەیتان، جا - ئەگەر دەڵێیت بۆت دەردەكەم و وەعدم بدەیتێ كە جارێكی تر بەهیچ شێوەیەك كاری وا ئەنجام نەدەیتەوە تا خوای گەورە چارەسەری هەموو كێشەكانت بۆ بكات.

ئاگام لێی بوو وەكو دایك پێی ناخۆش بوو، ئەی وت ئاخر سەلاح ئەمجارەش جێم دێڵێت.

ڕوومكردە كاك سەلاح عەرزیم كرد دایكت پێویستی بەپارە نییە پێویستی بەتۆیە، پێشئەوەی بیر لەوە بكەیتەوە پارەی بۆ بنێریتەوە تۆی گەورەكردووە با لە سایەتدا بحەسێتەوە جا ئەگەر خوای گەورە ئاسانی كردو لەگەڵ ڕوناك خان پێكهاتنەوە ئەوا دەبێت دایكت لەگەڵ خۆت بەری بۆ نەرویج، یاخود لێرە ژیان دروست بكەیتەوە جارێكی تر.

سەلاح: كێشەی گەورەم ئەوەیە بەهیچ شێوەیەك ناتوانم دەست لە دایكم هەڵبگرم، چونكە دایكمە و دەشمەوێت لەگەڵ خێزانم ئاشت ببمەوە، بەڵام بەڕاستی كێشە كە من نیم، بەڵكو دایكم و خێزانەكەمە. كاك ماكوان تۆ ڕێگا چارەیەكم بۆ دابنێ.

ماکوان: با جارێ بزانم دایکی بەڕێزت دەڵێت چی، وەعدمان ئەداتێ نوێژەکانی بە جوانی بکات و ئیتر نەچێت بۆلای بەناو شێخ و درۆزنەکانی کە خەریکی سیحرو جادوون؟

خورشەخان: باشە بەسەر چاو تۆ چی بڵێیت وەك سەلاحی کوڕم وایت.

ماکوان: خورشەخانم ئەزانم بە نابەدڵ وادەڵێیت، بەڵام سوێند بەخوای گەورە ئەوکارەی تۆ دەیکەیت هەمووی کوفر و خراپەکارییە.

ئەزانم دوو دڵی لە من، لە دەجال و شێخ و جادووبازەکان دەترسیت.

نوێژەکانت بۆ خوای پەروەدگار بکەو سوجدە بۆ ئەو بەرە، خێرو خێرات لە پێناوی خوادا بکە، با خێرو قوربانی و سەربڕینت تەنها بۆ خوا بێت، هەموو ئەوانی تریش موحتاجی خودان. روو مەکە هیچ شێخ و دەجال و جادووبازێك، سەر شۆڕ بکەو دەست هەڵبڕە بۆ خوای موتەعال کە تۆش و ئەوانی دروست کردووە.

سەلاح: بێخەمبە ئیتر ناهێڵم بڕوات.

ماکوان: وەڵاهی کاك سەلاح هەرچی ئاژاوەی ماڵی ئێوە هەیە ناڵێم دایکتە، بەڵام ئەو شێخ و قۆڵ بڕو جادوبازانەن کە ئاوایان کردووە لە ماڵی ئێوە، دایکت و هاوسەرت لەگەڵ یەك هەڵناکەن ئەمە هەمووی کاری شەیاتن و جنۆکەکانە.

تۆش کاك سەلاح هەولبدە خۆت فێری دینداری بکە، هەرچیت هەیە فریات ناکەوێت، سوێند بەخوای گەورە لە قیامەت لەسەر پارەو سەروەت و سامان

پرسیارمان لێدەکرێت کەچی هیچمان لەگەڵ خۆمان نەبردوە، گیرفانمان بەتاڵ و دەست بەتاڵین.

لەم قسانەدا بووین شێخ ئەسعەد خۆی کرد بەژووردا بەتوڕەییەوە و هاواری کرد، بۆ قسە بە شێخ و مەشایەخمان دەڵێیت و پیاوچاکانمان ئاگاداری ئێمەن و ڕۆحی پاکیان ئاگایان لە ئێمەیەو شێخ و مەشایەخمان هەر هەیەو حەزرەتی پێغەمبەر فەرمویەتی: لەزانایان شەریعەت و لە شێخانیش طەریقەت.

بە ئاشکراو بە ڕوونی وتی فەرموون لەم ماڵە بچنە دەرەوە، جێگای تۆی تێدا نابێتەوە کاك نا ماکوان. دووکەسی تریشی لەگەڵدا بوو سەروچاویان دیاربوو بۆ شەڕ کردن هاتبوون.

## شەڕی شێخ لەگەڵ مێخ

لە سلێمانییەوە بانگهێشتی خوان کراین بۆ کەرکوك، پێش ئەوەی بڕۆین دایکم وتی ئاخر ڕۆڵە تۆ لێرە هەموو ئەو دیارییانەی هێنابوویان پێت فڕێدام ئێستا دەچی لەوێ نان دەخۆیت.

ماکوان: ڕاستەکەی، بەڵام هەر خواردنێکی کوڵاو گەرم لێبنرێت و سارد نەبێتەوە ئاساییە بخورێت خۆ ئەگەر خواردنەکە بەدەستی ساحیریش دروست کرابێت، بەڵام ئەو خواردنانەی کە هەڵدەگیرێن ئەوە سیحری تێدا دەکرێت، بۆ نمونە ئەوەی کە زۆر زوو سیحرو جادوو خۆی تێدا مەڵاس ئەدات ترشیات و مرەبا و هەنگوینی دەستکردە بە شەکر یاخود هەرشتێکی تر لەو بابەتانە، یان ئاوێك کە بەناوی ئاوی زمزم ئەیدەنە خەڵکی.

باش بوو دایکم قەناعەتی کرد و لەگەڵ برایم چوین بۆ کەرکوك و لەماڵی کاك سەلاح و خورشەخان تا کاتژمێر ٣ دوانیوەڕۆ باسی ئەو کارانەمان کرد سیحرو جادووی لەسەر دەکرێت و کێشەی کۆمەڵایەتی تا گەیشتینە ئەنجام و پلانیك بۆ چارەسەرێك کە ئەو خێزانە ڕێك بخەینەوە بە پشتیوانی خوای پەروەردگار.

لەپڕ شێخ ئەسعەد هاوڕێ و شێخی خورشەخان خۆی کرد بەژوورا لەگەڵ دوو کوڕی تردا وەك حیمایەی بن لەگەڵیدا، وا هاتە ژوورەوە کە ئاگاداری هەموو شتێ بووە بەهۆکاری شێخایەتی خۆی زانیویەتی.

ڕووی کردە من و بەتوڕەییەوە وتی کاکە تۆ وەهابیت! جێگات نابێتەوە لەم خێزان و ماڵەدا فەرموو بڕۆ دەرەوە.

گوێم لە خورشـــەخان بوو ئەیوت دەباشـــە ئەوە هەموو ئەولیاو شـــێخ و مەشایەخەی لە خۆی توڕەکردووە.

زۆر ترســـم هەبوو لە برایم-ی ڕەفیقم تێدا نەوەســـتاو بوو هەردووکیشـــمان دەمانچەمان پێیە، ناشـزانم ئەو دووکوڕە لەگەڵ شـێخ ئەسـعەدن چەکیان پێیە یاخود پێیان نییە. بۆیە خێرا ســـەیری برایمم کرد چپاندم بە گوێیدا وتم هیچ نەکەیت تا دەســـت ئەوەشـێنم، کە دەســـتم وەشـان ڕەحم بە خورشـــەخانیش نەکەیت.

برایم: جاخۆ ئەتەقم هیچ نەکەم.

ماکوان: جارێ پەلە مەکە ئیشەکەم لێ تێك مەدە، باشە برا.

شـیخ ئەسـعەد وتی بۆچی دانیشـتوون سـەیرم مەکەن ئەم ماڵە موریدی منن و تۆ جێگات نابێتەوە لێرە.

تەماشـایەکی سـەڵاح-م کرد حەپەسابوو، زانیم قورسـە بەلایەوە. ئەو کابرا چۆن لە پڕ خۆی کرد بە ژوورا بە دوو کەســـەوە، ئینجا زانیویەتی کە من قســـەم بە شێخەکان وتوە.

لە سەرەتاوە کە هاتنە ژوورەوە خورشەخان ڕایکرد دەستی ماچ کرد.

ویســـتم تۆزێك مروونەتی پیاوەتی لە ســـەڵاح-دا بجوڵێنم، ڕووم کردە شـــێخ ئەســـعەد پێم وت تۆ کە هاتیتە ماڵم دەرم نەکردی دەشـــمزانی کە خەریکی چیت.

من ئێســـتا لەماڵی پیـاوێکی پیـاوانە دام، ئەو منی دەعوەت کردووە نە لە ئیســـلامدا ڕێگا پێدراوە میوان دەرکرێت، نە لەناو عەشـــایەر و کورد ئەوکارە ڕووی نەداوە. دیارە تۆ نە موســـوڵمانیت، نە عەشـــایەریت نەکوردیشـــیت. من قســـەی جەنابت وەرناگرم لەماڵی ســـەڵاح دام و ئەو خاوەن ماڵە ئەتوانێت دەرمان بکات. زۆر دەترســـام ســـەڵاح زەعیف بێت و کەســـایەتییەکی لاواز بنوێنێت.

خوای گەورە کردی کە زۆر بە ئەدەبەوە ڕوویکردە شێخ ئەسعەد و وتی یا شێخ ئەمانە میوانن لای من، تۆ چۆن ماڵی خۆتە، ئەوانیش من بانگم کردوون لەبەر ئەوە میوانی منن.

خورشـەخان: دەسـتی کرد بە پاڕانەوە لە شـێخ ئەسـعەد، لێی دەپاڕایەوە و دەی وت بیکە بە خاتری خوا لێیان خۆش بە، میوانی ئێمەن گوناحن و جوانن، نازانن و لێیان مەگرە.

برایم: (خۆی پێنەگیرا) وەڵڵا من لە خوا نەبێت داوای لێبوردن لە کەس ناکەم و هیچیشـمان نەکردووە تا ئەم کابرایە لێمان خۆش بێت، من هەر حسـابیشـی بۆ ناکەم.

دووگەنجەکە هەڵیاندایە، برایم-م خسـتە پشـتی خۆم و شـێخ ئەسـعەد-یش دوو گەنجەکە، دەمویســـت هەرچۆنێك بووە کەمێك جەوەکە هێور بێتەوە تەنها

ئەوەندە بتوانم برایم بنێرمە دەرەوە کلاشینۆفەکە بۆ من بهێنیت و خۆشی لە بەر دەرگاوە بەبیکەیسییەکە وە بوەستێت.

ماکوان: کاکە دانیشن من ئێستا هەموو شتێك چارە دەکەم، کۆتایی دێت، میوانییەك هاتبووین کۆتایی پێدێنین.

زۆر بەلاوازی وتم تا برایم بکەمە دەرەوە چپەیەکی بۆ بکەم و چووینە حەوشە بە پاڵ بردم، ئەوان وایان زانی کە من دەترسم دەنگیان زیاتر بەرز کردەوە، پشتم کردە ئەوان و خۆم لە برایم تورە کرد.

دەرۆین کاکە تەواو میواندارییەکەمان کۆتایی هات ماڵتان ئاوا بێت، هەرچۆن بوو رامکێشاو دەستم بەدەمیەوە بوو دەرمکردە دەرەوە لای ئەواندا دوورم خستەوە. چپاندم بەگوێیداو وتم باش گوێگرە تازە لەم ماڵە ناچمە دەرەوە تا ئەو شێخە بۆ حەوت پشتی شێخایەتی ئاقڵ نەکەم.

برایم: ئەی بۆ وا مەوقیفت زەعیف بوو شێتت کردم، ئەوە تۆ نەبوویت.

ماکوان: بە تورەییەوە گوێگرە بزانە چی دەڵێم: برۆ خۆت ببەستە و لەدەرەوە لای دەرگاکە بە بیکەیسیەکەوە ڕوو بکە هەموومان و کلاشینکۆفەکەش فریای من بخە و دەمانچەکەشت با دەرکەوێت. منیش دەری دەخەم کە کلاشینکۆفەکەم پێگەیشت.

کاکە بەس وا خۆت ببەستە کە زیرە بکەن باشە، دەبرۆ دەی خێرا بەقوربانت بم بتبینم. منیش خوا حافیزی دەکەم و دەنگم نزمتر دەکەمەوە خۆم وانیشان ئەدەم زۆر ئەترسم. هیچ نەبێت با غیرەتێك بدەم بە سەلاح بڵێ بابە دانیشن

بۆ ئەوەی خوڵكمان بكاتەوە، ئینجا ئەوسـیانەت بۆ زەلیل دەكەم بە پشـتیوانی خوا، ڕاكە براكەم.

برایم چووە دەرەوە و هـاوارم كرد كاك سـەڵاح براكەم ماڵتان ئاوا بێت بۆ مەوزوعەكەی خۆشـمان ان شاء الله كەچوومەوە نەرویج چارەسـەری دەكەم و وابزانە خێزانت گەڕاوەتەوە بۆلات.

- كە باسی چاك بوونەوەی نێوان سەڵاح و خێزانیم كرد، دیسان بەوە ختوكەیم داو هاتەوە بیری كە ئیشی لەدەستمدایە، بۆیە خوڵكەكەی گەرمتربوو.

سوێندی خوارد كە دەبێت دانیشـم دەنا قبوڵی ناكات، منیش چاوەڕێم كاكە بلە بەچەكەوە بێتەوە بە عیزەتەوە دانیشـم. قسـەم لەگەڵ سـەڵاح دەكرد ئەوانیش لە ژوورەوە بوون دەمویست وەزعەكە هێمن بێتەوە تا برایم دێتەوە.

١٠ دەقیقەی پێنەچوو گوێم لە شلَپەی دەرگای حەوشەی ماڵیان بوو، تەماشامان كرد بیكەیسییەكەی بەدەستی ڕاستی هەڵگرتوە و دوو شریتی داوە لە خۆی و كلاشینكۆفەكەیشی وەك رامبۆ خستۆتە سەر شانی، كە تەماشام كرد - ڤاندام- و - ڕامبۆم- بیركەوتەوە!

ڤاندام و ڕامبۆش لەچاویدا هیچ نەبوون، بەخوا كلاشینكۆفەكەی دایە دەستم و خۆشـی چووە پشـت منەوە، هاواری كرد خۆتان لادەن با ئاوڕشـێنێكی ئەو شـێخە.... بكەم. زۆرجنێوی دا منیش هیچم نەوت، بەڵام خەریـك بوو لە جنێوەكانی ئەو تورە بم ئەوندە دەمی پیس بوو.

سەلاح چوو بۆ لای ئەو، مەشغولم كرد بەوەوە، خۆشم دەمانچەیەكی طاریقم پێبوو خستمە بەردەم پانتۆڵەكەم لەبەرچاویاندا میلم هێنایەوە و چوومە ژوورەوە مەبەستم نەبوو فیشەك بتەقێنم، بەڵام دوو بۆ چوار فیشەك لەدەستم دەرچوو.

برایمیش ڕایكردە ژوورەوە وای زانی بوو برینداربووم، منیش تووڕە بوو بووم و ئاگام لەدەمی خۆم نەمابوو بە ئارەزووی دڵی خۆم بە جەنابی شێخدا هاتبوومە خوارێ.

تف لەدەمیاندا وشك بوو بوو، ئاگام لەیەكێكیان بوو دەستی برد بۆ پشتی، وتم برایم ئەو سەگ بابە چەكی پێیە دەستی جوڵاند وەك سەگ بیتۆپێنە.

هاواری كرد، بەخوا چەكم پێنییە ئەو قاپە چووە بە پشتمدا برینداری كردووە.

ماكوان: چەكتان پێیە؟

وەڵامیان دایەوە كە نە بەخوا چەكمان پێنییە.

ڕوومكردە كاك سەلاح، براكەم ئەگەر ئەتەوێت شتەكە هێمن بێتەوە بڕۆ دەرەوە لە كۆڵان خۆشت تەماشای ئەملاولا بكە بۆ ئەوەی وابزانن تۆش بەدەنگ تەقەكانەوە هاتوویت لە ئێمەی دوورخەرەوە، تكاشت لێدەكەم ئاقڵانە بیكە با هەمووومان بەسەلامەت دەرچین، باشە براگیان.

سەلاح: باشە بەس ئەوكەسانە مەكوژن.

ماکوان: ئەگەر تۆ ئیشــەکە بەجوانی بکەیت ئێمە دوای تۆزێکی تر دەڕۆینەوە کۆتایی پێ دێت. ئێمە میوانی تۆبووین نەدەبوو بتهێشــتایە ئاوا بێحورمەتی بە میوانەکانت بکەن.

ئێمەش مافی خۆمانە رەد ئیعتیبار بگەڕێنینەوە بۆ خۆمان، دەبڕۆ ئیشـــەکە بەجوانی بکەو گومان دوورخەرەوە لەماڵی خۆتان.

تەماشــا دەکەم برایم قاچی خســتۆتە ســەر ملی یەکێك لە کوڕەکان بەلەقەش دەکێشێت بە ئەوی تریاندا!

بەپەلە فریای کەوتم وتم بۆ دەکێشـــی بەو دووکوڕە فەقیرە دا، کێشـــەکە ئەم شێخە ساختە چییە سەگبابەیە.

برایم: حەز دەکەیت ئەیکوژم خۆ چییە، گریمان بزنێکە.

هیچم نەوت دەمانچەکەی دەرهێنا خەریك بوو بیکوژێت بە پەلە فریای کەوتم شـێخ-یش حەپەسـاوە ئیتر نەمزانی خۆی پیس کردووە یان !؟ دەسـتم گرت وتم برایم گیان ئەم بزنە هیچ نییە زەلیلە لەبەردەستمان گوناحە سێ مانگ بەڕۆژوو بیت کەفارەتەکەی زۆرە، هەر خۆم ئێستا قاچ و دەستێکی دەشکێنم.

خورشـەخان: بیکەن بەخاتری خوا، خۆ لای خۆی تۆ موسولمانیت بیکە بەخاتری خوا، دە ئیتر واز بێنن. ئەو پیاوە نەخۆشە بۆ وای لێدەکەن؟ دڵی بۆی دەسووتا.

ماکوان: خورشـەخان ناوی خوات هێنا، ئەم سـەگە لەبەر خاتری خوا لغاوەکەی دەکەمەوە ئەیبەخشـــم بە جەنابت، چونکە نانێکمان لەماڵەکەتدا خواردووە، بەڵام ئەگەر شێخەو ڕاسـت دەکات و زەڕەیەك خاوەنی کەڕاماتە با خۆی ڕزگار

بکات بەو جنۆکەو شـەیتانانەی کەهەیەتی. کەوام وت یەکسـەر ئایەتەلکورسـی و مەعوزەتینم خوێندو بەهۆکاری ئەو قورئان خوێندنە بێدەنگییەك ڕووی کردە هەمووومان و سەڵاح گەڕاوە.

سەڵاح: کەس ئاگای لە هیچ نییە، کەرکوکە ڕۆژی دە تەقەی تێدا دەکرێت، تەقە ئاساییە لێرە.

چپاندم بە گوێی برایم وتم چاوت لەسـەریان بێت تازە کە هەر ئیشـەکەمان کردووە با ڕسوایان کەین، بەڵکو واز لەکاری جادوو سیحر بهێنن.

ڕوومکردە خورشەخان و دەستیم ماچکرد.

عەرزمکرد دایکی کاك سـەڵاح و منیش ئەوە شـێخەکەتە، ئەو فشـە فشـەی دەیکرد بزانم دەتوانێـت خۆی ڕزگـار بکـات؟ بڕوا بکە نـاتوانێـت هیچ بکـات. ئەوەی ئەمە دەیکات لەبەرچاوی خۆی و تۆش و ئەو کوڕانە دەڵێم کە دیفاعیان لێدەکرد و خۆشـی وەك خولە بوز! هیچی پێنەکرا، ئەوەشـی پێ دەیڵێم کەوا کەسـێکی سـاختەچییە و جادووبازە، نەشـێخەو نە خواناسـەو نەهیچ، بەڵکو شـەیتان دەپەرسـتێت، بەندایەتی بۆ جنۆکەو شـەیتان دەکات، لەبەر دنیا قیامەتی خۆی فەوتاندووە.

توخوا پێم بڵێن ڕۆژێـك بەکـامتـانی وتووە نوێژێـك بکەن؟ خواناسـی بکەن؟ هەندێك زیکرو توقوساتی فێرکردوون ئەویش بۆ خوای پەروەردگار نییە، بەڵکو بۆ شـەیتان و جنۆکەکانە. ئێسـتا چەقۆیەکی لێبدەم هەموو گیانی پڕدەکەم لە خوێن، هیچی پێناکرێت نابینن زەلیلە و لەبەر دەستماندایە، دەمی وشك بووە،

ئەگەر شـــێخەو دیعایەی کەڕامات دەکات، دەی کوا با من و بلەی برام گۆج بکات.

شێخ تەڕەماش ئەتوانیت؟

هیچ دەنگی نەبوو.

وەرە بزانم لەکـام فەرموودەدا، لەکـام کتێبـدا پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: زانایان بە زانســت و ئێوەش بە طەریقەت، ئەمە قســەی گیرفانی خۆتە درۆ بۆ بەدەم پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەکەیت خوای گەورە سووك و ڕسوات دەكات، کە ڕسواش بوویت!

واز لەو خەڵکە بهێنە و ئەم هەموو ســـیحرو جادووە چیە کردووتە لەم ماڵە، نیوەی پارەی ئەم ماڵەت بردووە بۆ خۆت ئەی تێرت نەخوارد، ئەگەر لە خوا ناترسی و ترسی قیامەتت نییە ئەی ویژدانت خەوتوە هەی پاتاڵ.

ئینجا بۆ سوککردنی زیاتری وتم هیچت قورئان لەبەرە؟

شیخ ئەسعەد: ئەی چۆن لەبەرم نییە.

ماکوان: ئادەی چیت لەبەرە، ئایەتەلکورســـی، ســـوڕەتی البقرة هەرچیت لەبەرە بیخوێنە، بزانم دەیزانیت.

خوا شـــاهیدە ســـوڕەتی فاتیحەو ئیخلاص نەبێت لەبەری بوو، ئەویش بە هەڵە خوێندییەوە، کە خۆشی بە ئەولادی پێغەمبەر (ﷺ) دەزانی، دەرمخست بۆیان ئەمە ئەولادی شەیتانە.

ئاگام لێبوو خورشــەخان چاوی لەســەر ئەوانە، هەر بە قوربان و بەســاقەیان دەبوو، خوای گەورە هاوکاری کردین و ئەوەندەم زانی حەزقیل لە حەوشــەکە بانگی کردم.

حەزقیل: ماکوان فریای خۆتان بکەون برایەکی هەیە ئێســتا لەگەڵ هەندیك کەســی خۆیاندا و خەڵکێکی زۆری خســتۆتە دوای خۆی بۆ ئێرە دێت، کات مەکوژە دەرچۆ بەرەو سلێمانی.

منیش بێدەنگی ڕووی تێکردبووم تەماشای حەوشەکەم دەکرد ئاگام لە حەزقیل بوو.

برایم: ماکوان ئەوەبیر لە چی دەکەیتەوە، بۆ وا حەپەساوی؟

هیچ بابڕۆین، ڕوومکردە شێخ ئەسعەد دەڕۆم کاتی ئەوەم نییە شەڕ بکەم.

ئەزانم سـەگ و گورگەکەی برات و جنۆکەو شـەیتانەکان هەواڵییان پێگەیشـتوە کەســووك و ڕســوامان کردوویت، بەڵام لەبەر ئەم ماڵە و حورمەتی ئەم ماڵەم گرت سوێند بەخوای پەروەردگار قاچ بخەیتە ئەم دیو چەمچەماڵ بۆ ئیشی قۆڕ قاچت ئەبڕم.

کاك ســەڵاح گیان ئێمە دەڕۆین تۆزێکی تر هەندێك ســەگ و گورگ دێنە ئێرە، قســە دەکەینەوە خواتان لەگەڵ. ڕوومکردە ئەو دوو کوڕەی کە لەگەڵ شــێخ هاتبوون ئاگاتان لە دینەکەتان بێت ئەو پیاوە ساختە چییە.

هاتمە دەرەوە برایم-یش بە پشــتاو پشــت هاتە دەرەوە، بابڕۆین زوو بەرەوە هەولێر.

برایم: ســـیلاحمان پێیە نـاتوانم هەولێری چی؟ منیش و چەکەکـان پـارتی ئەیگرێت.

ماکوان: زوو دەرچۆ بەرەو سلێمانی ئەگەر بۆت کرا بفڕە، چونکە بەڕێگاوەن بۆ ئەوەی لێماندەن و تەنانەت بمانکوژن. من شـــارەزانیم ئەگەر بتوانیت ڕێگا بگۆڕە بۆ ئەوەی بەو ڕێگایەدا نەڕۆین کە ڕێگای گشتییە و لێوەی هاتووین.

برایم: خەمت نەبێت.

تەبعەن بەقســـەی نەکردم و لە ڕێگای ئاســـاییەوە ڕۆیشـــتو کە دەچیتەوە چەمچەماڵ و بانی مەقام، بەڵام زۆر سەریع دەڕۆیشت وای دەزانی دەیترسێنم، بۆیە گاڵتەی بەقسەکانم دەهات و بەقسەی نەکردم.

لەبەر خۆییەوە دەی وت بەقوربـانی ئەو خوایەت بم خەسرەو دەمێـک بوو هیچم نەکردبوو، بابە ژیان لەگەڵ تۆ خۆشــە شــەق ئەوەشـێنم شــەق ئەخۆم بەخوا برا ژیان لەگەڵ تۆ حەیاتە.

بەسەلامەت گەیشتینەوە سلێمانی، برایم سوێندی خوارد کە شەو جێم ناهێڵێت و ئەم شـــەو بەیەکەوە دەبین. تەلەفونم کرد بۆ کوڕێکی ڕەفیقی منداڵیم ناوی بەکر بوو، عەمیدە لە ئاسـایش. کاکە شـەڕێکمان کردووە عەشـایارانە لەکەرکوك لەوانەیە شـەو بێنە سـەرمان، هیچت پێدەکرێت. نامەوێت تەکلیف لە مەسئول و ڕەفیقەکانی باوکم بکەم.

بەکر: لە خەڵکتان داوە؟

ماکوان: تەقریبەن.

بەکر: لەسەر چی؟

ماکوان: ماددە بوو؟

بەکر: حیزبایەتی نییە خۆ؟

ماکوان: نا، پەیوەندی بە دوکان و بازاڕەوەیە.

بەکر بێخەم بە ئەم شـــەو خۆم لە دەوامم و دوو مەفرەزە لای ماڵتان تا بەیانی هاتووچۆ دەکەن و خۆشم دێم.

ماکوان: شـــەو کەهاتی نەخەوتوین وەرە بۆ لامان و نانێک دەخۆین لەگەڵ خۆشت پیتزا بێنە و بلەی خۆشمانی لێیە.

بەکر: نانیشتان بۆ بهێنم؟ کام بلە؟
ماکوان: بلە شـــەقاوەی خۆمان، پارەکەیشـــت نەدەمەوە نازانم بۆ دایمە ئێوەی ئاسایش دەکرۆزێنەوە؟
شـــەو هەموو کۆبووینەوە و تا نوێژی بەیانی نەخەوتم، هیچ ڕووی نەداو بۆ شـەوی داهاتوو دەگەڕامەوە بۆ نەرویج، برایم لام بوو هەر ئەویش منی برد بۆ فرۆکەخانەی نێودەوڵەتی سلێمانی لەگەڵ پێشڕەوی برام.
گەیشتمەوە فڕۆکەخانەی ئۆسلۆ دووهاوڕێم هاتبوون بەشوێنمدا تەلەفونەکەم کردەوە دوو تەلەفونی ڤایبەرم بۆ هاتبوو.
تەلەفونم کردەوە بۆژمارەکە، کاک سەڵاح دەرچوو.
سڵاوم لێکرد و وتی بەڕاستی شێخت دا لە مێخ.

## چۆن دەتوانین جنۆکە بگرین

گەیشـتمەوە وڵاتی نەرویج لە فڕۆکەخانە دابەزیم ڤاییەرم بۆ کرا لەلایەن کاك سەڵاح-ەوە لەکەرکوك، قسەی زۆر عەجیبی بۆکردم.

سەڵاح: لەدوای ڕۆیشتنی ئێوە لە ماڵی ئێمە ڕێك قسەکەی جەنابت ڕاست دەرچوو، یەك توێتا خەڵك هاتبوون بۆ لێدانتان. برایەکی هەیە لە خۆی خراپترە بەحســاب شـێخەو جببەو عەمامە دەبەسـتێت و خۆی بە شـێخ دەزانێت پەڕۆیەکی ســـەوزی لە ملدایە خۆی کرد بە ماڵی ئێمەدا ڕووی کرد شێخ ئەسعەدی برای وتی ئەو خوێڕیانە کوان؟.

شیخ ئەسعەد: چۆن زانیوتە؟

شـێخ وەهابی (برای شـێخ ئەسـعەد): کەڕاماتی حەزرەتی شـێخ بوو پێی ڕاگەیاندم کە لە نارەحەتیدایت.

شێخ ئەسعەد لەوێدا لە بەرچاوی هەموومانەوە وتی گو بەشەرەفی خۆت و حەزرەتی شێخ و مەشایەخت و کەڕاماتیشت بڕۆ بابڕۆین، کە ڕۆشتوون نەمدیونەتەوە.

کاکە منیش بڕیارمداوە لە مانگی داهاتوو دەگەڕێمەوە بۆ نەرویج، بەس ترسم هەیە پۆلیس بمگرێت.

ماکوان: جا حەز دەکەیت قســـە دەکەم لەگەڵ پۆلیس، بزانم دەتوانیت بێیتەوە کێشەت نییە؟

سەڵاح: وەڵاهی کاك ماکوان زۆر مەمنونت دەبم ئەو کارەم بۆ بکەیت.

ماکوان: مەمنونی ناوێت، بەس پەلەم لێمەکە بە یەك دوو ڕۆژ ئیشـەکانی خۆم تەرتیب بکەمەوە، مانگێکە منیش لە ســـەفەرم، دەبیت بچمەوە ســەرکارەکەم. خوا حافیزیمان لەیەکتر کرد و دوای چەند ڕۆژێك چووم بۆ فەرمانگەی پۆلیس بۆ کارەکەی کاك ســـەڵاح ناو و ڕۆژی لەدایك بوونیم دانێ و وتم: ئەو کوڕە کێشـــەیەکی خێزانی هەبووە لێرە و منداڵەکانی پۆلیســی نەرویجی گەڕاندوویانەتەوە بۆ نەرویج، ئایا ئەتوانێت بێتەوە بۆ نەرویج؟

پۆلیســـی نەرویجی: ئاگاداری کردمەوە کە هیچ کێشـــەیەکی نییە، وەك ئەوەی بگیرێت یان غەرامە بکرێت. کێشـــەکەی تەنها ئەوەیە لەگەڵ خێزانی جیا دەبێتەوە و ماوەی چەند مانگێکیان ماوە لە نێوانیاندا تا هەردوولا وەرەقەی جیابوونەوەکەیان پێدەگات و کۆتایی دێت.

تەلەفونم کردەوە بۆ ســـەڵاح ئاگادارم کردەوە کە هیچ کێشـەیەکی نییەو دەتوانێت بێتەوە. زۆر خۆشـــحاڵ بوو، بەڵام ئەوەم پێ وت کە نەچێتەوە ماڵی خۆیان، منداڵەکانی ئاگادار بکاتەوە کەدێتەوە منیش قســـە لەگەڵ خێزانی دەکەم، بەڵکو دڵی باشـــبێت و کۆتایی بەو مەوزعە بهێنن. زۆر مەمنونی دەربڕی و خۆشحاڵ بوو.

سـەڵاح: بلیت هەیە بۆ دوو هەفتەی تر، دەچمە ماڵی برادەرێکم لە شارەکەی خۆمان و ئاساییە ناچمەوە ماڵەوە.

ماکوان: کارێکی باش دەکەیت، بەڵام منداڵەکانت بابزانن کەدێیتەوە و منیش هەوڵ ئەدەم لە مەجالێکدا بێم بۆلاتان.

پاش چەند ڕۆژێك تەلەفونم کرد بۆ ڕوناك خان، دوای هەواڵپرسـین پێم وت: تەمەنت بەشی ئەوەی نەماوە بە تەنها بیبەیتە سەر، ژیان لەسێبەری پیاوێکدا نەڕوات هەر ژیان نییە. کاك سـەڵاح- یش پیاوێکی بەڕێزو بەشـەخسـییەتە و پەیمانی داوە دەسـت بکات بە دینداری. تۆ زیاتر کێشـەت لەگەڵ خەسـووتە، بۆچی بەدەسـتی خۆت ماڵ و ژیانی خۆت وێران دەکەیت؟

ڕوناك: کاك ماکوان تۆ هەرچی بڵێیت من لەقسەت دەرناچم. من سەڵاح- م خۆشـدەوێت، باوکی منداڵەکانمە و ژیانێکی خۆشـمان بەیەکەوە بردۆتە سـەر. من ئافرەتێك نیم بەدوای شـتی خراپدا بگەڕێم و ماڵ ومنداڵیشـم خۆشـدەودەوێت نامەوێت لێم تێك بچیت، بەڵام تەلاق لە نێوانماندایە، ئایا هیچ ڕێگا چارە هەیە؟

ماکوان: هەیە، بە پشـتیوانی خوا کێشـە نابێت، دەتوانن بچنەوە لای یەکتری لە کەرکوك هەمووی بۆ باسکردووم.

ئەگەر من بە برای خۆت دەزانیت و قسـەی ماکوان ناشـکێنیت لەم ماوەیەدا دەگەڕێتەوە و دەیەوێت بچێتە ماڵی هاوڕێیەکی.

تۆش هەولْبـده بۆی بکە بە موفـاجەئە بە گولْێکەوە بڕۆ فڕۆکەخـانە بیهێنەرەوە بۆ ماڵەکەی خۆی، ئەگەر بەقسـەم بکەیت تاماوم مەمنونم ودوای دێم بۆ ماڵیشتان. خۆ ئەگەر بەقسەشم نەکەیت زۆر دڵگران دەبم و نێوانی خوشک و برایەتیمان تێك دەچێت.

بۆیە وا بە ڕەقی قسـەم کرد نەمدەویسـت کارەکە نەکات، دەمویسـت هەرچیم کردووە ئەو خانەوادە تێك نەچێت.

ڕوناك: ئاخر ئەترسم بڕۆمو سەڵاح قسەم لەگەڵ نەکات و لەناو خەڵکیشدا بمشکێنیت، تۆ دەزانیت من شکاتی پۆلیسم لێکردووە.

ماکوان: بڕوا مەکە هیچ پیاوێك لەسەر ئەم زەوییەدا لە بەرانبەر عاطیفەی ژندا تورە بێت. هەڵبەت باسـی پیاو دەکەم کاك سـەڵاح- یش بە پیاو دەزانم بۆیە قەت ئەوەی لێرانابینم.

ڕوناك: باشە، بەس تۆ ئەو ڕۆژە بۆ فڕۆکەخانە وەرە لەگەڵماندا.

ماکوان: نا، پێویسـت ناکات من بێم با ئەو بێتەوە ماڵەوە، بەڵام تۆزێك خۆتان لەیەك بە دوور بگرن هەتا جارێکی تر مارە دەکرێنەوە بە عەقدو نیکاحێکی نوێوە، دەتوانی ئەم جارە داوای مارەی تری لێبکەیت.

ڕوناك: بۆ کاك ماکوان دەبێت مارە بکرێمەوە؟

ماکوان: بەڵێ، چونکە مودەتێکی زۆر بەسـەر تەڵاقی یەکەمی کاك سـەڵاح تێپەڕیوە، ئەگەر لە خوار سێ مانگەوە بوایە ئاسـایی بوو، دەیتوانی بڵێت

ئەوا هێناومیتەوە ژێر نیكاحی خۆم، بەڵام لەبەر ئەوەی زیاتر لە سێ مانگە دەبێت بە عەقدێكی نوێ بكرێت.

ڕوناك: باشە كاك ماكوان گیان دەتوانیت بە سەڵاح- یش بڵێیت؟

كەوای وت دڵم زۆر خۆش بوو، چونكە دیارە ڕازی بووە و ئیشەكە لەدەستی خۆمدایە.

ماكوان: ڕوناكی خوشكم ڕازیت بڵێم مارەییەكەت نوێژكردنی سەڵاحی هاوسەرتە و لەگەڵ خوێندنی قورئانە تا مردن؟

ڕوناك: تۆ برای منیت كاك ماكوان چی دەڵێیت من بەقسەت دەكەم.

زۆر مەمنونیم بۆ دەربڕی و خوا حافیزیمان كرد، پاشان تەلەفونم كرد بۆ سەڵاح دوای چاك و چۆنی لێم پرسی وەزعت چۆنە؟

سەڵاح: كاك ماكوان زۆر ئەترسم بگەڕێمەوە و ڕوناك لەگەڵمدا ئاشت نەبێتەوە.

ماكوان: كاك سەڵاح ئەگەر من ئیشێكت بۆ بكەم وەعدی ئەوەم ئەدەیتێ كە تامردن لەگەڵی باشبیت و زوڵمی لێنەكەیت، چونكە بەراستی هاوسەرت شای ژنە.

سەڵاح: بەخوا برا من ڕوناكم زۆر خۆش دەوێت و هەرگیز زوڵمی لێناكەم.

ماكوان: قسەم لەگەڵ كردووە ڕازییە بێتەوە لات، بەڵام مەرجی هەیە.

سەڵاح: مەرجەکەی چییە؟

ماکوان: تۆ دەبێت بزانی لەماڵی خۆتان باسم کرد لەکەرکوك، چۆن دەیهێنیتەوە؟

سەڵاح: بەڵێ دەزانم.

ماکوان: دە وەڵڵا داوای مارەیی نوێ دەکات.

سەڵاح: چی دەوێت بۆی دەکەم.

ماکوان: وەعد؟

سەڵاح: بەڵێ ؛ بەڵام بەواتای ئەوەی کە لەتوانای مندابێت، شتێك بێت کە من بتوانم!

ماکوان: وەڵڵا ئەتوانیت زۆریش ئاسانە.

سەڵاح: چییە؟

ماکوان: نوێژو ڕۆژوو قورئان خویندن تا مردن.

سەڵاح: کاك ماکوان بەخوای گەورە قەسەم لەو ڕۆژەوەی تۆ لەماڵمان دەرچوویت نوێژەکانم بەجوانی دەکەم تەحیاتم نەدەزانی ئەویشم نووسیوەتەوە لەسەر وەرەقە و لەگیرفانمدایە، بەیەك دوو ڕۆژ لەبەرمکردووە بەس هەر پێمە. ئەو بڵێت و نەڵێت من هەر نوێژ دەکەم.

ماكوان: ئەی بارك الله فیكم براكەم، مادام وایە بڕۆ مەلایەك پەیدا بكەو بچۆرەوە بۆلای وەلی ئەمرەكەی ڕوناكی هاوسەرت و سەر لە نوێ مارەی بكەرەوە. ڕوناكیش لە فڕۆكەخانەی ئۆسلۆ چاوەڕێت دەكات، بچۆرەوە بۆ ناو ماڵومنداڵی خۆت.

سەڵاح: توخوا بەڕاستە یان گاڵتەم لەگەڵ دەكەیت.

ماكوان: كەی وەختی گاڵتەیە بڕۆ كارەكانت ئەنجام بدەو كەچوویتەوە دیارییەكی جوان بەرە بۆی با لە ئاڵتون كەمتر نەبێت، باشە برا؟

سەڵاح: وەی بەسەر چاو.

خوا حافیزیمان كردو وتم سـڵاوم بگەیەنە بەدایكت و ئەم ماوەیە هیچ خواردنی دەستی نەخۆیت، نەكو سیحرت لێبكات.

وتی: نایخۆم خەمت نەبێت.

ماوەیەكی زۆر ئاگام لێیان نەما، نزیكەی دوومانگی پێچوو ڕۆژێك لە سوید ئەوانم بینی چووبوین بۆ كڕینی پێداویستی ماڵی خۆمان (لەبەر ئەوەی سوید لەسەر سنوور نزیكە لێیمانەوە كەرستەكان لەوێ هەرزانە بەتایبەتی گۆشت و شیرەمەنی) یەكێك لەدواوە باوەشی پێدا كردم و وتی: من بێوەفاترین كەسم و تۆش وەك منیت.

ئاوڕمداوە سەڵاح-ە، دوای چۆنی و چاكی وتی خۆ نانتان نەخواردوە؟

ماكوان: نەوەڵڵا بەتەماین بڕۆین نان بخۆین.

سەڵاح: بڕۆین دەعوەتی منن.

کاتی گەڕانەوە بوو داوام لێکردن بچین بۆ ماڵی ئێمە و دوایی بڕۆنەوە بۆ شارەکەی خۆیان. شارەکەی من ٢٠خولەک لەسەر سنووری سوید دوورە، ئەوان لە جێگایەکەوە هاتبوون نزیکتر بوو بۆ شارەکەی خۆیان ئەگەر لای منەوە بڕۆشتنایەتەوە کاتژمێرێك زیاتری دەویست. داواکارییەکەیان قبوڵ کردم و چووینەوە بۆ ماڵەوە.

شەو دانیشتین و سەڵاح وتی: بەخوا کاك ماکوان ڤیدیۆی تۆ و مامۆستایانی تر نەماوە گوێی لێنەگرم، هەمیشە لە یوتیوبم لەم زانا بۆ لای ئەو زانا دەچم گوێ تەنها لە قورئان دەگرم.

ڕوناك خان هەڵیدایە لەولاوە بە پێکەنینەوە وتی: کاك ماکوان ناهێڵێت تەماشای هیچ بکەین زنجیرە تورکییەکانی لێ مەنع کردووین.

ماکوان: کارێکی باشی کردووە خوا جەزای بداتەوە بەقسەی بکەن.

سەڵاح: بەڕاستی هەر دەمویست قسەت لەگەڵ بکەم، دیارییەکت بۆ هێنابووم کە هاتی بۆ ماڵمان چەند کتێبێکی خۆت بوو. هەموویانم خوێندەوە، بەڵام کاك ماکوان مەملەکەتی شەیتان زۆر سەرنج ڕاکێش بوو، ئەرێ بەڕاست ئەوە ڕوویداوە؟

ماکوان: بەڵێ هەمووی ڕوویداوە و ڕاستییە، بەڵام ناوی کەسایەتی و بەشێکیش لە جێگاکانی گۆڕاوە دەنا هەمووی ڕاستییە.

ســـەڵاح: ئەوەی ســـەرنجی منی ڕاکێشـــاوە ئەوەیە جنەکان ئەوەندە دەسەڵاتیان هەیە بۆ سەر مرۆڤەکان؟

ماکوان: نەوەڵلا دەسـەڵاتیان نییە، بەڵام زۆر جار ئێمە خۆمان دەسـەڵاتیان ئەدەینە دەست کە ببنە کوێخاو سەرسەری بەسەرمانەوە. هەر وەك چۆن دەســەڵاتمان داوەتە حیزبە کوردییەکان ســەروەت و ســامانی ئەو خەڵکە دەخۆن لە کۆتایشـدا کە چوونە سـەر سـندوقی دەنگدان هەموو سـەوزو زەرد و نیلی و مۆرو هەموو ڕەنگەکان دەبنە چۆپی و لە ســێ پێییەوە تا چوار پێی بۆیان هەڵدەپەڕن! ئێ دەپێم بڵێ خەتای کێیە؟

سەڵاح: وەڵڵا خەتای ئەو میللەتەیە.

ماکوان: دە سـوێند بەخوای گەورە سـەڵاحی برام جنۆکەو شـەیتانیش وەك یەکێتی و پارتی و ئەو حیزبە عەلمانیانەن بەگشتی، ئەزانی بۆچی؟

لەبەرئەوەی خۆمان بە جنۆکەکان و شـــەیتانەکان دەڵێین: وەرنە لامان وەرن بێنە ناو لاشەمان.

سەڵاح: چۆن؟

ماکوان: ئەزانی جنۆکە چۆن دێتە ناو لاشەی خەڵکییەوە هەیمەنەتی خۆی بەسەردا دەکات و ئەوەی ئەو بیەوێت دەیکات؟

سەڵاح: نەوەڵڵا!

ماكوان: چەند هۆكارێكی هەیە لەوانە ئەگەر مرۆڤەكە زۆر بترسێت وترسنۆك بێت، یاخود مرۆڤ كە زۆر تورە بێت بەبێ هۆكار واتا بەتایبەت ئافرەت و گەنجەكان بەبێ هیچ هۆكاریك هەڵئەبەزنەوە و تورە دەبن، هەروەها دووركەوتنەوە لە زیكری خوا و بەندایەتی و نوێژو ڕۆژووەكان، بەهەمانشێوە لە كاتی تاوانكردن و بەردەوامی لە تاواندا.

سەڵاح: باشە كاك ماكوان خۆ ئەم ئەوروپییانە خوا ناناسن و بڕوایان بەم شتانە هەر نییە، ئەی جنۆكە بۆ ناچێتە ناو لاشەی ئەمان و وەك ئەو باسەی كەهەیە لای خۆمان؟

ماكوان: جا جنۆكە بۆ بچێتە لاشەی ئەمانە، خۆ ئەمانە ئەوەی شەیتان دەیەوێت دەیكەن! مەبەستم لەڕووی دینداری و خواپەرستییەوەیە، ئیتر جنۆكە و شەیتان ئیشی بەمان چییە؟ ئەمان خۆیان هاوكارن لە كۆمپانیاكانی ئەواندا وا خەریكی چالاكی و كاركردنن.

ئەمان مەگەر سیحر لەیەكتر بكەن یاخود شەیتانێك خۆی بیەوێت كەسێك ئیزعاج بكات بچێتە ناو لاشەیان لەڕێگای سەركێشی خۆیەوە، هەندێكیان لە عیفریتەكان زۆر سەخیفن دەیانەویت مرۆڤەكان وا لێبكەن كە بیانپەرستن و بەندایەتی بۆ ئەوان بكەن، هەر وەك ئەبینین لێرە و لەوێ خەڵكێك هەیە بەناوی ساتانیستەكان واتا شەیتان پەرستەكان.

سەڵاح: وایە، ئەی كاك ماكوان مرۆڤ ئەتوانێت جنۆكە بگرێت؟

ماکوان: بەڵێ ئەتوانێت بیگرێت، ئەگەر زانیت ئەیەوێت ئازارت پێبگەیەنێت بۆت کرا بیکوژە و یان ئەگەر سوێندی خوارد وازت لێ دێنێت و مسوڵمان بوو ئازادی بکە.

سەڵاح: جا چۆن مرۆڤ دەتوانێت بیگرێت؟

ئەویش نیشانەی هەیە لەسەر شێوەیەك لەم شێوانە دێتە لات مار، پشیلە، سەگ، مرۆڤ یاخود تارمایی، ئەت ترسێنێت و شتی پێیە پیاتا دەکێشێت، تۆ ئەگەر توانیت و بۆتکرا دەست بەرە بۆ قورگی بیگرە بە قایمی و تا ساردی لیکی بەدەستا دێتە خوارەوە هەستی پێنەکەیت بەرەڵای نەکەیت.

هەروەك چۆن پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە کاتی نوێژدا بوو عیفریتێك ویستی کڵۆیەك بەردی ئاگرین بکێشێت پیایدا، پێغەمبەر (ﷺ) قورگی گرت تا ساردی لیکی هەست پێکرد و پاشان فەرمووی لەبەر دوعاکەی سولەیمانی برام نەبوایە ئەوا ئەمدایتە دەست منداڵانی مەدینە یاریت پێبکەن و دەم بەستیتەوە.

بێجگە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە هیچ کتێب و سەرچاویەکدا نەمدیوە ئەو شتە دووبارە بووبێتەوە، یان ئەگەر دووبارە بووبێتەوە باس نەکراوە.

سەڵاح: ئەی کاك ماکوان چۆن جنەکان بەو شێوە دەیانتوانی ئازار بە پێغەمبەر بگەیەنن؟

ماکوان: براکەم پێش هاتنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) شەیتان و جنەکان دەسەڵاتێکی زۆر عەجیبیان هەبوو، کە وەحی هات ئیتر ئەو دەسەڵاتەیان

لێسەندرایەوە، چونکە بەهاتنی پێغەمبەری خوا زۆر شت لەسەر زەویدا گۆڕانکاری بەسەرداهات.

سەڵاح: چۆن کاك ماکوان گیان باسی بکە.

ماکوان: براکەم هەرچۆن پێغەمبەری خوا (ﷺ) شۆڕشی کرد لە سەر زەوی بەو شێوەیەش شۆڕشی کرد لەئاسماندا، پێشتر شەیتانەکان دەچوون هەواڵی مردن و لەدایکبوونی خەڵکیان لە ئاسمانەوە دەهێناو خوای گەورە ئەو دەسەڵاتەی پێبەخشیبوون کاریان دەکرد لەگەڵ ساحیرەکاندا بۆ ئەوەی خەڵکی گومڕا بکەن و سەرلێشیواویان بکەن، کە وەحی هات هیچ دەرگایەك بۆ جنەکان نەمایەوە، شەیتان زیرەی کرد زانی شتێك ڕوویداوە.

بۆچی بۆخۆی و هاوڕێ شەیتانەکانی تری ناتوانێت زانیاری لە ئاسمان وەربگرێت، هەر جنۆکەیەك دەچووە ئەو جێگاو شوێنانەی لە ئاسماندا زانیارییان دەهێنایەوە، ئێستا وای لێهاتووە بە نەیزەك لێیان دەدرێت و دەسووتێنرێن، بەهەزارەها جنۆکەیان کوژرا، تێنەدەگەیشتن ئەو مەوزوعە چیە، بۆ ئەم کەونە وا گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە؟ شەیتان واتا ئیبلیس بڵاوی کردەوە وتی بگەڕێن شتێك ڕوویداوە بیدۆزنەوە، تەنانەت جنەکان لەناو پێست و ناوسکی مردارەوە بوو و سەربڕاوەکاندا خۆیان دەشاردەوە ئەوەندەیان لێکوژرا بوو لەسەر دەمی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تا ئەوکاتەی کە پێغەمبەر تەشریف دەبات بۆ طائیف یەك جن و شەیاطین نەیانزانیبوو کە پیغەمبەری خوا هاتووە، تا ئەوکاتەی کە لە وادی نەخلە لە نێوانی طائیف و مەککەدا نوێژ دەکات و جنەکان گوێیان لێی دەبێت.

ئیتر لەوکاتەوە شـەیتان خۆی دەکات بە مرۆڤ و بەناوی شـێخی نەجدی دەچێتە دارولنەدوە و لەگەڵ ئەبوجەهل بڕیاری کوشتنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەدەن.

لە پڕ ڕوناك خان هات بۆ ئەو ژوورەی کە من و کاك سەڵاح دانیشتبووین وتی: درەنگە با بڕۆین بەیانی منداڵەکان قوتابخانەیان هەیە.

سەڵاح: کاك ماکوان ناکرێت تۆش بێیت بۆ ماڵی ئێمە؟

ماکوان بەخوا منداڵەکانی منیش بەیانی یەکێکیان بۆ باخچەی سـاوایان و ئەوی تریش قوتابخانەی هەیە.

خوا حافیزیمان لەیەك کرد و ڕەوانەم کردن تا ناو سەیارەکەی خۆیان.

لەگەڵ سـەڵاح قسـەی کۆتایمان دەکرد و ئەوەندەم زانی ڕوناك خان هاواری لێهەڵساو ڕایکردە دەرەوە لە پێشی سەیارەکدا هەرچی تەماشام کرد هیچ نەبوو، پڕ بەدەمی ئەیقیژاند و هاواری دەکرد.

## هاوار و قیژەی بەتاڵ

لەدوای ئەوەی شەو لەماڵی ئێمە هەستان و ڕۆیشتنەوە بەرەو ماڵی خۆیان بۆ ڕەوانەکردنیان و خوا حافیزیان لەگەڵ خانەوادەی کاك سەلاح هاتمە دەرەوە.

لەپڕ هاوارو قیژە لە ڕوناك خان هەڵساو لەسەیارەکە هاتە خوارەوە هێشتا من و سەلاح لەبەر دەرگا بووین، باسی ئەوەی دەکرد کە چۆن کارێکی دەست بکەوێت، هاواری لێهەڵسا.

وتمان چییە؟

ڕوناك: مارێك لەناو سەیارەکەدایە، بەپەلە ڕامانکرد تەماشا دەکەین منداڵەکان پێدەکەنن و مارێکی لاستیکیان بۆ داناوە، ئەویش لە ترسا هاواری لێهەڵساوە.

ڕۆشتن و منیش ئاسایی کات و ژیان و شەو ڕۆژم بەڕێ دەکرد.

شەوێکی هاوینی نەرویج خەوم لێنەدەکەوت بەرەو کەناری دەریا چووم بۆ ماسی گرتن، خەریکی پرۆژەی دروستکردنی دوکانێك بووم مێشکم زۆر سەرقاڵ بوو، شەوی وا هەبوو تووشی بیرکردنەوەی زۆر دەبوم ئیتر خەو لە چاوم دەزڕا. نەمدەویست وام لێبێت لەناو جێگادا بمێنمەوە، هەڵدەستام دەچوومە کەناری دەریا یاخود گوێ چەمێك بۆ سافکردنی مێشکم و تا ماندوو ببم و بە ئاسانی خەوم لێبکەوێت.

ئەوشـــەوە خەڵوزم گەشـــاندەوە، چام لێناو دەســـتم کرد بە قولاپ هەڵدان بۆ ماســی گرتن، خوای گەورە ڕزقی باشــی دام زیاد لە ٢٠ ماسـیم گرت و دەسـتم کرد بە هەڵدڕین بۆ برژاندن.

ئەوەندەم زانی دوو کەس ڕووە و من هاتن لەدڵی خۆمدا وتم بەخوا ئەمانە جەماعەتی حەزقیل-ن یان ئەوبەرین جەماعەتی سـەسـیل-ن منیش زۆر گوێم پێنەدان وتم ماڵیین خۆیان دێن نزیك دەبنەوە.

هـاتنە لام و بە نەرویجی ســـڵاویـان کردو منیش بەکوردی وتم: هەرچی نەرویجییە خەوتوە بێجگە من و ئێوەی جنۆکە کێ بەخەبەرە؟ ئێســـقـانی ماسییەکان دەخۆن یان ماسیەیکان بەکاڵی دەخۆن؟

تێنەگەیشـــتن، دیســـان بەنەرویجی بەمنیان وت تێناگەین دەڵێیت چی، وەڵامم نەدانەوە، هەر پێدەکەنیم ئەوی تریان وتی دیارە زمان نازانێت.

کەوای وت دەســـتم کرد بە قســـە کردن لەگەڵیاندا، وتم ببورن وامزانی چەند کەسێکی هاوڕێی خۆمن.

نەرویجییەکیان وتی بۆ هاوڕێکانی خۆت ناناسیتەوە؟

پرسیارەکەی مەعقول بوو، بەڵام نەم دەزانی چۆن وەڵامیان بدەمەوە. ڕاستەوخۆ وتم: ئەزانن جن چییە؟

وتیان: بەڵێ دەزانین

ماكوان: هاوڕێكانی من جنۆكەن زۆر جار دێن لەسەر شێوەی مرۆڤ، جا ئەوە چاوەڕێی ئەوانم دەكرد بەیەكەوە نانێك بخۆین.

هەردوو نەرویجییەكە تەماشای یەكیان كردوو بە پەلە ڕۆشتن ، هیچیان نەوت تەنانەت ماڵ ئاوایشیان نەكرد. منیش دەستم كرد بە برژاندی ماسی.

گوێم لەدەنگی هاوارو نركە بوو، لەدەنگی منداڵ دەچوو. منیش لەسەر دەریا سەداو دەنگێكی خۆشی هەبوو، قیژەی نەوڕەسەكان و دەنگی شەپۆلی ئاو و جاروباریش فوویەكم پیا دەكرد گۆرانییەك یان سروودێكم دەوت.

دەنگە كە دوور بوو، بەڵام هەستم دەكرد گوێم لە شتێكی ئاسایی نییە، ئەو دەنگە هاواروناڵەیە.

ئەو چەقۆیەی كە ماسییەكەم پێ پاك دەكرد و دانەیەكی تری زیادەشم پێ بوو، خستمنە گیرفانم و بەرەو دەنگەكە ڕۆشتم.

تا دەهات دەنگەكە زیاتر دەبوو وەك ئەوە وابوو كە كەسێك دەمی بەسترا بێت و هاواری یارمەتی بكات بە لووت هاواری دەكرد، دەنگی ئافرەتیش بوو ترسام لەوەی نەكو ئەو نەرویجییانە بۆسەیەكیان بۆ من دانابێت. لەدڵی خۆشمدا دەم وت لەوانە دوو دڵدار بن لێرەدا لە قەراغی دەریاكەدا ئیسراحەتی خۆیان وەرگرتبێت ، چونكە نەرویجییەكان ئەوكارە دەكەن.

هەرچۆن بوو نزیك بوومەوە كە تەماشام كرد كچێكی زۆر جوانە بەستراوەتەوە، هەموو گیانیشی جێگای پێداكێشان و سووربوونەوەیە، جلەكانیشی شەهوەتی پیاوی پێوەیە و تەڕی پێوە دیار بوو.

زۆر ترســام ڕامکرد بیکەمەوە پەشــیمان بوومەوە، ئەی خوایە گیان بیکەمەوە دەســتم بەری بکەویت دوای بڵێن ماکوان تەعەدای لێکردووە، خەڵکیش خوا خوای قسـەیەکیانە بۆ منی دروسـت بکەن، ئاخر ئەگەر نایکەمەوە ئەو ئافرەتە خەریکە دەخنکێت.

خوای گەورە کردی خێزانم دەستکێشی لاستیکی خستبووە ناو ئەو سەبەتەی کە کەرەسـتەی ماسـی گرتنەکەی تێدابوو بە پەلە رامکردە و وێنەیەکم گرتو بە ڤیـدیۆو بەنەرویجی وتم ئەوە من ئەمەم دۆزیوەتەوە هیچ پەیوەنـدی نییە بەمنەوە کامێرای ڤیدۆکەم لەســەر بەردێك رووە ئافرەتەکە داناو دەســت کێشەکانم کردە دەستم و دەمیم کردەوە.

لێم پرسی ئەوە چی ڕوویداوە؟

کچەکە: ئەم شــەو لە ئاهەنگێك بووین دوو کوڕی رەفیقمان منیان هێناوەتە دەرەوە لەگەڵم ڕایانبواردوە و بە جێیان هێشتووم!

ماکوان: باشـە تەلەفون دەکەم بۆ پۆلیس، بەس من دەسـتت ناکەمەوە با ئەوان بێن بتبینن کەوایان لێکردوویت.

دەســتی کرد بەگریان، نا پێویســت ناکات تەلەفون بکەیت خۆم کێشــەکە چارەسەر دەکەم.

ماکوان: کێشــەی چی چارەســەر دەکەیت؟ ئەوانە تۆیان بەســتۆتەوە بەزۆر لەگەڵتا ڕایانبواردووە، خۆت باش دەزانیت لە یاســای نەرویجدا ئەو کارە زۆر خەتەر و ترسناکە.

کچەکە هەر دەیوت بمکەرەوە واز لەوە بهێنە دڵنیابە چارەسەر دەبێت. هەستم دەکرد باری دەروونی تەواو نییە گریانێکی زۆر بەکوڵ دەگریا.

ماکوان: ناوت چییە؟

کچەکە: تومینە.

ماکوان: ئاخر نابێت من بتکەمەوە ئێستا چی دەڵێیت، دوایی بینێن بەسەر مندا؟

تومینە: نا دڵنیابە شتی وا ڕونادات، ئەوان دێنەوە باڵم و دەمم دەکەنەوە ئەوە هەر منیان ترساندوە.

سەرم بەرزکردەوە لەناو بەردی کەنار دەریاکاندا تەماشا دەکەم دووکوڕەکە ڕووە و لای ئێمە دێن.

ماکوان: ڕاست دەکەیت ئەوە ڕووە و ئێمە دێن، چی بکەم؟

تومینە: بمکەرەوە با ڕاکەم، چونکە دیسان تەعەدام لێدەکەنەوە.

ماکوان: ڕێگام پێ بدە پەیوەندی بکەم بە پۆلیسەوە؟

تومینە: نا پێویست ناکات.

ماکوان: باشە قسە بکە تا ئەوان نزیك نەبوونەتەوە با دەنگەکەت و وێنەکەت تۆمار بکەم،دوایی دەیخمە سەر ئەوان من خۆم دەشارمەوە ئەگەر وایان کردو ئەوان بوون.

تۆ دڵنیابە خوێنی خۆم لێرە ئەڕێژم لەسەرت، بەڵام ئەگەر وانەبوو ئەوکات هاوکاریت ناکەم. دڵنیابە خۆم دەشارامەوە ئەو کامێرایە با لە جێگای خۆی بێت وێنەتان بگریت، ئەبێتە دیکۆمێنت بۆ تۆش و بۆ منیش باشە، خەمت نەبێت من چەکم پێیە.

خۆم حەشاردا لە خواروی ئەوانەوە و لە بن تاشە بەردێکی گەورەدا چاوم لەسەری بوو. دەمیم بەستەوە بەشلی، تەلەفونەکەشم بە ڤیدۆ وێنەی دەگرێت.

دوو کەسەکە هاتنەوە لای و گوێم لێی بوو ناوی تومینە-یان برد ناوەکە ڕاست بوو، پێیان وت ئێستا جارێکی تر لەگەڵت ڕادەبوێرین، بەڵام دەنگە دەنگ مەکە دوایی دەڕۆینەوە بۆ ماڵەوە.

تەماشام کرد هەردووکیان زۆر بە جوانی قسەی لەگەڵ دەکەن، یەکێکیان پێی دەڵیت ئازیزەکەم و ئەوی تریشیان پێی دەڵێت گیانەکەم.

خەریک بوومێشکم ئەتەقی، کەچی تومینە پێی وتن: کەسێك کامێرەی داناوە بۆتان ئاگاتان لەخۆتان بێت. لەبەر تەلەفونەکەم ڕامکردە دەرەوە بۆیان بە دوو چەقۆوە.

یەکێکیان نیوەی پانتۆڵەکەی داکەنرابوو کە منی بینی بە دوو چەقۆوە ڕایکرد، هەر نەمزانی چی بەسەر هات. ئەوی تریشیان ئەژنۆی شکا وایان زانی دێو درنج و عیفریتم لەبەردەمم دانیشت و خێرا دەستی کچەکەی کردەوە و وتی ئێمە هیچی خراپمان نەکردووە. دەستی کردە ملی کچەکە و زۆر بەئاسانی ڕۆیشتن، کچەکەش ماچێکی کرد. خەریك بوو لەداخا دوو چەقۆ لە خۆم بدەم!

حەپەسام بووم ئەو کچە فەقیرە و ئەو دوو هەتیوە پیسە ئەبێت باس و ژیانیان چی بێت.

تەلەفونەکەم هەڵگرتەوە، خەریك بوو بڵێم با سـێلفیەك بگرین لەبەر ئەوەی زۆر نامۆن لای من!

رۆیشتن دوور کەوتنەوە کچەکە زۆر بە ئاسایی لەگەڵیاندا ڕۆیشت.

بەدیار ڕۆشـتنی ئەوانەوە حەپەسـابووم و بۆم حەل نەدەکرا، هاتبووم کەمێك ئیسراحەت بکەم کەچی ئاڵۆز تر بوو مێشکم.

هاوارم دەکرد ڕاقی، حەزقیل، حەنانە خۆ ئەمە فیلم نییە ئێوە لەگەڵ من دەری بکەن دوایی عاجز دەبم.

کەچی نەرویجییەکە لەگەڵ کچەکە تەماشـای کردم و وەسـتا، وتی قسـە لەگەڵ ئێمە دەکەیت؟

وتم: نا لەگەڵ جنۆکە قسە دەکەم، کەوام وت هەردووکیان باڵیان گرت لەترسان، زۆر خێرا دەڕۆشتن.

بیرم لەوە کردەوە بڕۆم بۆ لای سـەیارەکەم نەکو لەداخا شـتێکی لێبکەن، منیش بەدوایاندا رۆشـتم کەتەماشـم کرد وا خەریکن لە تەنیشـت سـەیارەکەی خۆیاندا جارێکی تر کچە دەبەسـتنەوە. کچەکەش خۆی دەسـتی دێنێتە پێشـەوە. کە منیان بینی وازیان هێناو جارێکی تر دەستی کچەکەیان کردەوە.

چومە لای سەیارەكەی خۆم، سەیارەیەكی سیبای - مۆدیل نوێیان پێ بوو. پشتی سەیارەكەی خۆم كردەوە، وەك بڵێیت بۆ شتێك دەگەڕێم ئەوان هەر تەماشای منیان دەكرد منیش خۆم سەرقاڵ كردبوو بۆ ئەوەی بڕۆن نەجاتم بێت، شتێك لەسەیارەكەم نەكەن و بچمەوە قولاپ و مەقەڵی شتەكانی ترم كۆكەمەوە كاتژمێر ١٢ی شەو بوو.

ئەوەیان كە دەرپێكەی داكەوتبوو تەماشای منی دەكردو پێدەكەنی،

داخم زۆر لەدڵدا بوو وتم ئەرێ بەڕاست ئێوە زۆر سەیرن، وەرە بزانم بۆ وا پێدەكەنی؟ بۆ وا دەكەن لەو كچە بەستەزمانە؟ باشە ئێوە نازانن هەموو ئەو كارەی كردوتانە لای من تۆمار كراوە؟ ئەم كارە قیزەونەی ئێوە چییە بۆ وا دەكەن؟

ئەوەی كە ڕایكرد وتی: ئاخر كچەكە پێی خۆشە وای لێبكەین!

ڕوومكردەوە تومینە پرسیم ڕاست دەكەن؟

تومینە بەڵێ وایە، ئەگەر ئازارم نەدەن ناتوانم سێكس بكەم!

بە كوردی وتم ئەی ڕۆڵە گوو بەڕیشی باوكتان بۆ خۆتان و فیعل و ئەخلاقتان.

دەستیان كرد بە پێكەنین ویستیان لێم نزیك ببنەوە، وتم نزیك نەبنەوە بەجدی ئازارتان پێدەگەیەنم ئەتاننێرم بۆ لای شەیتان. دەی لەعنەتتان لێبێت بۆ چ حەزو ئارەزوویەكتان هەیە.

تومینە جا خۆ من بەتەما بووم ئەم شـــەو تیروپڕ بۆ تۆ بگریم، ئەمە تۆ خۆت واتكردووە لە خۆت.

تومینە: سوپاس مەگری.

بەو هەموو فرمێسك و چڵم و خۆڵەوە پێدەكەنێت و دەڵێت: بەڵێ، ئاساییە!

مـاكوان: شـــەرت بێـت ئەو وێنەت لە فەیســـبوك بڵاو بكەمەوە لەگەڵ ئەم دووكیسە گووەی تردا!

زانیـم ئەمـانە پیـاوی ئەوەنین، گەڕامەوە بۆلای مەقەڵی و چـاوو خەڵوزو ماسییەكانم.

هەر بەو ڕێگایەدا هاتم تەماشـــام كرد مارێكی زۆر جوان لەســـەر ڕێگاكەمدا تۆپیوە، لام ســـەیر بوو وتم چۆن لەوســـەر نەمدیوە دوای لەدڵی خۆمدا وتم بەخوا ســـەرقاڵ بووم بەو كەســـە پیســـانەوە بۆیە نەمدیوە. جوانی پێســـت و لاشەكەی سەرنجی راكێشام، سەری شكڵی ماسی هەبوو لاشەشی هەمووی مار بوو وا هەســـتم كرد مار ماســـی بێت و لە ئاوەكەوە هاتبێتە دەرەوە. گوێم لەدەنگێك بوو لەپشـــتمەوە وتی: ماكوان بیشـــارەوە و كفنی بكە و بیكە بەژێر خۆڵەوە.

كە ئاوڕمداوە هیچ دیار نەبوو!

لەدڵی خۆمدا وتم ئەمە خەیاڵە بزانە ماندووم مێشـــكم وام پێدەڵێت، ویســـتم بڕۆم جێی بهێڵم كەچی دیســـان دەنگەكە بەرز تر بوو وتی: تكایە كفنی بكەو بیشارەوە ئەویش مسوڵمانە و براتە.

ماکوان: کێ کفن بکەم و بەچی کفنی بکەم؟ کێ مسوڵمانە، تۆ کێیت؟

دیسان دەنگەکە هاتەوە، ئەو لاشەیە جنۆکەیە موسوڵمانە مردووە کفنی بکەو بینێژە لە جێگایەکدا.

ماکوان: ئەم مار ماسییە؟

دەنگەکە: بەڵێ، برای موسوڵمانی خۆتە، تکایە ئەوکارە ئەنجام بدە.

یەکسەر فەرموودەکەی عومەری کوڕی عەبدول عەزیزم بیر کەوتەوە کە دەڕوات بۆ مەککە لەڕێگادا لە بیابانێکدا دەبینیت مارێك تۆپیوە.

عومەریش خوای گەورە دەیخاتە دڵیەوە کە ئەو مارە بشارێتەوەو کفنی بکات.

لەدوایدا دەنگێك دێ بە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز دەڵێت: خوای گەورە پاداشتت بداتەوە کە (سەرق)ت شاردەوە سەرق - یەکێك بووە لە جنۆکەکانی هاوڕێی پێغەمبەری خوا (ﷺ). دەنگەکە دەڵێت: پێغەمبەری خوا بە (سەرق)ی فەرمووە کە یەکێك لە باشترین وساڵحترین بەندەکانی ئومەتەکەم کفنت دەکات و دەتشارێتەوە.

ئەو فەرموودەیەم بیرکەوتەوە خێرا کراسەکەم داکەند، فانیلەکەی ژێرەوەم سپی بوو مار ماسییەکەم تێکردو بردم لە جێگایەکدا چاڵێکم بۆ هەڵکەندو لەو چاڵەدا ناشتم بە فانیلەکەی خۆمەوە.

هاتمەوە بۆلای کەرەستەکانم تەماشا دەکەم کەسێك دانیشتووە خەڵوزەکە دەگەشێنێتەوە!

## جنۆكه و مرۆڤى مەسيحى و كۆتايى دنيا

دواى ئەوەى كه مارماسييەكەم ناشت گەڕامەوە بۆلاى ئاگرەكه و كەرەستەى ماسيگرتنەكەم و بينيم كەسێك خەريكى گەشانەوەى ئاگرى مەقەڵييەكەمە و منيش وەك مسوڵمان سڵاوم لێكرد و وتم: السلام عليكم.

شـێخ بەرقان: وعليكم السـلام مامۆسـتا ماكوان، خۆشـحاڵم كه بەخزمەتت شادبووينەوە.

ماكوان: هەروەها منيش جەنابى شـێخ زۆر خۆشـحاڵم، بەڕاسـتى لەو ڕۆژەوە زۆر حەزم دەكرد بە خزمەتى جەنابتان بگەمەوە، ڕاسـته بەڕێزتان جنۆكەن و منيش مرۆڤ، بەڵام سـبحان الله خۆشـەويسـتييەكى زۆر سـەيرم هەبوو بۆ جەنابتان. زۆر هەسـتم بە نزيكى لە جەنابت دەكرد ، بەڵام بەداخەوە نە توانيم بەخزمەتت بگەمەوە نە توانيشم بێمە ناو باڵەخانەكەى جەنابتان.

شـێخ بەرقان: براكەم ئەو ڕۆژە تەنها وەك ڕێزێك و خۆشـەويسـتييەك بۆ بەرێزت وامان وت، دەنا ئێمە نە باڵەخانەمان هەيەو نە ئەو جۆرە ژيانەى كه ئێوە دەژين. ژيانى ئێمەو ئێوە دوو سيستەمى جياوازە.

ويسـتم ئەوەت پێبڵێم هەرگيز بير لەوە مەكەرەوە كه ژيان و بژێوى ئێمە وەك ئێوە نييە، ئەوەى دەيەوێـت لە ئێمە تێبگـات دەبێـت لە جۆرى ئێمە بێت، دەنا قورسە ژيانى ئێمە بە ژيانى ئێوە بەراورد بكرێت.

ماكوان: ئەی شێخ ئەوە چی بوو كە من بینیم؟

شێخ بەرقان: تەنها لەبەر چاوی تۆدا وابوو، دەنا ئەوە تەنها گردێك بوو هیچی تر.

ماكوان: ئەی ئەوە نابێت بە سـیحر كردن و جادوو لەمن، ئەویش هەر وەك ساحیرەكان نییە كە دەكرێت؟

شـێخ بەرقـان: ئەگەر لە جیهـانی ئێوەدا بكرێـت بەڵێ وایە، بەڵام تۆمـان بانگكردە جیهانی خۆمان، لەبەر ئەوە تۆ واز لەو باسە بێنە، چونكە هەرچیت بۆ باس بكەم لێم تێناگەیت و ناشتوانم تێتبگەیەنم.

ماكوان: بۆ چییە، ئەوەندە هاوكێشەیەكی قورسە؟

شێخ بەرقان: بەڵێ قورسە، ئەگەر نمونەیەكی خۆتت بۆ بهێنمەوە كە دەڵێیت ئەگەر دوو هەورامی بگەن بەیەك بۆچی بە هەورامی قسە دەكەن؟!

ماكوان: كە بوویت بە هەورامی دەزانیت.

شـێخ بەرقـان: كەواتە تۆش كە بوویـت بە جنۆكە و هـاتیتە نـاو ژیـانمـان دەیزانیت.

ماكوان: جوانە، ئەی باشە ئێوە لە كوێ دەژین شێخ گیان؟

شێخ بەرقان: جۆرێكمان لە گەڵ ئێوە دەژین، عەرەب ناوی ناوین مەعمەرون واتـا ئەوانەی لە ئـاوەدانیـدا دەژین. جۆرێكی تر لە ئەشـكەوت و كون و كەلەبەرەكانی ئەم جیهـانەدا ژیـان و خـانەوادەیـان پێـك هێنـاوە. هەنـدێكی

ترمان لە ئاسماندا دەژین و هەواییین. هەندێکی تریشمان لە ناو ئاودا دەژین. ئا بەو شێوەیە.

ماکوان: بەڵێ، خوا پاداشـتت بداتەوە خۆشـحاڵم بووم شـێخ بەرقان گیان کە بەخزمەت جەنابتان گەیشمەوە؟

شێخ بەرقان: خوا پاداشتی خێری تۆش بداتەوە بۆ ناشتنی ئەو برایەت و ئەو برایەمان. ماندوومان کردیت پاداشتەکەی لای خوای پەروەردگارە، جزاك الله.

ماکوان: یا شـــیخ ئەو دەنگە جەنابت بوویت کە تۆزێك لەمەو پێش قســـەت کرد؟

شـــێخ بەرقان: نا، ئەوە برایەکی ترە ئەو ناتوانێت خۆی ئاشـــکرا بکات وەك ئێمەو مانان!

ماکوان: بۆ هەمووتان ئەو توانایەتان نییە؟

شێخ بەرقان: نەخێر، هەموومان ئەو توانایەمان نییە، بەڵکو خوای گەورە ئەو رێگایەی داوە بەهەندێك لە جنۆکەکان کە توانای خۆ گۆڕینیان هەیە بۆ سەر شـێوەی مرۆڤ. هەندێکیش بۆ شـێوەی ئاژەڵ هەندێکی تریش لە شـێوەی تارمایی دا خۆی نمایش دەکات.

ماکوان: کەواتە هەمووتان ناتوانن دەرکەون وەك ئێستای جەنابتان؟

شـــێخ بەرقان: هەموو دەتوانن بەڵام دەبێت خۆیان ئەو توانایە بەدەســـت بهێنن کە خوای گەورە پێی بەخشـــیون و رێگای پێدراوە، ئەویش هەر وەك

لای ئێوەی مرۆڤە کە چۆن دەبنە قیادی و ســـەرکردە، لە ناو ئێمەشـــدا ئەم قۆناغە بەهۆکاری ئەزموون و هەندێك تایبەتمەندی ترە کە بەدەســـتی دەهێنین. جا ئەم جۆرە دەرکەوتنانە لە ناو ئێمەشـــدا کافرو موســـوڵمانان دەتوانن بەدەستی بهێنن.

ماکوان: ئەمە زانیاری نوێ بوو بۆ من، وامزانی هەموو دەتوانن خۆتان بۆ مرۆڤەکان ئاشکرا بکەن.

شێخ بەرقان: نا، یەکجار بەو شێوەیەش نییە خۆ ئێمە ئەوەندە دەسەڵاتمان نییە، جارێ ئەگەر شـــەیتانەکان توانایان هەبوایە هەموو خۆیان دەکرد بە مرۆڤ و دەچوون بۆ ئیوە فیتنەی دنیایان دروست دەکرد ، بۆ نمونە دەچوونە لای ژنان لەگەڵیاندا دەخەوتن و خۆیان دەکرد بە هاوســـەرەکەی، هەرگیز ناتوانن ئەوە بکەن مەگەر ئەوکاتەی کە هەردوو هاوســـەرەکە دەچنە لای یەکتری و ناوی خوای پەروەردگار ناهێنن، لەوکاتەدا عەورەتی ئافرەتەکە دەبینی و هەندێکیش لە زانایان دەڵێن بەشدار دەبێت لە چێژی سێکســـی لەگەڵ ئەو ژنو مێردەدا!

جەنابیشـــت دەزانیت مامۆســـتا ماکوان فەرموودەکە لە بوخاریدایە دەفەرموێت: « بِسْمِ اللَّهِ، اللَّهُمَّ جَنِّبْنَا الشَّيْطَانَ، وَجَنِّبْ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا.

واتە: خوایە گیان بەناوی پیرۆزت، پەروەدگارا بمانپارێزە لە شـــەیتان و بەدوورمان بخەرەوە لە شەیتان، لەگەڵ ئەو نەوەیەی پێمان دەبەخشیت

ماکوان: بارك الله فيكم بەڵێ، زۆر ڕاستە.

شێخ بەرقان: خۆ ئەگەر هەموو بیانتوانیایە خۆیان ئاشکرا بکردایە ئەوا خۆیان دەکرد بە مرۆڤ و خەڵکیان دەکوشت لەسەر شێوەی مرۆڤەکان و فیتنەی زۆریان دروست دەکرد لە نێوانی خەڵکیدا، جنۆکەو شەیتان واتا ئێمە بەگشتی ئەو توانایەمان نییە. ئەوەش کەخۆی ئاشکرا دەکات لە دوو هۆکار بەدەر نییە هۆکاریکی سیحرە، هۆکاری دووەمیشی بۆماوەیەکی دیاری کراوە بۆ گەیاندنی هەندێك زانیاری. یاخود پاراستنی برایەکی موسوڵمانی خۆمانە لەدەست شەیتانەکان کە خۆیانی بۆ ئاشکرا دەکەن بۆ ئەوەی توشی هەڵدێرو سەر لێشێواو نەکەن کە هەندێك لەمرۆڤەکان بوون بەداخەوە.

ماکوان: وەڵڵا ڕاستە شێخ بەرقانی برام زانیاری باشمان ئەدەیتێ، ئافاقی بیرو هۆشم زۆر فراوان دەکەیت. خوای گەورە پاداشتان بداتەوە

شێخ بەرقان: بەڕاستی ئەو شەوە لەخزمەت جەنابتاندا بووین لەگەڵ کۆمەڵێك برای تردا لەخزمەت بووین لەماڵتان کە ماڵی کاك سەڵاح هاتبوون، باسی سیرەی پێغەمبەری ئازیزت کرد (ﷺ) زۆر خۆشحاڵ بووین بە باسەکە، بەڵام بەداخەوە باسەکە زوو کۆتایی هات، ویستم هەندیك شتی تر زیادە بخەمە سەر قسەکانت.

ماکوان: بەڕاست لە لای من بوون؟ ئەی قسەتان بکردایە با زیاتر لەخزمەتتاندا بوومایە، بەڵام شێخ بەرقان باشە ئەی من لەماڵی خۆمدا خۆم ڕووت دەکەمەوە ئەی ئێوە من دەبینن بەو شێوەی کە ڕووتم؟ ئایا ئەوە جائیزە؟

شێخ بەرقان: ئێمە وەك مسوڵمان ناچینە تایبەتمەندی هیچ کەسێك،جا با کافرو یان مسوڵمان بێت، چونکە حەرامەو جائیز نییە و بەدوای ئەوشتانەوە

ناگەڕێین و بزانین. شـــتی واش ڕوو ئەدات لە چرکەســـاتدا لەو جێگایەدا نامینێن، بەڵام خۆت دەزانیت ئەگەر زیکرەکان بخوێنریت شـــەیتانەکانیش نامێنن و ماڵ چۆڵ دەبێت و خۆت خاوەن ماڵی.

ئەگەر ماڵێك یان مزگەوتێك زیکری خوای گەورەی تێدابێت ئەوە بۆن و نوری دیارە و ئێمەش زوو بەیەکتری دەگەیەنین و دەچینە ئەو مەجلیســـانە. بۆ زانیاریت وابزانم کاتی خۆشـــی حەزقیل باســـی کرد بۆت، زۆریك لە برایانی ئێستای ئێمە لەڕێگای وتارو موحازەراتی ئێوە و مانان موسوڵمانان بوون.

ماکوان: بەڵێ ڕاســـت دەفەرمووی باســـی کرد، خوای گەورە لێمان قبوڵ بکات ئەوەش فەزڵی خوای پەروەردگارە بەســـەرمانەوە، لە قیامەتدا بەبێ ئەوەی بە خۆمان بزانین ســـەدان خێرو پاداشـــت دێتە ســـەر حســـابمان کە بە خۆمان نەزانیوە، جنۆکەمان موسوڵمان کردووە، بەڕاستی ئیسلام نیعمەتە.

شێخ بەرقان: ڕاستە، بەڵام لە ڕاستیدا خەڵک زۆربەی موسوڵمانن و ئیسلامیان هەڵبژاردوە، بەڵام ڕاســـتیت دەوێت ماکوانی برام بانگەواز کردن نیعمەتە کە خەڵکی بەو نیعمەتە گەورەیە نازانێت و تەمەڵیی دەکەن.

ماکوان: زۆر راســـتە، شـــێخ بەرقان گیان کاتی نوێژی بەیانییە با نوێژەکانمان بکەین.

شـــێخ بەرقان: بەڵێ بەدڵنیاییەوە فەرموو دەســـتنوێژت هەیە؟ با نوێژ ئەنجام بدەین.

ماکوان: نەخێر، من دەســـتنوێژم نییە و بەیارمەتیت خۆم دەخەمە ناو ئەو ئاوەو دێمەوە دەرەوە نوێژەکانمان دەکەین.

ویســـتم بڵێم شـــێخ بەرقان تۆ پێش کەوە، کەچی شـــێخ بەرقان وتی ئێوە خەلیفەن لەسەر زەویدا و دەبێت ئیمامەت لە ئێوەی ئوممەتی محمد (ﷺ) بێت.

لە ڕووی شـــەرعیەوە نەم بیســـتبوو هەرگیز جنۆکە ئیمامەتی کردبێت، بۆیە نوێژی ســـونەتم کردو دوایی نوێژی بەیانیم دابەســـت، بە جەهری خوێندم و دوای تەواو بوون کە ئاوڕم داوە کەســـم نەبینی ویردەکانم خوێند، کەمێکی پێچوو شـــێخ بەرقان پەیدابوو لە جێگای خۆیدا من پشـــتم لەو بوو ڕووم لە قیبلە بوو.

شێخ بەرقان: خوا قبوڵی بکات نوێژو جەماعەتێکی خۆش بوو لەڕاستیدا ئارام بەخش بوو، خەوت نایە ماکوان؟

ماکوان: لەخزمەت جەنابتاندام، خەوی چی؟ ئەزانی چی یا شـــێخ تۆ خۆت دەزانی من دەستی نووسینم هەیە. جا ئەم ڕووداوانە هەمووی دەنووسمەوە و دەبێتە مێژوو لەبەر ئەوە هەتاوەکو ئێوە من جێ نەهێڵن من چۆن ئەم هەلانە لە دەست خۆم ئەدەم.

شێخ بەرقان: بەقسەی من دەکەیت مەینووسە، چونکە دوایی خەڵکی بڕوات پێ ناکات، زەمەنەکە زەمەنی شتی وا نییە، دەنا بۆ ئێمە ئاساییە.

ماکوان: پێ دەچێت لەمەیاندا لە خەڵکی تر جیاوازتر بم، ئەوەی کە خۆم بڕواو قەناعەتم پێ بێت و ڕاســت بێت و دادپەروەری خوای لەگەڵدا بێت و تێپەڕ نەکات لە قورئان و ســوننەت، بڕوا بکە حســاب بۆ یەك تاکە بەشــەر ناکەم لەســەر ئەم گۆی زەوییەدا، چونکە بە هاوڕێکانی خۆشــمم وتوە نە بەتەمای ئەوەم پارە بە ئیســلام پەیدا بکەم، نە دەچمە ناو حیزب و پەرلەمان و وەزارەت نە بەدوای ئەوەشەوەم خەڵکی شوێنم کەوێت.

ئینجا خۆ من چێشــتخانەم نییە تا خەڵکی بۆ بانگ بکەم، ئەمەوێت زانســت فێری ئەو خەڵکە بکەم کە پەیوەندی هەیە بەســەر بیرو باوەڕەوە وەریگرت قازانجی خۆیەتی وەرینەگرت خۆی بەرپرسە لە دنیاو قیامەت.

شــێخ بەرقان: دە مادام وایە هەموویت دەســت دەکەویت و خەڵکیش ســوودمەند دەبێت. ئامۆژگاریت دەکەم هەوڵمەدە خەڵکی ڕازی بکەیت، هەوڵ بدە خوا رازی بکە، هەموو جن و ئینست بۆ ڕازی دەبێت.

ماکوان: ئەرێ بەڕاست ئەوە چی بوو کە ویستت زیاتر سوودمان پێبگەیەنیت لە ڕووی سیرەی پێغەمبەری خواوە (ﷺ).

شــێخ بەرقان: دەمەوێــت ئەوەت پێ بڵێم؛ کە جیهانی ئێمە هەرگیز لاواز نەبووە بە گوێرەی ئەو کاتەی کە پێغەمبەری ئیســلام محمد (ﷺ) هاتووە، زۆر شتمان لێ وەرگیراوەتەوە لەو تواناو هێزانەی کە پێشتر هەمان بووە.

بۆ نمونە پێشــتر وەك خۆت فەرمووت کە جنۆکە و شــەیتانەکان دەیانتوانی شتێك لە غەیب بزانن بە هۆکاری فریشتەکانەوە.

ماکوان: بۆ ئێوە فریشتە دەبینن؟

شێخ بەرقان: هەندێك لە شەیتانەکان دەیبینن بە هۆکاری ئیبلیس-ەوە، خوای گەورە توانایەکی داونەتێ، ئیبلیس دەتوانێت فریشـــتە ببینیت، هەندێکی لە شـــوێنکەوتوانی خۆیـان فێری ئەوە کردووە کە چۆن دەبینرێن، ئەویش هەر خوای پەروەردگار ئەو هێز و توانایەی بەخشیوە بە خۆی و دارو دەستەکەی.

ماکوان: شێخەی برام بەڕاست تۆ ئیبلیس-ت دیوە؟

شـێخ بەرقان: نەمدیوە تا ئێســتا، ئەگەر بیشـی بینم ئەو من دەکوژێت و من هیچم بۆناکرێت.

ماکوان: ئەی ناتوانن یەکێك لە ئێوە لەناوی بەرێت؟

شـێخ بەرقان: دەسـتی کرد بە پێکەنین، ئەوە وەعدی خوایە شـەیتان مرۆڤێك دەیکوژێت کە ئێستا لەسەر زەویدا نییە.

ماکوان: تێنەگیشتم کێ شەیتان دەکوژێت؟

شێخ بەرقان: ئەبێت مرۆڤێك بیکوژێت، خوای گەورە بەدەستی ئێوەی مرۆڤ لە ناوی دەبات.

ماکوان: ئەم شـــەیتانەی خۆمان مرۆڤ دەبێت بیکوژیت؟ جا زوو قســـەت بکردایە، ئەگەر وایە من دەچم دەیکوژم، ئەگەر بە کوشـــتنی خۆشـــم تەواو بێت با ئەو خەڵکە لەشـــەڕی شـــەیتان نەجاتی بێت. بەس ئەمە لەڕووی شەرعییەوە جێگای دەبێتەوە؟

شێخ بەرقان: تۆزێك لە مەوبەر تۆ تەحیاتت دەخوێند لەنوێژی بەیانیدا، گوێم لێبوو لە تەحیاتەکدا دەنگت بەرز کردووە وتت: وَمِنْ شَرِّ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَالِ.. وابوو؟

واتە: پەنا دەگرم لە مەسیحی دەجال، ئەزانی ئەو مەسیحی دەجالە کێیە؟

ماکوان: بەڵێ دەزانم ئەوە دەجالە و بە دەیان فەرموودەم لەسەری خوێندۆتەوە.

شێخ بەرقان: ئاخر ئێوە وادەزانن مرۆڤە، وایە؟

ماکوان: بەڵێ وایە ئەو مرۆڤەو لە خوراسان لە ئەصفهان لەناو گەڕەکی جولەکەکانەوە دەردەچێت و حەفتا هەزار جولەکەی لەگەڵدایە لە ئێرانەوە دێن.

شێخ بەرقان: بەشێکی زۆر لە قسەکەی بەڕێزت راستە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەو دەجالە شەیتانە، واتا ئیبلیس-ە دەبێت بە دەجال.

ماکوان: بەڵێ گوێم لە شتێکی وابووە کە زانایەکی فەڵەستینی بەناوی (بەسام جەرار) ئەویش دەڵێت: کە گوایە مەسیحی دەجال ئیبلیس-ەو بەدەستی مەسیحییێکی تر لەناو دەچێت.

شێخ بەرقان: ئەی بارك الله فیکم، کەواتە مەسیحی دەجال بە مەسیحی عیسای کوڕی مەریەم لەناو دەچێت. بۆیە نە ئێمە و نە ئێوەش ناتوانێت شەیتان لەناو بەرین، بێجگە عیسای کوڕی مەریەم (سەلامی خوای لێبیت)، چونکە جارێ ئەو ئەرکەکەی تەواو نەبووە لەسەر زەوی دەبێت بگەڕێتەوە لە

ئاسـمانەوە، کەواتە دەگەڕێتەوە سـەر زەوی لە دیمەشـق دەیگرێت و بەهەناسەی دەیتوێنیتەوە.

ماکوان: کەواتە ئێوەش ئەو ڕایەی شـیخ بەسـام جرار تان قوبوڵە و بەتەواوی دەزانن؟

شێخ بەرقان: بەڵێ، زۆر دەلیل و نەصی تر هەن کە پشتگیری ئەوە دەکەن لە قورئانو لە سـوننەت، هیچکام لە نەصـەکان ناڵێت مرۆڤەو باس لە مرۆڤ بوونی دەجال ناکات.

ماکوان: مادام وایە من ئەم شـەو لە فەیسـبوك باسـی دەکەم و با ئەو خەڵکە بزانێت.

شـێخ بەرقان: ئەگەر بەڵگەکان بخەیتە ڕوو خەڵکی بڕوا دەکەن تەماشـای بەسام جەرارو فەرموودەکان بکەرەوە، زۆر باش دەبێت و کاتت درەنگە بۆ تۆ ماڵ و منداڵ چاوەڕێتنو ماندوویت بڕۆ بخەوە.

قسـەکەی تەواو کرد خێزانم تەلەفونی کرد وتی: مـاکوان ئەوە خێرە نەهاتیتەوە؟

ماکوان: وا هاتمەوە، ئێستا بەڕێدەکەوم.

## سەسیل و داوایەکی سەیر

شـەو لەماڵەوە دەسـتم کرد بە لایڤەکە، خەڵکی زۆری بەلایەوە سـەیر بوو، هەموو پرسیاریان دەکرد خوای گەورە دەفەرمووێت شەیتان تا ڕۆژی قیامەت دەمێنیتەوە، دیـار بوو زۆرێـك لە خەڵکی زۆر بەسـادەیی لە ئـایەتەکـان تێگەیشـتبوون، وایان دەزانی کاتێك شـەیتان دەڵێت بە خوای پەرەوەردگار بمهێڵەرەوە تا ڕۆژی زیندوو بوونەوە، بەڵام خوای گەورە بە قسـەی ناکات. دەفەرموێـت بڕۆ چاوەڕێ بکە تـا ئەو ڕۆژەی کە بۆت دیـاری کراوە، چونکە ئەگەر ڕۆژی زیندووبونەوە بێت ئەو واتا شـەیتان بە حسـابی خۆی ویسـتی فێڵ بکات لە خوای پەروەردگار و مردنی خۆی تێپەڕێنێت و بە زیندویی تا ڕۆژی زینـدووبونەوە، یـاخود قیـامەت بمێنێتەوە، بەڵام خوای گەورە پێی فەرموو بڕۆ بمێنەرەوە تا ڕۆژی دیاری کراو، نەك قیامەت.

هیچ زانایەك لە ناو ئیسـلامدا نەی فەرمووە و نە ینووسـیوە کە شـەیتان تاقیامەت دەمێنێتەوە. خوای پەروەردگاریش لە قورئاندا بەم شـێوەیە باسـی کردووە و قسەکان ڕوونە.

﴿قَالَ رَبِّ فَأَنظِرۡنِيٓ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ٣٦﴾

واتە: شەیتان وتی: پەرومردگارا، مۆڵەتم بدە هەتا ئەو ڕۆژەی هەموان زیندوو دەکرێنەوە.

﴿قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلۡمُنظَرِينَ٣٧﴾

واتە: خوداش فەرمووی: دەتۆ لە مۆڵەتدراوانیت، نەك قیامەت بەڵکو ئەوەی خوای موتەعال دەیەوێت.

﴿إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْوَقْتِ ٱلْمَعْلُومِ﴿٣٨﴾﴾ [الحجر]

واتە: تا ڕۆژی کاتە دیاریکراو و زانراوەکە، ئەوەشـــی دەڵێت لای خوا دیاری کراوە، لەڕاستیدا هەموو ڕۆژەکان لای خوا دیاری کراوە.

ئەوەندەی کە شێخ بەسام جەرار باسی دەکات دەڵێت[1]: پێ دەچێت شەیتان دوای بەکار هێنانی وەسوەسە خۆی ئاشکرا بکات و لە شێوەی مرۆڤدا خوای گەورە مۆڵەتی پێداوە لەماوەی ٤٠ ڕۆژدا بێتە سەر زەوی، لە ڕۆژی کۆتای ٢٠ ڕۆژەکەیدا بەدەستی عیسای کوڕی مەریم لەناو دەچێت.

لە لایڤەکەمدا خەڵکێکی زۆر دەیانپرســی کاکە خۆ دوای ئەوە خراپە دەســت پێدەکاتەوە؟

ئەوەشـــم بەو خەڵکە بەڕێزە ڕاگەیاند کە مرۆڤ بێجگە لە شـــەیتان چەند شتێکی تر دوژمنییەتی، یەکێك لەوانە نەفسی خۆیەتی، یەکێکی تر شەهوەتە، هەروەها شوبوهاتە. خۆ ئەو کاتەشـی کە ئیبلیس-ی شەیتان لە ناو دەچێت بەدەستی عیسا (علیە السلام) بە ملیۆنەها شەیتانی تر لە دوای خۆی بەجێ

---

[1] _ ڕوونکردنەوەی زیاتری ئەم باسە لەلایەن چەند زانایەکەوە باس کراوە، لە هەموویان بەهێزتر لای من( شیخ بسام جرار) لە یوتیوبدا هەیە، بە ماوەی ٤ کاتژمێر یاخود بە چوار بەش- بەباشی ڕوونی دەکاتەوە. هەروەها شێخ صالح الموغیمیسی باسی دەکات..هتد

دەهێڵێت، پاشان خەڵکی وامان هەیە لە شەیتان زۆر خراپترە. جاری وا هەیە شەیتان پێی دەڵێت لەخوابترسە.

پرسیار لەوە کرا لە باسی چیرۆکی جەساسەو ابن صیاد، باسم کرد کە هەردوو فەرموودەکە پشت ڕاستی ئەوە دەکەنەوە کە دەجال شەیتانە چونکە ماوە و بەردەوام لەژیاندایە. هیچ مرۆڤیك نییە لەســـەر زەویدا ئەوەندە بژی تەنها شـــەیتانە لە جنۆکەیە کە خوای پەروەردگار ئەو تەمەنە زۆرەی پێداوە ، بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ســوێنـد خواردنەکەی عومەری کوڕی خەتـاب (ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت) بێدەنگ بوو کە فەرمووی دەجال ابن صیادە، لە جێگایەکی تریشـدا بە فەرمووده هاتەوە کە سـامری لەسـەردەمی موسـادا دەجالە، سامریش هەر شەیتانە.١

قسـەکانی شـێخ بەرقان لە مێشـکی مندا دەهاتو دەڕۆیشـت، گەیشـتمە ئەو دەرئەنجامەی کە قسەکانی بەرقان و بەسام و دەیان زانای تریش تەواوە.

شـەیتان ڕقی لە مرۆڤە، خوای پەروەردگاریش بۆ بوغزاندنی شـەیتان دەبێت بەدەســـتی مرۆڤ لەناوی بەرێت، ئەو خۆی زۆر بە لووتبەرزو زل زانی لە ئاستی قسەی پەروەردگاردا کە خۆی زۆر پێ گرنگتر بوو لە مرۆڤ، ڕقەکەشی ئەوە بوو کە ئاوەدانی زەوی بەخشرا بە مرۆڤەکان و تەنها بەندایەتی کردنی ئازاد بەخشرایە جنۆکەکان.

خوای گەورە لە قورئاندا باسـی دەکات بۆمان لە باسـی دروسـتکردنی ئادەم و سەرپێچی شەیتان دا دەفەرموێت: لە سوڕەتی الحجردا

﴿فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ۝٢٩ فَسَجَدَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ
كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ ۝٣٠ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰٓ أَن يَكُونَ مَعَ ٱلسَّٰجِدِينَ ۝٣١ قَالَ يَٰٓإِبْلِيسُ مَا
لَكَ أَلَّا تَكُونَ مَعَ ٱلسَّٰجِدِينَ ۝٣٢ قَالَ لَمْ أَكُن لِّأَسْجُدَ لِبَشَرٍ خَلَقْتَهُۥ مِن
صَلْصَٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ۝٣٣ قَالَ فَٱخْرُجْ مِنْهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٌ ۝٣٤ وَإِنَّ عَلَيْكَ
ٱللَّعْنَةَ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلدِّينِ ۝٣٥ قَالَ رَبِّ فَأَنظِرْنِىٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ۝٣٦ قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ
ٱلْمُنظَرِينَ ۝٣٧ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْوَقْتِ ٱلْمَعْلُومِ ۝٣٨ قَالَ رَبِّ بِمَآ أَغْوَيْتَنِى لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمْ فِى
ٱلْأَرْضِ وَلَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ۝٣٩ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ ۝٤٠ قَالَ هَٰذَا صِرَٰطٌ
عَلَىَّ مُسْتَقِيمٌ ۝٤١ إِنَّ عِبَادِى لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنٌ إِلَّا مَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ
ٱلْغَاوِينَ ۝٤٢ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمَوْعِدُهُمْ أَجْمَعِينَ ۝٤٣ لَهَا سَبْعَةُ أَبْوَٰبٍ لِّكُلِّ بَابٍ مِّنْهُمْ
جُزْءٌ مَّقْسُومٌ ۝٤٤﴾ [الحجر: ۝٢٩-۝٤٤]

واتە: خوای پەروەردگار کاتێك مرۆڤی دروست کردو فەرمووی: جا کاتێك ڕێك و پێك و تەواوم کرد، لەو ڕۆحە تایبەتییەی کە من (بەدیهێنەری ئەوم) پێمبەخشی، ئەوە هەمووتان کڕنووشی بۆ بەرن (کڕنووشی ڕێز بە فەرمانی خوا)۝٢٩. واتە: ئینجا فریشتەکان (فەرمانی پەروەردگاریان بەجێ هێناو هەموویان بەگشتی کڕنووشی ڕێزیان برد۝٣٠.واتە: جگە لە ئیبلیس (شەیتانی گەورە) سەرپێچی کرد کە لەگەڵ کڕنووش بەراندا بێت۝٣١.واتە: ئەوسا خوا فەرمووی: ئەی ئیبلیس ئەوە بۆ لەگەڵ کڕنووش بەراندا نیت؟!۝٣٢. شەیتان لە وەڵامدا وتی: من ئەوەندە (نزم و بچوك) نەبووم، کڕنووش بەرم بۆ مرۆڤێك

که تۆ پێشتر قوڕێکی ڕەشباوو ترشاو بووە﴿٣٣﴾؟! واتە: خوا فەرمووی: (چونکە لە فەرمانی من سەرپێچیت کرد، دەبێت لەم شوێنە نەمێنیت، کە بەهەشتە یان ئاسمان) کەواتە دەرچۆ لێرە چونکە بەڕاستی تۆ نەفرین لێکراویت﴿٣٤﴾. واتە: بەڕاستی نەفرینی خوات بەردەوام لەسەرە هەتا ڕۆژی دوایی﴿٣٥﴾.واتە: شەیتان وتی: پەروەردگارا، مۆڵەتم بدە هەتا ئەو ڕۆژهەی هەمووان زیندوو دەکرێنەوە﴿٣٦﴾.واتە: خواش فەرمووی: دەتۆ لە مۆڵەت دراوانیت﴿٣٧﴾. واتە: تا ڕۆژی کاتە دیاریکراو و زانراوەکە﴿٣٨﴾. واتە: ئیبلیس (بە بوغزو کینەو حەسادەتەوە) وتی: پەروەردگارم، مادەم بەهۆی ئەم ئینسانەوە منت سەر لێشێواو کرد، شەرت بێت لە زەویدا هەموو گوناهو لادان و تاوانێکیان لاجوان و شیرین بکەم و هەر هەموویان سەر لێشێواوو سەرگەردان بکەم﴿٣٩﴾.واتە: بێجگە لە بەندە پوختە و دڵسۆزەکانی خۆت نەبێت (چونکە دڵیان بە باوەڕ بە تۆو یادی تۆ ئاوەدانە، هەوڵ و کۆششی من بۆ وێڵ کردنیان ناکامە) ﴿٤٠﴾. واتە: خوای گەورە فەرمووی: ئا ئەوە ڕێگەو ڕێبازێکی ڕاست و دروستە هەر بۆ لای من دێت و هەر من چاودێری دەکەم﴿٤١﴾.واتە: بەڕاستی بەندە چاك و پاکەکانی من بە تۆ فریو نادرێن و تۆ هیچ دەسەڵاتێکت نییە بەسەریاندا، جگە لەوانەی کە شوێنت کەوتوون لە سەرکەش و یاخی و سەرگەردانەکان﴿٤٢﴾.واتە: بێگومان دۆزەخیش بەڵێنگای هەر هەموو ئەوانەنە بەگشتی﴿٤٣﴾.واتە: حەوت دەروازەی گەورەی هەیە، هەر

دەروازەیەكیشـــی چەند دەرگاو چەند بەشـێكە كە دەســتەی دۆزەخیان، بەگوێرەی تاوان و گوناهیان ڕاپێچ دەكرێن بۆ ناوی﴿٤٤﴾.

دیسان دەگەڕێمەوە بۆ لای دەجال، ئەو هەموو تواناو هێزە بۆ كەسێك لەناو مرۆڤەكاندا دەســت ناكەوێت ئەگەر هێزو توانای جنۆكەكانی تری لەگەڵدا نەبێت، هەموو باش دەزانین كە شـەیتان خۆی لە جنۆكەكانە. جامادام لەوانە هـاوكـاری هەر لەوانیش وەردەگرێـت، خوای پەروەردگـاریش لە ســورەتی كەهف بە ئاشكرا باسی دەكات و دەفەرمووێت:

﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِۦٓ ۗ أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِى وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّۢ ۚ بِئْسَ لِلظَّٰلِمِينَ بَدَلًا﴿٥٠﴾﴾ [الكهف]

واتە: ئێمە كاتێك بە فریشــتەكانمان وت ســوژدە بەرن بۆ ئادەم، هەرهەموو ســوژدەیان برد بێجگە لە ئیبلیس نەبێت كە لە دەســتەی جنۆكەكان بوو، لە فەرمانی پەروەردگاری یاخی بوو، ئایا (ڕهەوایە) كە ئەو و نەوەكەی بكەنە پاڵپشت و یارو یاوەری خۆتان لەجیاتی من، لەحاڵێكدا ئەوانە دوژمنی ئێوەن، ئای كە ســتەمكاران شــتێكی نارەواو ناپەســندیان هەڵبژاردووەو (گوێڕایەڵی دەكەن)﴿٥٠﴾.

كەواتە دەرئەنجامەكە بەو شێوەیە، جارێ ئەركی عیسای كوڕی مەریەم تەواو نەبووە، لەبەر ئەوەی لە بەنی ئادەمەو خوای گەورە تۆڵەی ئادەم و نەوەكانی بەدەســتی عیســای كوری مەریم لە شــەیتان دەكاتەوە ، لەبەر ئەوەشــە كە

خوای پەروەردگار بۆ ئەو کارە گرنگە مەسیحی عیسای کوڕی مەریەمی هەڵبژاردووە ، چونکە زۆر لە ئادەم دەچێت و خوای گەورە هەرکات باسی دروستکردنی عیسای کردبێت نمونەی بە ئادەم هێناوەتەوە شکڵ و شێوەیشیان لەیە کچووە.

گەڕانەوەی عیسای کوری مەریەم بە پێغەمبەرایەتی نییە بۆ سەر زەوی، بەڵکو بەندەیەکی ئاساییەو لە دوای موحەمەدی مەهدییەوە نوێژ دەکات و دوای مردنی موحەمەدی مەهدی ماوەی ٤٠ ساڵ فەرمانڕەوایی دەکات کە باشترین و زێڕینترین سەردەمی فەرمانڕەوای سەرزەویە.

هەموو ئەمانە کەباسم کرد تاڕادەیەك باش بوو بۆ ئەوەی بڕوا بکەم کە بەوەی شەیتان دەجالە، بەڵام هەندێك وردەکاری لە مێشکی مندا مابوو، دەگەڕام بۆ ئەوەی چۆن دەستم بەکەوێت، لەڕێگای شیخ بەرقان یاخود زانایەکی تر یان هەر کتێبێك کە بتوانم ئەو پرسیارانەی لێبکەم یاخود دەستم بکەوێت و بیخوێنمەوە، ئەویش بریتی بوو لەو پرسیارانەی کە ئەی ئەو هەموو چەك و بۆمبە ئەتۆمەو نایترۆجینییە چی لێ بەسەر دێت، ئایا عیسای کوڕی مەریم و و دەجال لە هەموو ئەو هێزو چەکە ناوەکی و نایترۆجینیانە بەهێزترن کە ئەو دوو کەسایەتییە حوکمی سەر زەوی بخەنە ژێر دەستیان. مێشکم بەو پرسیارانەوە سەرقاڵ بوو، نەمدەزانی چۆن وەڵامی بۆ دەستە بەر بکەم.

ڕۆژێك بەردەوام لە کتێبخانەکەی خۆمدا بە دوای هەندێك سەرچاوەدا دەگەڕام لە دوامەوە دەنگێك هات و وتی: بەس پێم بڵێ بۆ چی دروست بووین، بۆچی هاتووین؟ دەنگەکە لە دەنگی سەسیل دەچوو، ئاوڕمداوە

کەس دیار نەبوو ناچار وازم هێنا، بۆ جاری دووەم وتی کەڕی نابیســـی چی دەڵێم؟

ئەمجارەیان دڵنیا بووم لەوەی دەنگەکە سەسیل-ە ویستم بە هێمنی وەڵامی پرسیارەکەی بدەمەوە.

دیسان پرسیارەکەم دووبارە کردەوە بە دەنگی بەرز بۆچی ئێمەی مرۆڤ خوا دروستی کردوین؟ بۆ پرسمان پێنەکراوە کە هاتین بۆ ئەم ژیانە؟

زۆرێـك لە خەڵکی لە ســـەرەتـای ژیـانییەوە تـاکۆتـایی ژیـانی بەدوای ئەم پرسـیارەوەیە، یان با بڵێین زۆربەی دانشـمەندو فەیلەسـوف و بیرمەندەکان.. هتد، بەدوای وەڵامی ئەم پرســـیارەدا وێڵ بوون و گوزەریان کردووە بەناو مەعریفەدا.

هەر قوتـابخـانەیەك لە قوتـابخـانەکـانی فیکرو فەلســـەفە جۆرە وەڵامێکی دەستەبەر کردووە.

لە فەلسەفەی سروشتەوە بیگرە تا پراگماتیکی و ماددی و وجودی و میسالی و سوفسطائی.. هتد.

لەڕاســـتیدا دەرفەتی ســـاغکردنەوەی ئەوەم نییە هەموویت لێرەدا بۆســـاغ بکەمەوە، بەڵام بەردەوام بیت لەگەڵمدا هەموویت بۆ ســـاغ دەکەمەوە بە دەرس و دەور، زۆر درێژم نەکردەوە، بۆم باسـکرد کە لەڕاسـتیدا فەلسـەفەی سروشـــتی لێدەرچێت کە واتای مرۆڤگەراییە، هەموو بیرو فەلســـەفەکانی تر

بڕوایان وایە مرۆڤ بێهودەیە. نەك بەتەنها مرۆڤ بەڵكو جنۆكەكانیش سەرگەردانن بێ هودە كار دەكەن و ئەخۆن و ئەخۆنەوە وەك ئاژەڵ دەژین.

بەڵام ئایینەكانیش قسەی گەورەیان هەیە لەسەر هاتنی مرۆڤ.

بەتایبەت ئیسلام و یەهودی و مەسیحییەكان.

ئایینەكانی تری وەك زەردەشتی، لاوتستۆی، بوزا، كۆنفۆشیۆسی، هیندۆسی، بهرامی و میترای..هتد لای ئەوانیش لە زوهد و ژیانێكی ناواقعیدایە.،مرۆڤ تەنها قسەی جوانەو هیچ ئەرزشی نییە لە كۆتایدا.

جا ئەو كەسەی كە پرسیارت كردووە لێرەدا من باسی ئیسلام دەكەم، چونكە وتەم لەسەر مرۆڤی وەرگری ئیسلامە واتا مسوڵمان.

كەواتە مسوڵمان كاری چیە و بۆچی هاتووە ئایا موخەیەرە یان موسەیەرە؟ واتا ئەمری پێكراوە یان ئازادە، لەهەمانكاتدا ئەوەی بۆ مرۆڤە بۆ جنۆكەكانیشە، چونكە خوای پەروەردگار باسی هەردوولامان بەیەكەوە دەكات بۆ بەندایەتی، بەڵام ئەركێكی قورس تری داوە بە ئێمە كە ئاوەدان كردنەوەیە. بەداخەوە زۆر جار جنۆكەكان دەچنە لای شەیتانی ئیبلیس و بۆ ئەوكار دەكەن و دەبنە بێهودە، ژیانی دنیاو قیامەتیان دەدۆڕینن، ئەوەی مرۆڤ لەسەر شانی فەرزكراوە بۆ ئاوەدانی كەچی ئەوان وێرانی دەكەن.

مادام هەردووكیان هەیە ئازادی و ئەمر پێكراوە، كەواتە مرۆڤ و جنۆكە لەهەردوو بەشەكە پێك هاتووە.

بۆ نمونە ئەگەر كەسێك بڵێ چای دەخۆیت یان قاوە؟

كەواتە هەردووكيان بوونيان هەيە بۆيە ئيختيارت ئەداتێ.

ئەم نمونەيە باشـــترين ڕونكەرەوەی ئەو بابەتەيە كە بەدرێژايی دە ســـاڵی ڕابوردوو من ئەم پرســـيارەم لێكراوە لە ڕێگای مولحيدەكانەوە، هەنديك لە خەڵكی كە ئاقڵ بوون وەريانگرتووە مسوڵمانێتی خۆيانيان پێ بەهێز كردووە، ئەوەشـی كە بەچوار پێ ڕۆشـتووە ئاژەڵ ئاسـا هەنگاوی ناوە سـەر لێشـێواو بووە وەک ئيبليس بەردەوام بووە لەســەر ئينكاری خۆی و خەڵكيشـــی گومڕا كردووە.

بەواتای ئەوەی ئەو ڕەگەزەی كە مرۆڤ و جن پێـك دەهێنی، واتا پێكهاتەی نێرو مێيە خوای گەورە هەندێك كاری پێبەخشـيوە كە ئەمر پێكراوە، هەندێك كاری پێبەخشيوە كە موخەيەرو ئازادە.

- چين ئەوانەی كە موسەيەرە و دەبێت ببێت و مرۆڤ ئازاد نييە تێيدا؟

لێرەدا باسی ژيانی خۆمان واتە مرۆڤ دەكەم، چونكە شارەزا نيم لە سيستەم و ژيانی جنۆكەكان.

گومانی تێدا نييە زۆرە، بەڵام چەند نمونەيەكی باس دەكەم و بەشەكانی تر لە مێشـــكو بيری خۆتدا دوايی دەتوانی بە ئاســـانی تاوتوێی پێبكەيـت، ئيتر لەمەودواو دەزانيت لە چيدا دەسەڵاتت نييە و لەچيشدا ئازادی.

لە كوێدا لە دايك دەبيت؟ لە كوێدا دەمريت، خەڵكی كوێيـت ئايا كوردی عەرەبی فارســـی يان كوڕی كێيت؟ نێری يان مێ؟ ئەمانە هيچی لەدەســـت و هەڵبژاردنی مرۆڤدا نييە.

برسێتی، تینوێتی، ئازار، حەزی شەهوەت بەهەموو جۆرەکانی لە لیکێکەوە تا شەهوەتی و تۆوی، هیچی لەدەسەڵاتی مرۆڤدا نییە و سیستەمێکی گشتییە گەردوونی خوایە بۆی داناوین.

دێمە سەر باسی ئازاد بوون، حیکمەت و فەلەسەفەی پارسەنگی دەردەکەوێت لەناو هەردوو چەمکەکەدا.

کەمادام برسێتی مرۆڤ بەدەست خۆی نییە هەر برسی دەبێت، کەواتە تۆ ئازادی چی دەخۆیت. حەڵاڵ و موباح وەك گۆشتی مریشك و مەڕو..هتد یان حەڕام وەك بەراز و مردارەو بووەکان.

کە تینووت بوو لەدەسەڵاتت دا نییە، بەڵام ئازادی چی دەخۆیتەوە ئاو، ماستاو، شەربەت..هتد ئەوەی کە حەڵاڵە. حەڕامەکان ویسکی، جن، عارەق، ڤۆدگا..هتد ئازادی.

شەهوەتی حەز بە ئافرەت دەکەیت یان بە پێچەوانەوە لەدەستتدا نییە ئەم حەزە، حەزێکە چێنراوی خواییە، بەڵام ئازادی بە زیناو کاری خراپە وتێربازی تێری شەهوەت دەکەیت، یان هاوسەرگیری دەکەیت و خێزان پێك دێنیت.

مردن بەدەست تۆ نییە، بەڵام ئازادیت مردنەکەت هەڵبژێریت لە پێناوی کێدا بێت.

ئەمە وەڵامی ئەو پرسیارەیە، ئایا خالق پرس بە مەخلوق دەکات بۆ دروستکردنی؟

بە دوو بیردۆزی مەعریفی گریمانِ وەڵام ئەدەمەوە.. وَلِلّهِ الْمَثَلُ الأعْلَىَ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ

گریمانی یەکەم - ئەگەر لە ئەدیسۆن بپرسی تۆ کارەبات دروست کردووە کە بۆ پێداویستی مرۆڤە، ئەی پرست بەکارەبا کرد کە دروستی دەکەیت؟!

گریمانی دووەم- ئەگەر بە کارەبا بڵێیت جەنابی کاک کارەبا، ئایا ئەدیسۆن دەناسیت؟!

بە هەردوو گریمانەکە وەڵامی سێیەممان دەست دەکەوێت بە گریمانو دەیکەینە مەعریفە.

ئەدیسۆن پێویستی نییە پرس بەکارەبا بکات، چونکە ئەدیسۆن داهێنەری کارەبایە. پاشان کارەباش بەهیچ شێوەیەك ئەدیسۆن ناناسێت، ئەگەر دەست بداتە سارد و گەرمی کارەبا دڵنیام کە کارەبا کە بارگاوی دەکات و دەیکوژێت ئەگەر فریای خۆی نەکەوێت.

کەواتە خالق پرس بە مەخلوق ناکات، پاشان مەخلوق وەك ئەوەی کە پێویستە خالق ناناسێت. ئێ کەواتە ئەو مەخلوقە کە خالقەکەی ناناسێت دەبێت خۆی پێ بناسێنێت.

خوای پەروەردگار ئەو خودایە، واتا خودی خۆی هەموو شتێك دەبەخشێت، ناوی خودا لە بەخشینی خۆیەوە هاتووە کە خودی خۆی بەخشندەیەو بەدیهێنەرە، نەك لە کاتی دروستکردنیدا پرس بە مەخلوق بکات، ئەگەر خوای پەروەردگار خۆی بە مەخلوق نەناسێنێت، هیچ ڕێگایەك نییە تۆ خوا بناسیت.

تێگەیشتی؟

تێگەیشتی؟

وەڵام نییە..

چییە بۆ لاڵ بویت؟

سەسیل: ماکوان ئەگەر پێت بڵێم وەرە بۆ جێگایەك لەگەڵمدا هاوکاریم بکەو لەدوای ئەوەوە من موسوڵمان دەبم، هاوکاریم دەکەیت؟

ماکوان: ئاخر تۆ زۆر درۆزنی لەوەتەی تۆم ناسیوە ڕاستی لە دەمت نەهاتۆتە دەرەوە، ئەگەر ڕاست بکەیت سوێند بەخوای گەورە شەڕت لەسەر دەکەم لەگەڵ ئیبلیس-دا.

سەسیل: پەیمانم بدەرێ هاوکاریم دەکەیت، من موسوڵمان دەبم.

ماکوان: بە مەرجێك ڕاقی، حەزقیل، حەنانە و جەماعەتی خۆمان ئاگادار بن.
سەسیل: نا با تەنها نێوانی خۆمان بێت.
ماکوان: بڕوا ناکەم لەسەرەتاوە وەعد بدەم، بەڵام پێم بڵێ بزانم چییە و دەتوانم یارمەتیت بدەم.
سەسیل دەستی کرد بەگریان و وەك مار فیشکەی دەهات، بەڵام هەر بڕوای پێناکەم دەزانم خۆی مارە و هیچ جێگای متمانە نییە، بەڵام من خەریکم چۆك دا دەدەم بە وتنی موسوڵمان بوونی داواکەیشی زۆر موهیمە.

## کۆتای دوکان و بازاڕەکەی سەسیل

گوێم لە فیشکەی گریانی سەسیل بوو بێ ئەوەی بیبینم، هەستم دەکرد شتی زۆر لە دڵیایەتی و دەیەوێت بیڵێت و نازانێت چۆن دەری بڕێت. کێشــە لەوەدایە من ڕاســـتیم لەم جنۆکەیە نەدیوە، دەرحەق بە من هەموو گیانی درۆو خراپەکاری بووە.

وەعدی زۆر خراپی داوە لەسەرمن و هەمووشی هێناوەتە دی.

هەر لە ترســـاندنم و ڕفاندنم و ئازاری دەروونی، تەنانەت گرتنم لە لایەن موخـابەڕاتی ئیتـالی و نەرویجییەوە، ترســـانـدم بە دەزگـاکـانی هەرێمی کوردستان..هتد.

ئێستاش وا لە بەردەستمدا زەلیل بووە.

قسەیەکی زۆر سەیری کرد بە گریانەوە.

ســەســیل: ماکوان ســـوێندت بۆ دەخۆم هاوکاریم بکە، ئەوەی لە ژیانتا ناڕەحەتی و ئازارت پێبگەیەنێت وا شێتی دەکەم کە لە پیسـایی خۆی بخوات و لە سێبەری خۆشی بترسێت!

خۆ ئەگەر هاوکاریم نەکەیت...

نەمهێشت قسەكەی بكات وتم: سەسیل هەڕەشەو شتی وا لە من مەكە، من بە هەڕەشـــە شـێت دەبم و هەروەها پیســـایی دەرخواردی ئەوە ئەدەم هەڕەشـــەم لێبكات. جا پیاو بەو یان جنۆكەیەكی مەعقول بە و هەڕەشـــەو قسەی قۆڕ مەكە. هیچت لەگەڵ من بۆ ناكرێت تۆ و گەورەكەت كە شەیتانە. من گەورە و ســـەروەر و ســـەردارم خوای پەروەردگارە، تۆ هەر هیچ نیت، ڕوونە؟

سـەسـیل: من قســەت بۆ دەكەم، كەس ناوێرێت قســەت لەگەڵ بكات خێرا هەڵدەچیت.

ماكوان: بەس قســەكەت بۆنی هەڕەشـەی لێبێت بەدڵنیاییەوە هەڵدەچم ، بە ئەدەبەوە قسە دەكەیت گوێت بۆ دەگرم، قسە بە هەڕەشەوە دەكەیت گیانی خۆم دادەنێم یان زەلیلت دەكەم، ڕوونە؟ جا تۆ بە ئەدەبەوە و بە ئیحترامەوە قسە بكەو بیشزانە قسە لەگەڵ كێ دەكەیت.

سەسیل: باشە تۆ بڕوا دەكەیت كەوا حەزقیل، ڕاقی و حەنانە جاسوسن بەسەر تۆوە؟ كـار بۆ ئێمە دەكەن ئەوەت بۆ دەربخەم. هەموو بەڵگەكـان بخەمە بەردەستت ئیتر بڕوا بە من دەكەیت؟

ماكوان: نەوەڵڵا ئەگەر ئەوان وا بن وەك تۆ دەڵێیت ئەی ئیتر بڕوا بە خۆشـــم ناكەم، چۆن بڕوا بە تۆ بكەم.

سـەسـیل: دەبڕوا بكە، سـوێندت بۆ دەخۆم كە هەموویان دژی تۆن و بەكارت دەهێننەوە لە گەورەترین خزمەتكردن بە ساحیرو جادووبازەكاندا.

ماکوان: باشە بەڵگەیەکم بدەرێ با بڕوات پێبکەم.

ســـەســـیل: لەگەڵ مندا وەرە بۆ جێگایەك بیان بینە کە لەگەڵ جادووبازێکدا قسە دەکەن و تۆش بەقەدەر هەموو دنیا ڕقت لێیەتی دەشیناسی، باشە؟

ماکوان: تۆ بەرژەوەندیت چییە لەم فیتنەیی و سەگ و سەگبابیە؟

کە وای وت زۆر تورە بووم هەســتم بەوە دەکرد کە قســەکانی ڕاســت بێت ، لەداخاندا چی لەناودڵمادا بوو بەوەم ڕشت.

سەسیل: ئارام بە بیرتە لەگەڵ شێخ شاهین-دا بووبە شەڕت لە فرێدریکستاد لە قاوەخانەکەدا پۆلیس هاتوو گرتی؟

ماکوان: بەڵێ بیرمە کابرا زلەی تورکمان نالێیت، ئەوەی تۆ هێنابوت؟

ســـەســـیل: با خۆیەتی، بەچی دەڵێیت ســـوێندت بۆ دەخۆم هەر هەموومان لەگەڵ ئەودا کاردەکەین، منیشیان وا داناوە کە سەر لە تۆ تێکبدەین کە گوایە ئەوان هاوکاری تۆ دەکەن.

ماکوان: ئەرێ سەسیل کەس نەماوە لەسەر ئەم زەوییەدا خۆتانی پێوە سەرقاڵ بکەن تەنها ماکوان نەبێت، کاکە ئێوە لەکام خاك و خۆڵن؟

ســەســێل: ئێمە لە خاك و خۆڵ نین، بەڵکو لە ئاگرو بڵێســەین، بەڵام وەرە با بڕوا بکەیت کە ئەوان بۆ ئەو کار دەکەن.

ماکوان: ئێ بێم بۆ کوێ شـاهین لە ئەورووپای شـەرقییە بەچی ئەمبەیت ئینجا ڕاقی و حەنانە و حەزقیل من لەکوێ بیانبینم بەدزییەوە ئەوان خۆیان نیشانی

من ئەدەن خۆ من ئەوان بە ئارەزووی خۆم نا بینم ، تۆش هەر ئەم درۆیەت مابوو فرێی دەی بۆم؟

سەسیل: من دەتوانم تۆ بەرم بۆ لای ئەوان و لاشەو هەموو جەستەت لەجێگایەکی تر بێت.

ماکوان: دەی کێ ناڵێت سیحر نییە سەسیل-ە فەنی؟

سەسیل: ڕستە ئەوە سیحرە من بە سیحر ئەتبەم و ئەوان دەبینی کە چی دەکەن.

ماکوان: ئینجا تۆ چەند وەختە وەك سەگ دوای من کەوتویت بۆ ئەوەی سیحرو جادوو بکەم، ئێستا ئەتەوێت هەر وا بە ئاسانی بمخەیتە ناو ئەو کارەوە و کافرم بکەیت و لەم دینەی خۆم دەرمبکەیت؟ کورە بڕۆ هەی هیچو پوچ با ئایەتەلکورسیەك بخوێنم وەك ڕەشەبا بتبەم بەئاسماندا.

نەیهێشت قسەکەم تەواو بکەم، ماکوان سوێندت ئەدەم بەوەی بڕوات پێیەتی قسەم زۆر ماوە ڕاوم مەنێ با هەندێك قسەی تر هەیە بکەین.

ماکوان: قسەی چی بکەین هەر کەس سیحر بکات ئەوە نییە کافرم دەکەیت ، یاخود بچێت بۆلای ساحیر یان ڕێگای نیشان بدات هەموویان کافر دەبن. دەتەوێت وەك خۆت بێدین بم؟ باشە بێ ئەقڵ تۆ کە ئەوەندە لەم قورئانە ئەترسیت و ئەزانیت ڕاستە، ئەی چۆن بڕوای پێناهێنیت؟ ئاخر لای ئێمە هەر شتێك بی ئەقڵ بێت پێی دەڵێن کەر یان چوار پێ یان وڵاغ. بەس ئەم جارە حەقە بڵێن سەسیل، بەداخەوە بێجگە منیش کەس ناتناسێت.

سـەسـیل: توانایەکت ئەدەمێ پێی دەبیتە (جەمپەر) دەتوانیت لە ماوەیەکی کەمدا ئەوەی ئەتەوێت بەیەکەوە بڕۆین و ببینین ئەگەر ئەمسـەراو سـەری ئەم وڵاتەش بێت.

ماکوان: ئینجا ئەم سـاختە چێتیە چیە؟ حەتمەن ئەویش سـیحرە، جەمپەر چییە؟

سەسیل: وشەیەکی ئینگلیزیە، واتا بازدانی فراوان.

ماکوان: وەڵا موسەقەفیشی بە ئینگلیزی قسەم لەگەڵ دەکەیت! نەوەڵا کاکە من باز نادەم و بڕواشم پێت نییە.

سەسیل: بڕوا بکە زانستە، پەیوەندی نییە بە سیحرو جادووە وە. لە جیهاندا ئەو زانسـتە دەخوێنرێت و زانکۆ و سـەدان کۆمپانیا هەیە کە ئەو کارانە دەکەن.

ماکوان: بەڕاسـت کامەیە ئەم زانسـتە، کە من تا ئێسـتا ئەقڵم پێنەشـکاوە. جەنابت ئەوەندە موهیمی دەیزانیت، تۆ بۆ وەڵامی پرسـیارەکەم نادەیتەوە دەڵێم کە ئەم قورئانە ئاوا حەقە و لێی دەترسـی و وەك پووش و پەڵاش ئەتبا بە ئاسماندا بۆ بڕوای پێناهێنیت و موسوڵمان بیت و نەجاتت بێت لەم دەردە سەریەو خۆت لە دۆزەخی ئەبەدی ڕزگار بکەیت؟

سـەسـیل: بڕوا بکە موسـوڵمان دەبم و بۆ ئەوەش هاتووم بۆ لات، دەمەوێت کۆتایی بە هەموو کارێکی نەشـیاو بهێنم لە گەڵ تۆ و خۆشـمدا، بەنیسـبەتی

زانستەکەوە کە فێرت دەکەم بۆ ئەوەی بتوانی تواناکانی خۆت بەهێز بکەیت ئەوەیش زانستی (پاراسایکۆلۆژی)یە.

ماکوان: جا ئەمە کام ئەکادیمیا ناوی ناوە زانســـت و لە کام زانکۆی جیهاندا دەخوێنرێت؟

سەسیل: چۆن، لە هەمووزانکۆکانی دنیادا دەخوێنرێت.

ماکوان: درۆ دەکەیت و هیچ وانییە، تا ئێســـتا لەلایەن زانســـتەوە دانی پێدانەنراوە کە زانستەو هەر حسابی فاڵ و قاوەگرتنەوە و بورجەکان و ئێوەی بۆ دەکرێت و هیچی تر نییە، قســـەی بێمەعنایە و هیچ پەیوەندییەکی بەزانستەوە نییە و زانست ئیعترافی پێناکات.

سەسیل: بە سەدان دکتۆرا و پرفیسۆر و ئەکادیمیا هەیە لە جیهاندا لەسەر ئەو بوارە کار دەکات. لە ئەمریکا، میسرـعێراق و ئێران، تەنانەت لە ئەوروپا، بەریتانیا، مەجەر و زۆر جێگای تریش.

ماکوان: ئەوەندی من بزانم ئافرەتێك لە ســـاڵی ١٩٦٠ بە ڕەچەڵەك عەرەبە، بەڵام ڕەگەزنامەی ئەمریکی هەیە و لە ئەمریکاش لە دایك بووە، یەکێك بووە لە ڕۆژنامە نووسەکان کە دامەزرێنەری کۆمپانیای بەختە لە ئەمریکا، ئەویش سەری نەگرتووە کۆمپنیاکەی فەشەلی هێنا ئافرەتەکە ناوی (هالە حامید)ە.

ســـەســـیـل: نـا دوای ئەوە لە ســـاڵی ١٩٧٧ لەگەڵ (ڕیمۆنـد ڤـیـدیز) دا کۆمپانیایەکیان بەناوی (دێلفی) لە سان فرانسیسکۆ کردەوە لەماوەی ٣ ساڵدا ١٨ ملیار دۆلاریان قازانج کرد.

ماکوان: تۆش ڕقت لە درۆیە سەسیل! درۆیەك بکە ڕێگای تێبچێت. ١٨ ملیار دۆلار لەماوەی ٣ ساڵدا زۆر زۆرە دەزانیت؟ بۆ کۆمپانیایەکی تڕۆهات.

سەسیل: بڕوا بکە بڕۆ بگەڕێ وسیرچ بکە لە سەرچاوەکانی خۆتاندا، سەدان سەرچاوە هەیە، ئەزانی کۆمپانیای بەختەکە کاری چی بوو ئەمجارە دروستیان کرد ڕیمۆند و هالە؟

ماکوان: نا نازانم، بەڵام لەوانەیە هەر فاڵ گرتنەوە بووبێت.

سەسیل: نا بەڵکو ئەمجارە ئەندامەکانیان کە خەریکی کاری پاراسایکۆلۆژی بوون یەکەمجار جێگای نەوتیان ئاشکرا دەکرد، هەر جێگایەکیان دەست نیشان بکردایە پڕبوو لە نەوت، پاشان چوونە ناو بۆرصەی جیهانی و بە ئاشکرا ناوی خۆیان نا بوو دێلفی بەخت و ئاشکرایان کرد دوو هەفتە بۆرصە چۆن دەبێت و چەنیك خێر دەکەن، سوودێکی خەیاڵییان دەستکەوت و هەمووشی ڕاست دەرچوو.

ماکوان: ئەوە بەڕاستە؟ ئا پەلە مەکە با سێرچێك بکەم وەك تۆ دەڵێیت بزانم ڕاست دەکەیت.

لە گوگل لە یوتیوبدا گەڕام لەهەموو سەرچاوەکاندا بەرنامەی دیکۆمێنتاری و سەدان مەقالەو ڕاپۆرتیان لەسەر کرابوو، تەماشام کرد ناوی کۆمپانیاکە گۆڕاوە بە کۆمپانیای (مۆبەیس) کاری زۆر گەورەیان کردووە، لەوانە گەورەترین ئاسەواری کۆنی جیهانیان دۆزیوەتەوە لە نزیك شاری ئەسکەندەرییەی وڵاتی میسر.

هەروەها کۆنترین کەشــتی نغرۆ بووی ژێر دەریایان ئاشــکرا کردووە، بەبێ ئەوەی پارە سەرف بکرێت، بەڵکو یەکێك لە ئەندامەکانیان بە پاراسایکۆلۆژی کە لەو جێگایەدا کەشتیەکەی تێیدایە، زۆر شتی تر لە گەنجینە و کەرەستەی بە نرخ دۆزیویەتیەوە.

ئەوەی سەرنجی منی ڕکێشا ئەوەیە دەزگای پۆلیسـی فیدراڵی و موخابەراتی ئەمریکی ئیف بی ئای و ســی ئای ئەی لەگەڵ ئەو کۆمپانیایەدا مامەڵە دەکات، لێپرسراوی پۆلیسی یەکێك لە شارەکانی ویلایەتی نیۆیۆرك نەیانتوانیوە کچێکی تەمەن منـداڵ بـدۆزنەوە کە بۆ مـاوەی هەفتەیەك ون بووە، پەیوەندییان کردووە بەو کۆمپانیایەوە ئەوانیش دەســت بەجێ ئاشــکرایان کردووە کە ئەو منداڵە نەماوە و دووکەس بە پاراسـایکۆلۆژی چوونەتە خەوی موگنـاطیســییەوە یەکێکیـان دەڵێـت مردووە خنکـاندویـانە لەو جێگـایەدا فڕێدراوە، کەسـی دووهەمیش هەمان جێگای وتوە، بەڵام دەڵێت: کێشـاویانە بەلای سەریدا، ئەو کەسەشی کە کوشتویەتی هەموو ناونیشانەکەیانداوە کە پۆلیس چۆتە ئەو جێگـایە دۆزیویـانەتەوە کچەکە لەوێـدا فڕێـدراوە و خنکێنراوەو کێشاویشیانە بەسەریدا.

لە بەرنامەیەکی تایبەتدا لە پۆلیســەکە دەپرســن کە د. مســتەفا محمود لە کەناڵی تەلەفزیۆنی اقرأ باسی دەکات پۆلیسەکە دەڵێت هیچ ڕێگرێك نییە لە ئێمە پەنا بەرین بۆ هەر شتێك کە تاوانمان بۆ ئاشکرا بکات.

دوای گەڕانم بەدوای سـەرچاوەکاندا سـەسیلم هەر نەدەبینی، بەڵام بەدەنگ لەگەڵمدا بوو. دوای چەند سـاتێك وتم سـەسـیل ڕاســت دەکەیت وایە ئەمە یەکەم جارتە شتێك بڵێیت ڕاست بێت و دژی من نەبێت.

سـەسـیل دەسـتی کردەوە بە قسـەو خۆی ئاشـکرا کردەوە بە جلوبەرگەکەی خۆیەوە و وتی: مـاکوان منیش ئەتبەم بۆ ئەو جێگـایـانەی کە خۆت پێـت خۆشە، دوور لە سیحر و جادووبازی بە تەنویمی موگناطیسی و خەو و پاشان زانســـتی پاراســـایکۆلۆژی، بڕوا بکە زۆر شـــتت بۆ ئاشـــکرا دەبێت، با ئەو زانستەش بزانیت چییە.

## سەسیل و زانست و سیحر

سـەسـیل داوا دەکات فێری زانسـتێکم بکات بەناوی (پاراسـایکۆلۆژی) ئەم زانستە وەك ئەو باسـی دەکات دوورە لە سیحرو جادوو، هەموو تواناو هێزی مرۆڤە خۆی بەگەڕ دەخات و سوود لە وزە و هێزە گەردونییەکان وەردەگرێت.

سـەسـیل: ئەگەر بێت و خۆت وەرزش لەسـەر ئەو هێزو توانایانە بکەیت، یاخود لە دنیای ئێسـتادا پێی دەوترێت - یۆگا - هەندێك وەرزشـی ترە زۆر بە توانات دەکات لە مێشك و کردارو تەنانەت تەندروستیشدا.

ماکوان: لەڕاسـتیدا ئەوەی تۆ باسـی دەکەیت هەموویم بیسـتووە، بەڵام زانیارییەکی ئەوتۆم بەدەسـت نەهێناوە لەسـەری، مادام تۆ بە باشـە باسـی دەکەیت ئەوە دڵنیام پڕیەتی لە خورافیات و خوزەعبەلات و کوفر و سـەگ و سەگبابی. خۆشت باش دەزانی سەسیل من بەقەدەر هەموو دنیا ڕقم لە تۆیە، زۆرت بەسـەر هێناوم جا بەهیچ شێوەیەك بڕوات پێناکەم، بەڵام یەك چانصی ترت ئەدەمێ بزانم ئەمەی باسـی دەکەیت چییەو چۆنە، پەلەم لێ مەکە تا هەندێك زانیاری بەدەست دەهێنم لەسەری و دوایی قسە دەکەینەوە، ئەگەر زانیم لەگەڵ شـەرعی خوای موتەعالدا دەگونجێت ئەوە لێی ناوەسـتم، ئەگەر نە گونجا ئەوە ناکرێت و سەری تۆش ئەدەم لەبەرد، ڕوونە؟

سەسیل: باشە چیت دەوێت بۆت بکەم،بۆ ئەوەی بڕوا بکەیت.

ماکوان: لەسەر ئەو بابەتانە ناو و سەرچاوەی کتێبم بدەرێ با بیکڕم و بیخوێنمەوە، یان پێویست بەتۆش ناکات خۆم دەگەڕێم و دەیخوێنمەوە، چونکە هیچ متمانەیەکم بە تۆ نییە، بەڵام پێم بڵێ ئەم زانستەی تۆ باسی دەکەیت کە (پاراسایکۆلۆژی) پێدەوترێت کاری چییەو چی دەکات؟

دەمەویست سوود لە کات وەرگرم، زۆر پێوستم بە بینینی حەزقیل و راقی و حەنانە هەیە.

سەسیل: ئەم زانستە فێری ئەوەت دەکات کە چۆن دڵخۆش بیت و چۆن توانات هەبیت بە سەر ئازارو نەخۆشییەکانی خۆتدا. تواناو وزەیەك بە تۆ دەبەخشێت بتوانیت مێشکی بەرانبەر بخوێنیتەوە، یاخود کاریگەری لەسەر مێشك و بیرکردنەوەی خەڵکی دروست بکەیت. توانای شیفات دەبێت بەهۆکاری هێزو وزەکان.

ماکوان: ئەمەی تۆ باسی دەکەیت هەمووی شیرکە و هاوبەش دانانە. ڕزق لای خوای پەروەردگارەوەیە و غەیبە، شیفاء هەر خوای پەروەردگارە. خوێندنەوەی مێشك هەر قسەی بێمەعنایە و کەس لە غەیب نازانێت.

سەسیل: نا وانییە، ئەو زانستە توانات پێدەبەخشێت و هێزی کارۆموغناطیسیە دەتوانیت لەڕێگای هێزە فیزیاییەکانەوە ئەو کارانە ئەنجام بدەیت. پەلە مەکە لە بڕیارداندا بڕۆ سەرچاوەی لەسەر بخوێنەرەوە.

ماکوان: ڕاستە من زانیاریم نییە، جارێ با بڕۆم بیخوێنمەوە ئەوکات قسە دەکەینەوە.

لەگەڵ سەسیل جیابووینەوە ئەو ڕۆشت و منیش هەر لە ماڵی خۆمان بووم، بەدوای ئەم (علم الباراسيكولوجي و علوم الطاقة) زۆر گەڕام و بەدوای فتوای موسوڵماناندا گەڕام زانایان چییان لەسەر وتوە؟ بەزانای سعودیە و ئەزهەر و زۆرێکی تر لەزانایانی جیهانی ئیسلامی هەموو حەڕامیان کرد و هیچ کام لە زاناکانم نەبینی حەڵاڵیان کردبێت، بێجگە هەندێك بانگخواز لەناو هەموویاندا کە زۆر گرنگی پێدابوو عەدنان ئیبراهم نەبێت کە ئەیگونجێنێت لەگەڵ تەصەوف و هەندێك لە صۆفییەکان و ئەشعەری عەقیدەکان. ئەوانیش بە ئاسایی وەریان گرتوە، لەشێوەی بەشێك لەپاکردنەوەی ڕۆح و هەندێك شوبهاندی لەگەڵ زانای ئیسلامی ئیمامی غەزالی کە لە سەردەمی خۆیدا باسی کردووە.

هەندێك کتێبم لە ئینتەرنێت پەیدا کردو خەڵکێکیش کە دەچوون بۆ حەج و وڵاتانی عەرەبی داوای سەرچاوەی ئەو باسەم لێکردن کە بۆم بهێنن و کتێبی باشیان بۆ هێنام و ماوەیەکی زۆر لەماڵەوە سەرقاڵ بووم بەو باس و خواستانەوە. زیاد لە ١٦ بۆ ٢٢ کتێبم خوێندەوە لە ئینەتەرنێت و لە بەرجەستەدا، ئەوانەی کە باسیان کردووە هەموویم تاقی کردەوە ئەنجامەکەی سفر بوو.

پرسیارم لە هەندیك مامۆستای زانکۆ لە سلێمانی و هەولێر کرد و تەنانەت لە زانکۆکانی تورکیا و لەندەن و بەگشتی زانکۆکانی جیهان، باسی ئەو وزە و توانایانەی کە باس دەکرێت لە زانستی (پاراسایکۆلۆژی) پرسیم، هەموو وتیان لە فیزیادا هیچ ڕاستییەکی نییە وزەو هێزی شاراوە نییە و ئەوە کە زانست بڕوای پێیەتی شتی شاراوە نییە، بەڵکو هێزی تاقیکراوەو بەرجەستەیە. شتێك نییە لە زانستی فیزیادا بەناوی هێزی شارەوە.

دوای ئەوە بۆم دەرکەوت بە ناوی زانســـت و زانیارییەوە ســـەر لە خەڵکی دەشـــێوێنن و هەموو قســـەی بەتاڵەو هیچ بنەمایەکی زانســـتی نییەو بە دروستکردنی زاراوەی زانستی دەیانەوێت خەڵکی لە خشتە بەرن!

ئەوەی زانیم لەم (پاراسایکۆلۆژی)یە دا تەنها فەلسـەفەی کۆنی هیندۆسـی و چینی و ئەو فەلســەفە کۆنە ئیلحادییە بێدینیانەیە، کە پێچراوە بەناوی باق و برقی ڕۆژئاوا کە پێی دەڵێن گەشەپێدانی مرۆیی و یۆگا و چارەسەری سروشتی بە بەرد و جۆرێك لە یاری وەرزشـــی بەناوی گەشـــەســـەندنی لاشـــەی و چارەســـەری نەخۆشـــی و لە هەمووی ســـەیرتر ئەوەی بۆم دەرکەوت کە زانستێکی نوێیە جولەکە دایمەزراندوە بەناوی (البرمجة اللغوية العصبية)

کە بە ئینگلیزی پێدەوترێت Programming Linguistic Neuro بەکورت کراوەیی NLP.

لە ڕووی ناوەرۆکەوە هەموو ئەم زانســـتانەم خوێندەوە کە بەشـــێك بوو لە پاراســـایکۆلۆژی، ئەم بەناو زانســـتە چۆن پێچراوە و بە پاراســـیکۆلۆژیەوە کە ئێستا زۆر بڵاوەو تەنانەت پارەیەکی زۆر سـەرف دەکرێت بۆ بڵاو کردنەوەی. کە تەماشای مێژووەکەیم کرد هەمووی نزیکەی ٤٥ ساڵە دامەزراوە لە لایەن دوو پزیشـــکی بەناوبانگی ئەمریکی کە زیاتر بەکار هاتووە بۆ چارەســـەری نەخۆشـی دەروونی، یەکەمیان ناوی (ریچارد باندلەر) ئەوی تریان ناوی(جۆن جێندەر)ە لەســـاڵی ١٩٧٣ دایانمەزراندوە کە بەشـــێك بێت لە چارەســـەری دەروونی.

دوای ئەوە لەلایەن دوو کەسی ترەوە بەناوی (نوعۆم چۆمیسکی)و (ئەلفرێد کوریەزیسـکی) بە ڕەگەز ئەمریکی و پۆڵەندی بوون، بەڵام هەردووکیان جولەکەن پەرەیاندا بەم بەناو زانستە.

لەساڵی ١٩٩٣ کۆنگرەیەکی گەورەیان بۆ گرت لە ئەمریکاو لەساڵی ٢٠٠٣ بە فەرمی لە ئەمریکادا بە زانست ناسێنرا.

ئەم کارە زۆر شتی سەیرو سەمەرەی تێدایە کە باسی ڕۆح و پەروەردەی ڕۆح و کاریگەری وشـە دەکات، بەڵام لەڕاسـتیدا ئەوەی بۆم دەرکەوت تەنها مامەڵەکردنی ماددیانەی مرۆڤە لەگەڵ مرۆڤدا، ئەگەر زیاتر ڕۆبچیت لەو باسـانەدا ئەوە بەدڵنیاییەوە دەتخاتە ناو سـیحرو کاریگەری جنۆکەو شەیتانەکان.

چونکە وشەکان هەر پێناسەی مادی باس و بەناو زانستەکە دەکات بەرنامەی وشەسازی لەناو مێشک و کاریگەری ئەقڵی مرۆڤدا.

بەهەرحاڵ گەیشتمە ئەو قەناعەتەی کە ئەمە تەنها باسو خواستێکی درۆ و دەلەسـەیەو هیچ پەیوەندی بەزانسـتەوە نییە، پاراسـیکۆلۆژی و ئەوانەی کە لەسـەر ئەو هەژمار دەکرێن هەمووی زانسـتی باطڵە، ئەگەر زانسـت بێت هەرچەندە تا ئێستا ئیعترافی پێنەکراوە وەك زانسـت و خۆی لە چوارچێوەی شـتی میتافیزیکی و غەیبییاتدا دەبینێتەوە، کە بەناوی ریکی، مایکرۆبایتیك و یۆگا.. هتد.

هەمووی پارە پەیاکردنەو هەڵخڵەتاندنی خەڵکییە بەناوی ڕاهێنەری جیهانی و کە هیچی هیچ پلەیەکی زانستی بڕوا پێکراوی نییە.

پزیشـــك و ئوســـتازی بەنـاوبـانگی چینی (دوگیەس چینـگ) کە لێکۆڵەرو دانشـــمەندە لە یەکێك لەزانکۆکانی ویلایەتی میجینگ، پســـپۆرو شـــارەزایە لەبواری زانســـتی دەروونـاســـی دەڵێت: ئەو کەسـانەی کە یۆگا دەکەن یاخود ریکی، ئەوە بەندایەتی و عیبادەت و توقوساتی ئاینی بت پەرستی (طاوی)یە دەیکەن، بە بێ ئەوەی بە خۆیان بزانن تەنانەت وشـــەی طـاو واتـا وزە لە طاقەو هاتووە یان چینییەکان بە وزە دەڵین (چی)، یابانییەکان دەڵێن (کی)، هیندییەکان پێیدەڵێن (برانە)، فلیپین و ناوچەکانی تری سریلانکا ناویان ناوە بە (مانا/ ماکرۆ)، ناوی تری زۆرە کەهەموویان ئاماژەن بۆ هێزێکی موطڵەق لە گەردووندا کە ئەو هێزە بە خوا ناو دەبەن. لە زانســـتی نوێدا ئەم وشـــانە تەرجومە کراوە بۆ پاراســـیکۆلۆژی یاخود عەرەب پێدەڵێت زانســـتی (ماوراء النفس).

هەمووی باس لەوە دەکات کە لەو هێزەوە دڵ خۆش بێت دەوڵەمەند بێت شیفاء وەربگریت وەك خوای موتەعال مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت.

کەواتە ئەمەش جۆرێکە لە شیرك و هاوبەشدانان، هەندێك لەوانەیە بڵێن خۆ ئێمە وا بیرناکەینەوە بۆ کاری پۆزەتیف بەکاری دەهێنین و کارە نەرێنییەکان بەکار ناهێنن، بەڵام لە کۆتاییدا هەموویان سەر بەیەك قوتابخانەی فەلسەفی وەحدەت وجودن!

ئەم فەلسـەفەی وەحدەت وجودەش کوفرێکی سـەریح و ئاشـکرایە، پێی وایە مرۆڤ بەشـێکە لە خوا و تەنانەت مشـکیش هەر بەشـێکە لە خواو هەرچی دروستکراوەکانی خوایە بەهەموویانەوە خوا پێك دەهێنن و مرۆڤ لەکۆتاییدا دەتوانێت ئاوێتە بێت لەگەڵ خوادا، ئیتر ئەم فەلســـەفەیە ناتوانێت خوای

پەروەردگار لە دروستکراوەکانی جیا بکاتەوە، کورت و پوخت هەمووی کوفرە و ئایینی هیندۆسی و چینییەکانە و لەگەڵ سیحرو جادوودا تێکەڵ کراوە بۆ لەناوبردنی ئینی ئیسلام و سەرگەردانی خەڵکی بەگشتی.

لەکۆتایدا ئەوەم بۆ دەرکەوت کە زیاتر زلهێزەکانی جیهان وەك ڕوسیاو چین و فەرەنساو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، پاشان ئیسرائیل زۆر گرنگی پێداوە، بەشێکی گەورەو بودجەیەکی فراوانیان داناوە لە ناو موخابەراتەکانیاندا بۆ ئەم کارەو لەناو کاری سیخوڕی و هەواڵگریدا زیاتر پەرەی پێئەدرێت، لەدوای ئەوەی بەدوای ئەو زانیارییانەدا دەگەڕام و سەرقاڵ بووم پێیەوە، ئاواتە خواز بووم یەکێك لە جەماعەت ببینم، بەڵام کەس دیار نەبوو.

دەچووم بۆ کەناری دەریا، یاخود بە تەنها دەچووم بۆ پیاسە بۆ دارستان و چیا و زۆر جێگای تر بەڵکو دەرکەون هەر دەرنەدەکەوتن، گومانی زۆرم بۆ دروست بوو لەسەر قسەکانی سەسیل، بەڵام کە ئەنجامی ئەم قسانەشیم زانی بەناوی پاراسیکۆلۆژیەوە هەموو درۆو چەواشەکارییە زۆر گرنگ نەبوو بەلامەوە.

بە کەشتی سەفەرم دەکرد بۆ شارێکی کە تر هەر لەوڵاتی نەرویج-دا، لەناو کەشتییەکەدا شێخ بەرقانم بینی لە چێشتخانەکە دانیشت بوو نانی دەخوارد، بەرەو ڕووی ڕۆشتم بۆ ئەوەی قسەی لەگەڵ بکەم، کەچوومە نزیکی ئەو نەبوو. کابرایەکی نەرویج-ی بوو کە بەو شێوە بەرەو ڕووی ڕۆشتم ترسا و وتی بە دوای کەسێکدا دەگەڕێیت؟

ماکوان: بەڵێ، ببوورە ئیزعاجم کردی نانیشـــت دەخوارد، لە هاوڕێیەکی من دەچیت.

هەســتم کرد شــێخ بەرقان ئاگادارم دەکاتەوە کە دەیەوێت بم بینێت، بەڵام لەکەشتی دابەزیم و کارەکەی خۆمم تەواو کردو گەڕامەوە، شێخ بەرقان هەر نەبوو و دەرنەکەوت. ماوەیەکی زۆریشـە سـەسـیل-یش دەرناکەوێت هەموو هەر ونن، لەدڵی خۆمدا دەم وت بڵێی سەسیل ڕاست بکات و زانیبێتیان من زانیومە بۆیە نـاوێرن خۆیـان دەرخەن. چەنـد ڕۆژێکی مـابوو بۆ ڕەمەزان خەریکی خۆ ئامادە کردن بووم بۆ مانگی ڕەمەزان و وتنەوەی دەرس و دەور لەم مانگەدا،

یەکەم شەوی ڕەمەزان دوای ئەوەی کە ڕاگەیەنرا کە بەیانی ڕەمەزانە دەستم کرد بە نوێژی تەڕوایح و دوعای مانگی ڕەمەزانم خوێند: الله أكبـــر، اللهــم أهلــه علينــا بالأمــن والإيمــان والســلامة و الإســلام والتوفيــق لمــا تحــب و ترضـى، ربنـا وربـك الله.

لەدوای تەواو بوونی نوێژی تەراویح لە مزگەوتەوە دەگەڕامەوە بۆ مـاڵەوە تەماشا دەکەم حەزقیل لە سەرسوچی کۆڵانێکدا وەستاوە، دەڵێت شێخ ماکوان ڕەمەزان موبارەك.

ماکوان: کورە حەزە گیان ڕەمەزان موبارەك، شــەوال موبارەك، موحەڕەمت موبارەك هەرچی مانگە موبارەك، ئەوە تۆ لە کوێیت؟

حەزقیـل: وەڵڵا حەمە مـاکوان شــێخ بەرقـان وتی مەچن بۆ لای مـاکوان تـا ڕەمەزان.

ماکوان: بۆ تا ڕەمەزان؟ ئەمە چیە ئەم فەلسەفەیە؟ ئەڵێی خەڵکی سلێمانی کاریگەری لەسەر تۆش داناوە حەزە گیان وا بە من دەڵێیت حەمە ماکوان؟.

حەزقیل: سوێند بەخوا بیرم ئەکردی، کە ئەمبینیت حەزم دەکرد بێم بۆ لات، نەشمدەوێرا قسەی شێخ بەرقان بشکێنم، ئەو وتی نەچن بۆ لای ماکوان چونکە ئێستا گومانی بۆ دروست بووە لەسەر قسەی سەسیل وادەزانێت کە ئێمە جاسوسین، با ئەوگومانانە بەتەواوەتی نەمێنێت ئەوە منیش لە ڕەمەزاندا هاتم و سەسیل-یش بەستراوەتەوە و لە جێگایەکدان تا ئەم مانگە تەواو نەبێت بۆی نیە بێتە دەرەوە، بە نێزەك و شیهاب خوای گەورە دەیانسوتێنێت، جا هەموویان کۆت و پێوەندی خۆیان دەکەن، تا ئەم مانگە تەواو دەبێت. دوایش جەماعەت دێن بۆ لات، شێخ دەی وت دەرسەکانی بگۆڕێت بۆ ڕەمەزان شتێکی تر باس بکات.

ماکوان: کەی دێن بۆ لام؟ بۆ زانیاریت قسەی سەسیل زۆر کاریگەری نەبوو.

حەزقیل: وەڵڵاهی نازانم ئەوە لەدەست شێخ بەرقان-دایە. شەو درەنگە بڕۆ ئیسراحەت بکە بەیانی دەچیت بۆ کار، بەڵام قسە هەر کاریگەری هەیە.

ماکوان: بەپێکەنینەوە حەزە گیان خۆشحاڵم، توخوا خیانەت و شتی وام لێمەکەن، خۆشم دەوێن ڕەفیقین با بەینمان بمێنێت بۆ یادگاری خۆشە، بەڵکو خوای پەروەردگار لەبەر برایەتیمان لە قیامەت لە ژێر عەرشی خۆیدا کۆمان بکاتەوە برا.

حەزقیل: بە پێکەنینەوە لەخوا بترسە، اتق الله وەك خۆت دەڵێیت: دوو ئەوەندەی (موخصار)ی برام و (مونبیل)ی خوشکم لەدڵمدا خۆشەویستی.

ماکوان: وەڵلاهی حەزە گیان ئەمەش نوێ بوو، دوو ناوی خۆشــن موخصــارو مونبیل خوا لێت نەسێنن ئەگەر ماون.

حەزقیـل: ڕۆحی حەمە مـاکوان، هەردووکیـان مـاون مونبیـل-ی خوشـــکم ئەتناســـێت، لەم ڕۆژانەدا لەگەڵ حەنانە گوێیان لە تۆ بوو کە دەفت لێئەداو سروودت ئەوت بۆ ئانای کچت، موخصـــاریش هەر دەتناســـێت و لەگەڵ خۆمانەو قوتابی شێخ بەرقان-ە.

ماکوان: دەی باشە برا سڵاومان بگەیەنە السلام علیکم.

حەزقیل: وعلیکم السلام.

## هێزی وزەی ئیسلام و کاریگەری بۆ جنۆکەو مرۆڤ

مانگی ڕەمەزان بۆ موسوڵمان هەمیشە مانگێکی ئارام بەخش و پڕ وزەو چالاکییە، هەر لە نوێژو ڕۆژووەوە بیگرە تا دەگاتە تەراویح و ویتر و شەونوێژ. ئەو مانگی ڕەمەزانە زۆر خۆشحاڵ بووین، هەرچەندە هەموو ساڵەکانی مانگی رەمەزان هەر مایەی خۆشحاڵی بووە.

ڕەمەزانی ساڵی ٢٠١٦ بۆ من زۆر خۆش بوو، لە هەمووی خۆشتر زانستی نوێ و زانیاری نوێ بوو وەرمگرت لەسەر ئەم ئایینە و ناساندنی کەسانی نوێ بوو بۆ من.

لە شەوەکانی لەیلەتولقەدردا تا نوێژی بەیانی دەمامەوە لە مزگەوت هەرچەندە بەهۆکاری ئەوەی کە ڕەمەزان دەکەوێتە هاوینەوە شەوانی کورت بوو، بەڵام هەر تام و چێژی تایبەتی هەبوو. زۆر شەو کاتژمێر ٢:٤٥ خولەك کە لە مزگەوت نوێژی بەیانیمان دەکرد بەرەو ماسی گرتن یاخود دەچوومە سەر دەریا لەوێدا ئەو سورەت و ئایەتانەی لە بەرم بوو دووبارەم دەکردەوە تا کاتژمێر ٤ بۆ ٥ بەیانی بەتەنها دەگەڕام، یاخود کتێبێکم دەبرد بۆ خوێندنەوە ئینجا دەهاتمەوە بۆ ماڵەوە تا ماندوو دەبووم.

شەوی ٢٣ ڕەمەزان بوو لە کەنارێکی دەریا دانیشتبووم بەدەنگی بەرز قورئانم دەخوێند، دەمەو بەیانییەکی زۆر ئارام و خۆش بوو. لەپڕ کۆمەڵێك خەڵك لەدوورەوە لەپشتمەوە دەرکەوتن و دەنگیان دەهات و منیش دەنگی خۆمم

هێواش کردەوە ئەوەنـدە گوێم پێنەدان دوور بوون لەمنەوە. ئەگەر بە پێ بهاتنایەتە لای من بەلای کەمەوە ٥ خولەك ڕێگا لە من دوور بوون، بەڵام کە سەرم داخست و بەرزم کردەوە تەماشام کرد شێخ بەرقان و ڕاقی و حەزقیل و کۆمەڵێکی تر لەگەڵ شـێخ بەرقان-دا لە پشـتمەوە وەسـتان، سـڵاویان کرد و منیش وەڵاممدانەوە. بە پێکەنینەوە وتم ئەوە کوێڕا گەیشـتنە لام ماشـاء الله دەڵێی جنۆکەن!

شێخ بەرقان: دەنگوباست لەگەڵ ڕەمەزاندا چۆنە، ماندوو دەبیت؟

ماکوان: ماندوو دەبین، بەڵام کاریگەرییەکی ئەتۆی نییە شێخ گیان.

شێخ بەرقان: ئەی ماڵتان ئاوابێت ڕۆژوو نابێت لە پێوەری خۆی دەرچێت، ئێوە جاری واهەیە ١٩ بۆ ٢٠ کاتژمێر بە ڕۆژوو دەبن، پێوەری ڕۆژوو ئاستەمە لە ١٦ کاتژمێر دەربچێت.

ماکوان: وەڵڵا یا شێخ فتوایەکی وا دراوە کە گوایە لەگەڵ سعودیەدا بشکێنرێت، بەڵام وابزانم ئەو فتوایە دەقیق نییە و لێرە لەلایەن زۆربەی مزگەوتەکـان و ڕێکخراوە ئیسلامیەکانەوە ڕەت دراوتەوە و بەڵگەیان لاوازە.

شـێخ بەرقـان: نـا، ئـاگـام لەوفتوایەش هەیە مەبەسـتم ئەوە نییە، ئەوە بە دڵنیـاییەوە جـائیز نییە، بەڵام مەبەسـتم ئەوەیە کە هەنـدێـك گۆڕانکـاری لەکاتەکاندا بکرێت، چونکە ئەو کاتانەی کە خوای گەورە دایناوە مەبەسـت تەنها پێی پێوەرە. سبحان الله موسوڵمان ئێستا وای لێ هاتووە مانگ و ڕۆژیش دەپەرسـتێت، ئەو قیاسـە بۆ سـەردەمی خۆی بووە کە پێوەری کاتژمێریان بۆ دیاری نەکراوە، ئێسـتا کاتژمێر هەیە بۆ بەو پێوەرە نایکەن، لەسـەر فەرموودەی

پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە لەباسی دەجال لێیدەپرسن ڕۆژی یەکەمی بەساڵێك دەڕوات، هاوەڵان ڕەزامەندی خوایان لێبێت، فەرموویان ئەی نوێژ چۆن بکەین ئەوکاتە؟ فەرمووی کاتی بۆ دیاری بکەن. ئەوەش باشترین بەڵگەیە کە بتوانرێت لەم وڵاتە ئەسکەندەناڤیانەدا کات دیاری بکریت.

ماکوان: ئاخر ئەوە کاری یەک کەس نییە، ئەوە ئیشـــی موفتی و مزگەوتەکانی ئەوروپایە، من تەداخول ناکەم لەو باســـانەدا و لەگەڵ لیژنەی فتوای ئەوروپادا دەڕۆم جێگای متمانەی منن، تۆ واز لەوە بهێنە پێم بڵێ جیاوازی ئێوەی جنۆکە لەگەڵ جنۆکەکانی تردا چییە و ئەوان چۆن لەم مانگەدا ئەبەســـترێنەوە ئێوە ئازادن؟ ئەم باســـە بۆ من زۆر گرنگە، هەرچەندە دەچیتە باســـی غەیبیاتەوە ئەگەر تاوانبار دەبم ئاساییە باسی نەکەیت؟

شـــێخ بەرقان: نا تاوانبار نابیت و ئاســـاییە، چونکە ئەوە زانســـتە دەتوانم من ئیجتیهادی خۆمت پێ بڵێم، ئەوەی بڕوای پێ کرد وەریگریت، ئەوەیشی بڕوای پێی نەبوو ئازادە.

ماکوان: بەدڵنیاییەوە شـــێخە گیان من بە هەند وەریدەگرم و پێدەچیت لە داهاتوویشدا بڵاوی بکەمەوە.

شـــێخ بەرقان: ماڵی تۆ نەشـــێوێت و ئاوەدان بێت، لە کتێبەکەتدا زۆربەی جنۆکەکان هاوکاریت دەکەن ناوت ناوە مەملەکەتی شـــەیتان، ئەی بۆ ناوی نانێت مەملەکەتی پەرییەکان یان جنۆکەکان؟

ماکوان: وەڵڵاهی یا شێخ ناوەکەی زۆر سـەرنج ڕاکێش بوو هەرچەندە خۆشت دەزانی ســەرەتا من لەگەڵ شـەیتانەکان کەوتمە قســە، خوای گەورە ڕەحمی بە

من كرد ئێوە هـاتنە نـاوەوە، ئەم نـاوەش زۆر زەرەری لێـداوم، تەنـانەت لە كوردسـتان ڕێگەیان نەئەدا چاپی بكەم دەیانوت مەبەسـتت یەكێتی و پارتی یە. ئەوەش دەكەوێتە ناوزڕاندن و قسەی ناشرین و تەشهیر، وتم بیخوێننەوە ئینجا لیژنەكەتان قسەی لەسەر بكات.

شێخ بەرقان: بۆ نەیانخوێندبووەوە؟

ماكوان: نەوەڵلا هەر لەسەر بنەمای بەرگی كتێبەكە ڕەفزیان دابوومێ، تا چووم قسـەم لەگەڵ كتێبخانەی گشـتی كرد لە سـلێمانی و لەگەڵ بەڕێوەبەری گشـتی كتێبخانەكە نـاوی كـاك ئـالان بوو كوڕێكی بەڕێز زوو هـات بەدەنگمەوە، بـاش بوو ئەو موافەقەتەكەی بۆ كردم، دیار بوو ئیحراج بوو بوو لە موەزەفەكانیشی.

شـێخ بەرقان: كاك ماكوان بۆ پرسـیارەكەت دەمەوێت ڕاسـتییەك هەیە بیزانیت قورئان هێزو تواناو وزەیە، كەم لە موسوڵمانان ئەقڵیان بەوە بشكێت كە قورئان وزەیە. خوای گەورە كە تەحەدای بێـدین و خوانەنـاس و قوڕەیش و هەموو ڕۆشــنبیرییە جیهانییەكان دەكات بە قورئان؛ دەفەرمووێت: سـوڕەتێك یان دە ســوڕەت بهێنن. خۆ بە تەنها ســوڕەتی كەوثەر ٣ ئـایەتە، شـــاعیر هەبوو لەوسـەردەمەشدا دەیتوانی چەند دێڕێك بهێنێت و بڵێ منیش قورئانم نووسـی، یاخود موسـەیلەمەی درۆزن قورئانی دانا لەسـەر وەزن و فەعیلی قورئان، بەڵام ئایا كەس وەك قورئان وەریگرت وتیان ئەمە هاوشێوەی قورئانە؟

ماكوان: بەدڵنیاییەوە نەخێر.

شـێخ بەرقان: قورئانیش وایە وەك نمونەی كەسـێكی پەیكەرتاش یان شـێوەكار وایە پەیكەرێكی جوانی مرۆڤ دروســـت بكات، بەڵام دەتوانێت ڕۆح بكات بە بەریدا؟ بەدڵنیایەوە وەك خۆت دەفەرموویت نەخێر.

قورئانیش لەو توخمەیە و كەلامی خوایە و پاشـــان وزە و هێزی تایبەتی هەیە، لە قورئانیشـــدا خوای پەروەردگار بە ئاشـــكرا بۆی باس كردووین كە خاوەنی رۆحێكی تایبەتە هەر پیت و وشـەیەك لەو قورئانەدا وزە بەخشـە، گوێگرەكەی و خوێنەرەكەی بەو وزەیە بەهێز دەبێت.

خوای گەورە لەسوڕەتی شورادا دەفەرمووێت:

﴿وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَاۚ مَا كُنتَ تَدْرِي مَا ٱلْكِتَٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ وَلَٰكِن جَعَلْنَٰهُ نُورًا نَّهْدِي بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَاۚ وَإِنَّكَ لَتَهْدِيٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ۝٥٢﴾ [الشورى: ٥٢]

واتە: ئابەو شـێوەیەی كە دەیزانیت ئەی محمد (ﷺ) ئێمە قورئانمان بۆ ڕەوانە كردیت لەلایەن خۆمانەوە (كە ژیانبەخشـــە و وزەی هێزیت هەیە بە ڕۆح و گیان و عەقڵ)، تۆ نەتدەزانی قورئان چییەو ئیمان چییە، بەڵام ئێمە ئەم قورئانەمان كردە ڕووناكی و نورێك كە هیدایەت و ڕێنموونی هەركەس كە بمانەوێت لە بەندەكانمانی پێ دەكەین، (ئەوانەی دڵی بۆ دەكەنەوەو بەچاكیی گوێی بۆ دەگرن)، بێگومان تۆ ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ڕێنیشاندەریت و ڕێنموونی دەكەی بۆ ڕێگەو ڕیبازێكی ڕاست و دروست.

ماکوان: مەبەستت لە وزە و هێز چییە؟ مەبەستت طاقەی فیزیایی کە وجودی هەبێت لەم گەردوون و کەونەی ئێمەدا؟

شێخ بەرقان: بەڵێ - بەڵێ بەدڵنیاییەوە مەبەستم هێزو وزەیەکی تایبەتە لە ناو قورئاندا کە کاریگەری لەسەر مرۆڤ و لەسەر ئێمەی جنۆکەش هەیە، ئەوەش بزانە ئێمە زووتر هەست بە کاریگەرییەکەی دەکەین تا ئێوەی مرۆڤ.

ماکوان: بەزات و سیفەتی خوا ئەوەی باسی دەکەیت هیچ تێناگەم وەك ئەوە وایە گوێزم بۆ بژمێریت.

شێخ بەرقان: گوێچکە و دڵ و سینەی موسوڵمان دەتوانێت وەریبگرێت ئەو هێزو وزەیە ڕاستەوخۆ خوای پەروەردگار سەرپەرشتی دەکات و لە نێوانی ئیمان و بێ ئیمانیدا پەردەیەك دروست دەبێت و خوای پەروەردگار خۆی ئەو هێزە دەبەخشێت و لە ئیمانی کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر جیاوازترە، تا ئیمانت بەهێز بێت ئەو وزەیە بەهێز تر دەبێت لە مرۆڤەکەدا یاخود جنۆکەکەدا.

ماکوان: چۆن، هیچ تێناگەم ئەمەی باسی دەکەیت بەڵگەی لەسەرە وەك قورئان یاخود سوننەت؟

شێخ بەرقان: بەڵێ بەدڵنیاییەوە، بەڵام پێش ئەوەی بەڵگەکە باس بکەم چەندجار گوێت لێبووە کە باسیان کردووە وتویانە لە شێخ سوفیانی سەوری دەفەرمووێت: بەلامەوە سەیرە موسوڵمان بە بەرد بڵێ ببە بە ئاو نەبێت بە ئاو، ئەوە هێزەی کە سوفیانی سەوری باسی دەکات ڕەحمەتی خوای لێبێت ئەوە ئەو طاقە و ئیمانەیە، یاخود کەسێکی وەك شوێنکەوتوان وەك ئەبو موسلیم خولانی فڕەێیاندایە ناو ئاگر خوای گەورە نەیسوتاند، تەنانەت پێغەمبەر(ﷺ)

ی نەدیبوو لە هاوەڵان هەژمار ناکرێت. ئەوە هێزو وزەو طاقەی ئیمانییە و پاشان هەزارەها پیاوچاك و ئیماندار خوای گەورە ئەو هێزەی پێبەخشیوون.

ئایەتەکە وەك بەڵگە خوای پەروەردگار لە سوڕەتی ئیسرادا دەفەرموویت:

﴿وَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ جَعَلْنَا بَيْنَكَ وَبَيْنَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ حِجَابًا مَّسْتُورًا﴿٤٥﴾ وَجَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ وَفِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرًا ۚ وَإِذَا ذَكَرْتَ رَبَّكَ فِى ٱلْقُرْءَانِ وَحْدَهُۥ وَلَّوْا۟ عَلَىٰٓ أَدْبَـٰرِهِمْ نُفُورًا﴿٤٦﴾﴾ [الإسراء]

واتە: هەرکاتێ قورئان دەخوێنی ئێمە بەربەستێکی (نادیارو شاراوە هێزێکی نادیار) دەخەینە نێوان تۆو ئەوانەی باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی نیە.. (چونکە سوودی لێ وەرناگرن)﴿٤٥﴾. واتە: (چونکە مەبەستیان نیە تێبگەن) ئێمەش پەردە دەنێین بەسەر دڵیاندا تا هەر تێی نەگەن، وە گوێشیان سەنگین دەکەین، جا کاتێ کە لە قورئاندا تەنها ناوی پەروەردگارت دەبەیت (وە باسی بت و بەرنامەیان ناکەیت) پشت هەڵدەکەن و ڕوو وەردەگێڕن و بێزاریی دەردەبڕن و دەڕۆن﴿٤٦﴾.

کەواتە خوای گەورە ئەو کەسانەی کە بڕوایان بە قیامەتو خوا و ڕۆژی زیندووبونەوە نییە، خوای پەروەردگار ناهێڵێت سوود وەربگرن لەم وزەو هێزە.

ماکوان: باشە بەڵگەکان ڕاستە، بەڵام چۆن هەست بە بەرجەستە بوونی بکەم، یاخود ئەگەر لای ئێوەی جن وایە، بۆ جنەکان خێرا ئیمان ناهێنن؟

شێخ بەرقان: خوای پەروەردگار لەسوڕەتی ئەعرافدا دەفەرموێت:

﴿وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱلَّذِيٓ ءَاتَيۡنَٰهُ ءَايَٰتِنَا فَٱنسَلَخَ مِنۡهَا فَأَتۡبَعَهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ فَكَانَ مِنَ ٱلۡغَاوِينَ﴿١٧٥﴾﴾ [الأعراف]

واتە: ئەی محمد(ﷺ) هەواڵی ئەو کەســـەیان بەســـەردا بخوێنەرەوە کە فەرمانەکانی خۆمانمان پێبەخشــی بوو، کەچی ئەویش خۆی لێ داماڵی و خۆی لێ دوورە پەرێز گرت، ئەوســا ئیتر شــەیتان شــوێنی کەوت و دایەپێش و چووە ڕیزی سەر لێشێواوانەوە. ئەزانی ئەو داماڵین و نەسخە چیە﴿١٧٥﴾؟

ماکوان: ئەوە مەبەست ئیمانە؟

شێخ بەرقان: نا ئیمان جیاوازە خوای پەروەردگار باسی ئیمان بە ئاشکرا دەکات، بەڵام ئەوهێزو توانـایە کە لێی دادەمـاڵێـت دەتوانین نـاوی بنێن هێزو وزەی هیدایەتی ئیســلامی، چونکە ئەگەر لەو هێزو توانایە دانەبڕایە شــوێن شــەیتان نەدەکەوت، تێگەیشتی؟

ماکوان: باشە ئەو هێزە چۆن هەستی پێبکەم، ئەتوانم؟

شــێخ بەرقان: ئەی چۆن ناتوانیت، هەمووکات دەتوانیت و باش هەســـتی پێدەکەیت، ئەوەی هەستی پێ ناکات ئەوکەسانەن دوورن لە دین، تا نزیك تر بیت لە ئیمان ئەوەندە زیاتر هەست بەو هێزو توانایە دەکەیت.

هەروەك پێشتر وتم لە کەسێکەوە بۆ کەسێکیتر دەگۆڕێت! لە جنۆکەیەکەوە بۆ جنۆکەیەکی تریش دەگۆڕێت، ئەوە تەنها پەیوەندی بە تەقواو زیادو کەمی ئیمانەوە هەیە، دڵنیام تۆ زۆر باش هەســـتی پێدەکەیت بەڵام تا ئێســـتا لە

زانستەکەت نەکۆڵیوەتەوە، ئەوکەسەش تەنها لە کاتی خوێندنی قورئاندا ئەو هێزەی دەست دەکەوێت و دەبێت ستوونیش وەستابێت وەك نوێژ ڕووەو قیبلە دەوەستی هێزەکە لە تەوقی سەرتەوە دەچێتە ناو گیان تا ئەوکاتەی کە لە ستوونی چەمیتەوە بەرەو ڕکوع و سجود لەوکاتەدا ئیتر قورئان خوێندن نامێنێت هێزەکەش نامێنێت، چونکە وزەکە لە تەوقی سەرەوە دەچیتە ناو لاشەی مرۆڤ.

ئەگەر جوانتر بۆت شیبکەمەوە تەوقی سەری مرۆڤ وەك پۆپنەی کەڵەشێر خاوەنی رادارە وەریدەگرێت ئەو هێزە کە چەمییەوە ڕادارەکە وەریناگرێت.

ئەگەر تەماشای ئەو ئایەتە بکەیت کە پێشتر باسم کرد لە سوڕەتی ئەعرافدا بەجوانی دەردەکەوێت کە ئەو وزەو طاقەیە نەما وەك سەگ هەڵدەلەرزێت هەناسە برکێی پێدەکەویت و هیچ ئەرزشی نییە با ئایەتەکە وەك خۆی بڵێین کە دەفەرموێت:

﴿وَلَوْ شِئْنَا لَرَفَعْنَٰهُ بِهَا وَلَٰكِنَّهُۥٓ أَخْلَدَ إِلَى ٱلْأَرْضِ وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ ۚ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ ٱلْكَلْبِ إِن تَحْمِلْ عَلَيْهِ يَلْهَثْ أَوْ تَتْرُكْهُ يَلْهَث ۚ ذَّٰلِكَ مَثَلُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا ۚ فَٱقْصُصِ ٱلْقَصَصَ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٧٦﴾﴾ [الأعراف]

واتە: خۆ ئەگەر بمانویستایە ئەوە بەو ئایەت و فەرمانانە بەرزمان دەکردەوە، بەڵام ئەو خۆی چەسپان بەزەویەوە و (دەستی کرد بەدنیا پەرستی و) شوێنی ئارەزووی خۆی کەوت، جا نموونەی (ئەو جۆرە کەسانە) وەکو نموونەی سەگ وایە ئەگەر دەری بکەیت و پیایدا هەڵبشاخێیت هەناسە بڕکێیەتی (زمان دەردەکێشێت)، یاخود ئەگەر وازی لێ بهێنیت ئەوە هەر هەناسە بڕکێیەتی،

ئەوە نموونەی ئەو کەســـانەیە کە ئایەتەکانی ئێمەیان بەدرۆ زانیوە و بڕوایان پێی نەبووە، کەوابوو ئەم جۆرە بەسـەرهاتانە بگێڕەرەوە بۆ ئەوەی (دابچڵەکێن و) بیربکەنەوە﴿١٧٦﴾.

ماکوان: بەڵێ تا رادەیەك بڕوام هەیە، بەڵام راو بۆچونەکانت ســەیرن و قابیلی وەرگرتنیشن.

شێخ بەرقان: ماکوان گیان دەزانی بۆچی قورئان بەشەودا دابەزیوە؟

ماکوان: نەوەڵڵا، جا بەشەو دابەزیوە؟

شـێخ بەرقان: ئەی چۆن خوای پەروەدگار دەفەرموێت لە شـەوی قەدر دامان بەزاندوە، یان لە سورەتی دوخان دا هاتووە:

﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةٖ مُّبَٰرَكَةٍۚ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ﴿٣﴾﴾ [الدخان]

ئێمە لە شـــەوێکی بەفەڕو پیرۆزدا (کە شـــەوی قەدرە) ناردوومانەتە خوارەوە، بەڕاســـتی ئێمە بێدارکەرەوەین) خەڵکی بەئاگا دەهێنین و هۆشـــیاریان دەکەینەوە﴿٣﴾.

ماکوان: ڕاستە ببورە، بیرم نەمابوو.

شـێخ بەرقان: خۆ من دەزانم دەیزانیت، بەڵام تۆ کە ئێمە دەبینیت زۆر شـتت بیر دەچێتەوە، ئەوەش پەیوەنـدی هەیە بە خۆتەوە، مـاکوان زۆر بەدوای زانستەوەیت ئەوەندەت لە مێشکدایە وەك شەپۆلی دەریا مل ئەدات، وا مەکە

فریای دەکەویت بە پشتیوانی خوا. چونکە زۆر گەڕان بەدوای شتێکدا و ئەگەر خۆت کۆنەکەیتەوە لەگەڵیدا لەناوت دەبات، ئێمە تازە لەگەڵتاین و برا و کەس و پشـــتیوانین بە ئیزنی خوا، مەگەر ڕۆژی خۆت تەواو بووبێت دەنا هەرگیز بەپشـــتیوانی خوا ناهێڵین هیچ کام لە شـــەیتانی ئینس و جن زەفەرت پێبەرن، وەك وتم مەگەر قەدەری خوای گەورە قەدەرتی تەواو کردبێت.

ماکوان: خوای گەورە پاداشـتی خێرتان بداتەوە، ئەوە لە چاکەی خۆتانە، خوای گەورە هەموولایەك مەحفوز بکات، بەس حیکمەت چییە کە قورئان بە شـەودا هاتۆتە خوارەوە؟

شـــێخ بەرقان: لەبەر ئەوەی ئەو ماددەی هێز و توانایە لە قورئاندا بۆ مرۆڤ بەشەودا زیاتر کاریگەری دەبێت و کار دەکات.

ماکوان: باشە ئەو هێزە بۆ خۆی چییە و چاکە و سوودی چییە؟

شـێخ بەرقان: ئاسـودەییە، ئارامییە هەتا ئەو وزەیە زیاد بێت فریشـتەی زیاتر لەگەڵدا دەبێت، وەك عەرزمکردی ئەو هێزە بەشـەودا زیاتر کار دەکات، ئەگەر بڵێم بەڕۆژدا کـاریگەرییەکی ئەتۆی نییە تەمـاشـــای سـورەتی قەدر بکە، شەوێکمان هەیە ناوی شـەوی قەدرە، بەڵام ڕۆژی قەدرمان نییە، ئەم شـەوەیش شـەوی ئاسایش و ئاشتی و هێمنییە کە فریشـتەکان دادەبەزن لەگەڵ ئەوەشدا کە خەتی ڕۆشـــنـای بەرەبەیـان دەردەکەویـت ئەو فریشـــتـانە وردە وردە دەگەڕێنەوە بۆ جێگـای خۆیـان، چونکە خودی شـــەویش بۆ خۆی مـادەیە و ماددەیەکی زۆر گرنگە پێداویستییە بۆ لاشەی مرۆڤ!

ئایەتەکەش دەفەرمووێت:

﴿تَنَزَّلُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ فِيهَا بِإِذۡنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمۡرٖ ۝٤﴾ [القدر]

واتە: لەو شـــەوەدا فریشـــتەکان کە جوبرەئیل-یشـــیان لەگەڵدایە، دادەبەزن لەســـەر ڕوخســـەت و مۆڵەتی پەروەردگاریان، بە جۆرەها فرمان و کار (بە تایبەت بۆ سەردانی خوا پەرستان، بۆ سەردانی مزگەوتەکان، بۆ گوێگرتن لە قورئان و ...هتد)

﴿سَلَٰمٌ هِيَ حَتَّىٰ مَطۡلَعِ ٱلۡفَجۡرِ ۝٥﴾ [القدر]

ئەو شەوە سەلام و ئاسوودەیی و ئاشتی و ئاسایش و ڕەحمەت و میهرەبانە، هەتا کاتی بەرەبەیان، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (من قام لیلة القدر إیمانا واحتسابا غفر له ما تقدم من ذنبه)، واتە: ئەوەی (لیلة القدر) بە خواپەرستی و یادی خوا بباتە سەر بە ئیمان و باوەڕی دامەزراوو بە تەمابوونی پاداشت و ڕەحمەت، خوای گەورە لە هەموو گوناهەکانی ڕابردووی خۆش دەبێت، (بوخاری و موسلیم) ڕیوایەتیان کردووە.

کاك ماکوان شتێکت فێردەکەم کە لە ژیانتا سوودی زۆر لێوەربگریت، خەڵکیش سودی لێوەربگرێت.

## شاراوەیەك ئاشكرا دەبێت

دانیشــتەنەكەمان لەگەڵ جەنابی شــێخ بەرقان بەردەوام بوو، تا هاتە ســەر باسی ئەوەی وتی دەمەوێت شتێكت فێر بكەم زۆر سوودی لێدەبینیت.

ماكوان: ئەو شتە چییە شێخە گیان؟

شــێخ بەرقان: ئەو هێزەی پێ زیاد دەكەیت لە ژیانی خۆتدا ئەگەر زۆر بیلێیتەوە، ئەویش زیكری.. (لا حول ولا قوة الا بالله العلي العظيم).

ئەو هێزەت پێدەبەخشێت كە پێشتر لەخزمەتاندا باسم كرد، وا نەزانیت ئەو هێزە تەنها مەبەســت پێی شــتێكی ســادەیە خوای پەروەردگار لە ســورەتی كەهفدا بە ئاشكرا باسی دەكات كە خۆی خاوەنی ئەو هێزەیە دەیبەخشێت و وەریشی دەگرێتەوە لە كزبوونی ئیماندا یاخود كوفركردندا لەباسی چیرۆكی دووهاوڕێكەی كە یەكێكیان خاوەنی باخ و باخاتو دەوڵەمەندە دەفەرموێت:

﴿وَلَوۡلَآ إِذۡ دَخَلۡتَ جَنَّتَكَ قُلۡتَ مَا شَآءَ ٱللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِۚ إِن تَرَنِ أَنَا۠ أَقَلَّ مِنكَ مَالٗا وَوَلَدٗا﴿٣٩﴾﴾ [الكهف]

واتە: دەبوا كاتێك چوویتە ناو باخەكەوە بتوتایە ماشــاءالله (ئەم هەموو نازو نیعمەتە بەخشــی خوایە، بڕوا ناكەم كە هیچ هێزو پشــتیوانی و هێزی ئەو خوایە، (بەتایبەت) كاتێك كە من دەبینی ماڵ و سامان و نەوەم لە تۆ كەمترە.

ماکوان: ڕاســت دەفەرموویت، بەڵام شـێخ گیان لەوە تێناگەم کە شـەیتانەکان دەزانن قورئان ئەو کاریگەرییەی هەیە باشــە ئەی بۆ شــەیتانن؟ بەکورتی مەبەســتم ئەوەیە ئەو جنۆکانەی تر هەر لە جنســی ئێوەن کەچی ئەوان ڕادەکان ئێوە دەســت لە قورئان ئەدەن لەبەرتانەو دەچنە ناو مزگەوتیش، سەرم لەمە دەرناچێت و حیکمەتەکەی نازانم.

شێخ بەرقان: سیستەمی ژیانی ئێمە و ئێوە و ئێمە لە یەکەوە نزیکە لەبواری کوفرو ئیماندا، ئەگەر بپرســم بۆچی کەســێکی بێ دین ئیمان نـاهێنێت ســەرەڕای ئەو هەموو ئیعجازی قورئان و باســی زانسـت و ڕووداوانەی لە مێژوودا ڕوویداوە و لە قورئان و ئیسلامدا باس کراوە؟

ماکوان: ئاخر ئەوانەی ئێمە کە بێدین دەبن هەریەکە هەنجەتێکی[٢] هەیە، بۆ نمونە یەکێك دەڵێت: ئێوە تەفسـیری خۆتانی بۆ دەکەن، کەسـێکی تر دەڵێت پێش (محمد) باس کراوە، کەسێکی تر دەڵێت (محمد) لە شـارستانییەتەکانی ترەوە وەریگرتوە، هەندێکی تر دەڵێن قورئان هیچی ڕاست نییە.

شێخ بەرقان: کامیان ڕاستە؟

ماکوان: هیچیان، هەمووی لە جاهیلی و بێ مێشـکی خۆیانە قسـە وەرناگرن، بەڵام کاریگەری شـتێکی وایان لەسـەر نییە کە وەک ئەوەی ڕەمەزان نەتوانن بێن بەلای موسوڵماندا و ببەسترێنەوە، مەبەستەکەی من ئەوەیە ئەو جنۆکانە کەدەزانن قورئان ئاوا کاریگەری لەسەریان هەیە بۆچی موسوڵمان نابن؟

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٢] _ بیانوو، پاساو

شێخ بەرقان: ئەگەر تەماشایەكی هەردوولا بكەیت هەر وەك یەكە. ئەوانەی ئێوە هەنجەتی زۆر بێمانا دەهێننەوە، ئەوانەی ئێمە جاهیلیەتیان هەیە و جاهیلییەتەكەشـــیان گەیشـــتۆتە ئەوپەڕی. دڵی ئێمەی جنۆكە وەك ئێوەی مرۆڤ نییە كە نییەتی تێدابێت یاخود خوێن بەرێت و خوێن بهێنێت، دڵی ئێمە وزەیەكی بارگاوی دەهێنێت و دەبات تا ئەم لاشـە ناسـك و شـەفافەمان زیاتر كاربكات بۆ كوێ بمانەویت لە كەمترین كاتدا بڕۆین، تەنها مێشـــكی بیركردنەوەمان هەیە. بیركردنەوەش لای ئێمە زۆر لاوازە، ئەو جنۆكانەی كە دەگەنە ئاستی بیركردنەوەی باش راستەوخۆ موسـوڵمان دەبن یان بەداخەوە ئایینەكانی تر هەڵدەبژێرن و دژی موسـوڵمانەكانیش دەوەسـتنەوە، زۆرترین جنۆكە ئێستا جولەكەن واتا سەر بە ئایینی یەهودییەكانن، ئەوەش هەر كاری شـەیتانە، هەنجەتەكانی شـەیتان بۆ ئەوانەی كە مەسـیح و جولەكەن بریتیە لەوەی كە موسـوڵمانەكان زۆر پیســن خۆتانی لێ بەدوور بگرن لەو مانگەدا تەنانەت خۆتان ببەســتنەوە بۆ ئەوەی پیســایی ئەوانتان بەرنەكەوێت. یان دەڵێن ئەوە گەورەیی عەرشـــی ئیبلیس یاخود عەزازیلە بەســەریانەوە كە دووریان دەخاتەوە لە موسـوڵمانان بۆ ئەوەی لەو مانگەدا تووشـی ناڕەحەتی نەبن وە زۆر هەڵەخڵەتاندی تر، یان پێیان دەڵێن لەو مانگەدا بۆیە دوور دەخرێنەوە ئەوە بەندایەتی كردنە بۆ ئیبلیس خۆ كۆمەڵەكەی ئیبلیس بەوە زیاتر بڕوایان بە جنۆكەكانی خۆیان هێناوە دەڵێن بڕۆن بۆلای خەڵكی تر ئاسایە بەس تەنهابەرانبەر بە مسـوڵمانان بەگشتی بەستراونەتەوە، ئاگادار بە ماكوان زۆرێكیش لە زانایان دەڵێن تەنها مەبەســت لە جۆری عیفریتەكانە دەنا هەموو شـــەیتانەكان ناگرێتەوە، هەندێكی تر لەزانایان دەڵێن تەنها خودی ئیبلیس-ە، بەڵام بەدڵنیاییەوە لەمانگی ڕەمەزاندا كە موســوڵمانان بەگشتی بەڕۆژون پارێزراون لە جنۆكەی بیدین. هەندێكی تریان باش دەزانن

خوای پەروەردگار حەقە و ڕاستە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سەربازێکی موخلیسی ئیبلیس-ن

ماکوان: چۆن شتی وادەبێت، دەزانن خوای پەروەدگار ڕاستەو هەیەو بڕواشی پێناکەن لە کاتێکدا دەزانن دەچنەوە بەردەستی ئەو زاتە پیرۆزە؟

شێخ بەرقان: دەتوانم بڵێم هەندێکیان بەتەواوەتی دەیزانن، بەڵام سروشتی خودی ئیبلیس-یان وەرگرتوە.

ماکوان: چۆن؟ ئەگەر بتوانی بۆم شیبکەیتەوە.

شێخ بەرقان: پێم وابێت ئەو چیرۆکە لای ئێمە و ئێوەش تاڕادەیەك زانراوە لە بەشی یەکەمی مەملەکەتی شەیتاندا باست کردووە.

ماکوان: نازانم باسی چی دەکەیت.

شێخ بەرقان: پێش ئێوەی مرۆڤ لەسەر زەوی ئێمەی جنۆکە بووینمان هەبووە. هەموو چاوەڕێ بووین کە ئاوەدانی زەوی و خیلافەتەکەی بکەوێتە دەست ئێمەی جنۆکە.

پێشمان وابوو لە هەموو دروستکراوەکان باشترین، واشمان پەی دەبرد کە مادام ئیبلیس بەرزکراوەتەوە بۆ پلەی فریشتە ئەوا پێدەچێت جنۆکە بگاتە پلەی ئەوان و بەرز تریش، بەڵام کە خوای گەورە خیلافەتەکەی دایە ئادەم و کتێبی بۆ ناردو پێغەمبەری ئێمەش هەر لە ئێوە بوو هەندێك لەشەیتانە لووتبەرزەکان ئەو ڕەوشەیان پێ قبوڵ نەکرا.

بۆیە لەو کاتەوە تا ئێستا ئیبلیس کار بۆ ئەوە دەکات کە مرۆڤایەتی لە ناو بەرێت و خۆی لە جێگایدا حوکوم بکات و دەوری خوا دەبینێت لەسەر زەوی، ئاواتی ئەوەیە مرۆڤ لەناو بەرێت و کافر وبێدینیان بکات. مەرج نییە بەدوای مردنیاندا بگەڕێت، بۆ ئەو تەنها ئەوە بەسە کە خوانەپەرستن و شیرك دروست بکەن، هەموو شتێك بکەن تەنها خەڵکی (ئیسلام) نەبێت.

ماکوان: واتا ئەو جنۆکانەش هەموو دەزانن کەوایە؟

شێخ بەرقان: بەڵێ، بەداخەوە زۆربەیان دەزانن و زۆرێکیشیان هەڵخەڵتێنراوان، بۆ نمونە ئیبلیس ئەوانیشی سەرگردان کردووە بەوە کە لە کۆتاییدا تەوبە دەکات و خوا لێی خۆش دەبێت، بەڵکو دەڵێت ئەوەی کە موسوڵمانان و ئیسلام دەیڵێن ڕاست نییە ئەوە هێزو قودرەتی خوایە دراوە بە من زۆر هەنجەت و شوبوهات(گومان) و شتی تر بڵاو دەکاتەوە.

ماکوان: ئەی باشە هەر ئاوا دەمێننەوە؟

شێخ بەرقان: بەدڵنیاییەوە نەخێر وا نامێنێننەوە زۆریان موسوڵمان دەبن، بەڵام هەندێك لەوانە شەیتان بە خوا دەزانن، هەست دەکەن ئەو خوای ئەم گەردوونەیە. شەیتان لاسایی خوا دەکاتەوە پەنا دەگرم بە زاتی پەروەردگاری حەق.

ماکوان: چۆن لاسایی دەکاتەوە؟

شێخ بەرقان: ئەزانی شەیتان داوای چی لە خوا کرد ؟

ماکوان: بەڵی بێگومان مانەوە تا ڕۆژێ قیامەت.

شێخ بەرقان: بەڵام خوا بە قسەی نەکرد هێشتییەوە تا ڕۆژی نادیار، هەندێك داوای تریشی لێکرد ئەوانیشی بە قسە نەکرد، لەبەرانبەریدا خوای گەورە شتی زۆری پێبەخشی.

ماکوان: وەك چی؟

شێخ بەرقان: ئەو داوایانە بریتی بوون لە:

یەکەم: کە بەشدار بێت لە سەروەت وسامان و ماڵ و منداڵی مرۆڤدا.

خوای گەورە پێیبەخشی.

ماکوان: چۆن شتی وادەبێت!

شێخ بەرقان: زووشتت لە بیر دەچیتەوە ماموستا ماکوان، با چیرۆکەکەت بۆ باسکەمەوە لەسورەتی ئیسرادا چەند ئایەتێکە ئەوەی کە من دەیڵێم بەڵگەی قورئانە.

ماکوان: ئادەی ڕەحمەتی خوات لێبیت بەڵگەکە باس بکە.

شێخ بەرقان: خوای پەروەردگار لە سورەتی ئیسرادا دەفەرمووێت:

﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُواْ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبْلِيسَ قَالَ ءَأَسْجُدُ لِمَنْ خَلَقْتَ طِينًا ۝٦١ قَالَ أَرَءَيْتَكَ هَٰذَا ٱلَّذِى كَرَّمْتَ عَلَىَّ لَئِنْ أَخَّرْتَنِ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلًا ۝٦٢ قَالَ ٱذْهَبْ فَمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ فَإِنَّ جَهَنَّمَ جَزَآؤُكُمْ جَزَآءً مَّوْفُورًا ۝٦٣ وَٱسْتَفْزِزْ مَنِ ٱسْتَطَعْتَ مِنْهُم بِصَوْتِكَ وَأَجْلِبْ عَلَيْهِم بِخَيْلِكَ وَرَجِلِكَ وَشَارِكْهُمْ فِى ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَوْلَٰدِ وَعِدْهُمْ ۚ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ إِلَّا غُرُورًا ۝٦٤ إِنَّ عِبَادِى لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنٌ ۚ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ وَكِيلًا ۝٦٥﴾ [الإسراء]

واتە: (بیریان بێنەرەوە) كاتێك بە فریشتەكانمان وت: ئادەی سوژدە بەرن بۆ ئادەم، هەموو سوژدەیان برد جگە لە (ئیبلیس)، كە وتی: ئایا سوژدە بەرم بۆ ئەو كەسەی كە لە گڵ و خاك دروستت كردووە۝٦١؟! واتە: (شەیتان بێ شەرمانە) وتی: ئا ئەمەیە كە لەمن ڕێزداترە؟! خۆ ئەگەر بمهێڵی تا ڕۆژی قیامەت شەرت بێ هەموو نەوەكانی گومڕاو سەرگەردان بكەم جگە لە كەمێكیان (كە دەسەڵاتم بەسەریاندا نیە)۝٦٢. واتە: (خوای گەورە) فەرمووی: بڕۆ ئەوەی شوێنی تۆ بكەویت ئەوە دۆزەخ پاداشتی هەموانتانە، بێگومان پاداشتێكی مسۆگەرەو (جێگەی هەمووتانی تیا دەبێتەوە)۝٦٣. (خوای گەورە فەرمووی): بڕۆ (چیت لەدەست دێ درێغی مەكە) هەركەس كە توانیت (لەو بەدبەختانە) بە بانگكردن و هاندانیان بۆ (تاوانكاریی پاڵیان پێوە بنێ)، بەهۆی لەشكری سوارەو پیادەی خۆتەوە هێرشیان بۆ بەرە، وە هاوبەشییان بكە لە ماڵ و سامان و منداڵ و نەوەیاندا، ئەوەندە بەڵێن و ئومێدیان بدەرێ و سەریان لێ بشێوێنە، بەڵام بەڵێن و هاندانی شەیتان جگە لە فریودان و

فێڵکردن و ساختە شتێکی تر نیە﴿٦٤﴾. بەڕاستی بەندەکانی من (ئەی شەیتانی نەفرینلێکراو) هیچ دەسەڵاتی تۆیان لەسەرە نابێت و هەوڵ و کۆششی تۆ کاریان تێناکات، وە پەروەردگاری تۆ (ئەی ئیماندار) بەسە بۆ پارێزگاریی و پاراستنت﴿٦٥﴾.

ماکوان: وایە، ئەی دووەم چییە؟

شێخ بەرقان: دووەم داوای کرد لەناو ماڵی موسوڵماناندا بژی، خوای گەورە فەرمووی تەنها لە حەمام و تەوالێتەکانیاندا دەتوانی ژیان بەریتە سەر، پێغەمبەریش (ﷺ) فێری کردین لەکاتی چوونە تەوالێت و حەمام دا بڵین: (اللهم انی اعوذ بك من الخبث والخبائث) وە لە کاتی هاتنە دەرەوەماندا بڵێین: (غفرانـــــــك).

ماکوان: سێیەم چی بوو؟

شێخ بەرقان: داوای کرد کە ببێتە خاوەنی مزگەوت، یاخود جێگای بەندایەتی وەك ئەوەی خوا دەیبەخشێتە موسوڵمانان، پەروەردگاریش بازاڕی کردە جێگای بەندایەتی شەیتانەکان، هەر بۆیە خوا دەفەرمویت باشترین جێگا لەسەر زەویدا مزگەوتە و خراپترینیش لەسەر زەویدا بازاڕە.

ماکوان: ئەی چوارەم؟

شێخ بەرقان: داوای کرد لە خوای گەورە قورئانێکی بداتێ واتا ببیتە خاوەنی کتێب، خوای گەورە شیعرو هۆنراوەی داوەتێ

ماکوان: جاخۆ منیش شیعر دەنووسم واتا شەیتانم؟

شێخ بەرقان: نا، مەبەستەکە ئەوکەسانەن کە شیعر بە خراپ بەکار دەهێننەوە بۆ مەرامی سەرلێشێواندن.

خوای گەورە لە قورئاندا باسی دەکات بۆمان لە سورەتی شوعەرائدا:

﴿هَلۡ أُنَبِّئُكُمۡ عَلَىٰ مَن تَنَزَّلُ ٱلشَّيَـٰطِينُ۝٢٢١ تَنَزَّلُ عَلَىٰ كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ۝٢٢٢ يُلۡقُونَ ٱلسَّمۡعَ وَأَكۡثَرُهُمۡ كَـٰذِبُونَ۝٢٢٣ وَٱلشُّعَرَآءُ يَتَّبِعُهُمُ ٱلۡغَاوُۥنَ۝٢٢٤ أَلَمۡ تَرَ أَنَّهُمۡ فِي كُلِّ وَادٍ يَهِيمُونَ۝٢٢٥ وَأَنَّهُمۡ يَقُولُونَ مَا لَا يَفۡعَلُونَ۝٢٢٦ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ وَذَكَرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱنتَصَرُواْ مِنۢ بَعۡدِ مَا ظُلِمُواْۗ وَسَيَعۡلَمُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ أَيَّ مُنقَلَبٍ يَنقَلِبُونَ۝٢٢٧﴾ [الشعراء]

واتە: ئایا پێتان بڵێم کە شـەیتانەکان دادەبەزنە سـەر کێ۝٢٢١؟ واتە: دادەبەزنە سـەر کەسـانێکی بوختانچی و تاوانبارو گوناهکار۝٢٢٢.واتە: (جادووگەران) گوێ بۆ شـــەیتانەکان دەگرن و زۆربەشـــیان درۆزنن۝٢٢٣. واتە: ســـەرگەردان و سەرلێشێواوەکانیش شوێنی شاعیران دەکەون۝٢٢٤.واتە: ئایا نابینی کە ئەوانە لە هەموو دۆڵێکدا سـەرهەڵدەدەن و لەهەموو شـتێک دەدوێن۝٢٢٥. واتە: ئەوانە شـــتێك دەڵێن و بەکردەوە نایکەن (کردارو گوفتاریان دوورە لە یەکەوە)۝٢٢٦. واتە: جگە لەوانەیان کە باوەڕیان هێناوەو کاروکردەوەی چاک ئەنجام دەدەن و یادی خوا زۆر دەکەن، (وە بەو توانایەیەی کە هەیانە) پشـــتیوانی لە

ئیمانداران دەكەن كاتێك كە ســـتەمێكیان لێبكرێت، ســـەرئەنجام ئەوانەی ستەمكارن دەزانن كە چۆن ژێرەو ژوور دەبنو تیادەچن﴿٢٢٧﴾.

ماكوان: تێگەیشتم ئەوە ڕوونە، ئەی خاڵی پێنجەمی هەیە؟

شـــێخ بەرقان: بەڵێ، زیاتریشـــی هەیە. ئیبلیس داوای كرد كە خوای گەورە بانگی پێببەخشێت، خوای گەورەش مۆسیقای پێبەخشی.

شەشەم: ئیبلیس-ی مەلعون داوای ئارامی بە زیكری كرد ئیبلیس-ی مەلعون، خوای گەورە سەرخۆشی پێبەخشی.

حەوتەم: داوای هاوكاری كرد لە خەڵكی، خوای گەورەش هەرچی فاســـقو فاجرو نەگبەتە كردییە هاوكاری ئەو.

هەشتەم: داوای برای لە خوای پەروەدگار كرد ، خوای گەورەش ئەوانەی كردە برای كە زێدە مەسرەف دەكەن و دەســـتی پێوەناگرن و گوێنادەنە هیچ، لە قورئاندا بە موبەذیر ناسراون.

نۆیەم: داوای لە خوای گەورە كرد كە ئەو ئێوە ببینێـت، بەڵام ئێوەی مرۆڤ ئەو نەبینن. خوای گەورە داواكەی جێبەجێ كرد خوای گەورەش لە ســـوڕەتی ئەعرافدا باسی كردووە بۆمان و دەفەرموێت:

﴿يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ لَا يَفۡتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ كَمَآ أَخۡرَجَ أَبَوَيۡكُم مِّنَ ٱلۡجَنَّةِ يَنزِعُ عَنۡهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوۡءَٰتِهِمَآۚ إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمۡ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنۡ حَيۡثُ لَا تَرَوۡنَهُمۡۗ إِنَّا جَعَلۡنَا ٱلشَّيَٰطِينَ أَوۡلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ٢٧﴾ [الأعراف]

واتە: ئەی نەوەی ئادەم: شـەیتان ئێوەش لە خشـتە نەبات، هەروەک باوک و دایکتانی لە خشـتە بردو لە بەهەشـتدا بە دەرکردنی دان، لەکاتێکدا دەسـتی کرد بەداماڵینی پۆشـاکەکانیان تا عەورەتیان پیشـانی یەکتربدات، بێگومان شـەیتان و دارو دەسـتەی ئێوە دەبینن، لە شـوێنێکدا کە (دنیایە) ئێوە ئەوان نابینن، جا دڵنیابن کە ئێمە شـەیتانەکانمان کردووە بە یارو یاوەری ئەوانەی باوەڕ ناهێنن.

دەیەم: داوای کرد کە بەناو خوێن و دەمارو لاشـەو کون و کەلەبەری مرۆڤدا بڕوات‌و بگەڕێت، خوای پەروەردگار هەمووی پێبەخشـی، لە فەرموودەیەکدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ان الشـيطان يجري من ابن آدم مجرى الدم في العروق فضيقوا مسالكه بالجوع.

ئەمە ئەو خاڵانە بوو کە ئیبلیس داوای کرد و دەیەوێت بەمانە دەوری خوا ببینێت، عەرشی خۆشی لەسەر ئاو داناوە.

ماکوان: ڕاسـتە یا شـێخ بارك الله فيكم، ئەزانی من ماندووم، ئەوە خۆر بەسەرمەوە گەرمەو دەبێت بڕۆم ئیسراحەت بکەم و کاری ترم زۆرە.

شێخ بەرقان: پێدەچێت دوای جەژن سەسیل بێتەوە بۆ لات، بەڵام هەوڵ بدە لێی توڕە مەبە، لەوانەیە لەسەر دەستی تۆ خوا هیدایەتی بدات.

ماکوان: هیچت بیستووە یا شێخ؟

شـێخ بەرقان: هەسـت دەکەم کاریگەری تۆی زۆر لەسـەرە، بەس دەترسـێت پێشـمان ووتوە کە دەیپارێزین بە ئیزنی خوای موتەعال. بیرم چوو پێت بڵێم دیاریەکم بۆ داناویت برۆ بیهێنە، بەڵام تا ڕۆژی جەژن نەچیت بۆ ئەو جێگایە یەکەم ڕۆژی جەژن مافی خۆتە.

ماکوان: باشـە یا شـێخ گیان بارك الله فیکم، ناوی جێگاو شـوێنەکەی پێ وتم سەرم دانەواند بۆ کاتژمێرەکەی دەستم سەرم بەرزکردەوە کەس نەمابوو

## دیارییەکەی شێخ بەرقان

لە دوای ئەوەی هەموولایەك ڕۆشـــتن و بەتەنها مامەوە زۆر ماندوبووم لە کەناری دەریاکە هەسـتم بە ماندوبوون دەکرد بۆیە گەڕامە ماڵەوە خەوتم تا کاتی نوێژی نیوەڕۆ، بەڵام مەراقم بوو بزانم ئەو دیارییە چییە شـــێخ بەرقان بۆی بەجێهیشتووم، پەیمانیشی لێوەرگرتم کە تا ڕۆژی جەژن بەهیچ شێوەیەك نەچم بەلایدا ، جەژنیش زۆری نەماوە.

تا ڕۆژی جەژن نەڕۆشـتم بەلایدا، بەڵام دوای نوێژی جەژن بەرەو ئەو جێگایە چووم کە شیخ بەرقان بۆی باس کردبووم.

جێگاکەش ئەو شـوێنە بوو کە کاتی خۆی لەگەڵ سـەسیل-دا یەکترمان ناسـی، بەلامەوە سەیر بوو!

بیرم لەوە دەکردەوە، بۆ ئەو جێگایە؟

چوومە تەنیشـــت ١٣یەمین دار لە ڕێگاکەوە کە بژاردم ئەو ناونیشـــانەی کە دابووی، لەتەنیشـــت دارەکەوە چەند بەردێك دانرابوو لە ژێر بەردەکانـدا نووســـینێك دانرابوو بەزمانی عەرەبی و بەشـێوەی خەتی کوفی نوسرابوو، خوێندمەوە هیچ مانایەکی نەدا!

بەو ڕێگایەیدا کە هاتبووم گەڕامەوە، کە بەرەو ماڵەوە بگەڕێمەوە لەڕێگا سەسیل پەیدا بوو. بە پێکەنینەوە ووتم چییە ناشێت موسوڵمان بووبیت وا ئاگات لە نهێنییەکانی شێخ بەرقان-ە.

سەسیل: نا بەس ئەوەی کە بەرقان نووسیویەتی بانگ کردنی ئێمەیە بۆ لای تۆ.

هەر کات بتەوێت بانگمان دەکەیت!

ماکوان: وەڵاهی نەمزانیبوو لەجیاتی قۆرییەکەی عەلاددین، ئێستا بووە بە نووسین دیوەکە بانگ بکەم بۆلای خۆم.

سەسیل: ئەوە باسی چی دەکەیت، لێت تێناگەم؟

ماکوان: ئەڵێم هەر ئەم درۆیە مابوو بیکەیت، ئەوە پێت ڕائەبوێرم ئەزانم قسەکانت هەمووی درۆیە، پێش ئەوەی وا هەست بکەیت کە من بڕوات پێدەکەم ئەمەویت قەشمەریت پێبکەم، هەی قەشمەر سەسیل. باشە ناتوانیت لەژیانتا یەك کاتژمێر ڕاستگۆ بیت، تەنها یەك کاتژمێر؟

سەسیل: بۆ چیم کردووە؟

ماکوان: جا چی ماوە نەیکەیت؟

سەسیل: ماکوان کاری من تەواو بوو لەگەڵ تۆ، بەداخەوە هیچم بۆ نەکرا، بەڵام ئاگاداری خۆت بە جنێکی ترت بۆ ئامادە کراوە زۆر بێڕەحمە، ئامادەیی تێدایە بۆ سەرکەوتنی مەرامی خۆی لە گروپی ئێمەدا هەرچی شتە دەیکات؟

ماکوان: هەروەك تۆ خراپەکاری پێدەکرێت، من

خوام هەیە ئێوەش ئیبلیس جا با بزانین کێ بەهێزە.

سەسیل: ڕاستە زۆر ماندووم کردوویت، بەڵام من دەستم نەبردووە بە هەندێك شت و تۆش چاك منت ماندوو و ڕیسوا کردووە. قەرینی هەر کەس بووبم ئەوەی ویستومە وام لێکردووە ڕێکم خستووە بۆ ناو گروپ و کارەکانی خۆمان.

ماکوان: ئەی بۆ ناڵێیت بۆ خوانەناسی و سیحرو جادوو؟ ئەی باشە تۆ لە قیامەت ناترسی؟ لە خوای پەروەردگار ناترسی؟ تۆ کار بۆ کێ دەکەیت؟ ئەوەتا کە سەرکەتوو نەبوویت ڕسوات دەکات، بەڵام خوای پەروەردگار هەرگیز داوای ئەنجام لە ئێمەی ئیمانداری مرۆڤ و جنۆکە ناکات، بەڵکو داوای کردارمان لێدەکات. تۆ ئەو هەموو کردارەت کرد، گەورەو ئاغاکانت داوای ئەنجامت لێدەکەن، ئەوەتا ئەنجامت نەداوە ڕسوات دەکەن هەی ڕسوا! تۆ دەزانی خواکەی من دروستکەری تۆ و ئیبلیس و گەورەکانی تۆشە، بۆ خۆت دەخەیتە ئاگرێکەوە بە هەتا هەتایی نە ساڵێکەو نە دە ساڵەو نە ملیۆنێك ساڵ، بەڵکو ئەبەدی و هەتا هەتاییە.

سەسیل: مەم ترسێنە، ئەو خوایە هیچ دەسەڵاتی بەسەر ئێمەدا نییە!

ماکوان: دەی ئەگەر ڕاست دەکەیت برۆ بۆ ئاسمان وەك پێش هاتنی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، هەواڵی مەلائیکەتاکان بهێنە بزانە خواکەی من لە یەك چرکە ساتدا چۆن بە شیهاب و نێزەك لەناوت دەبات ، ئەوە بەڵگە نییە بەسەرتانەوە؟

ئەی ئەوە بەڵگە نییە بەسەرتەوە کە قورئانی خوای پەروەردگار دەخوێنم خێرا زیرە دەکەیت و دەڕۆیت؟ دەبوو ئێوەی جنۆکە بە زووترین کات بڕواتان بهێنایە.

بەڵگەیەکی تر دەبوو بتانزانیایە ئەو هەموو هەوڵەی کە داوتە لەگەڵ مندا هیچت پێنەکرا. ئەی ناپرسی کێ هاوکارو یارمەتی دەری من بووە، خواکەی من خواکانی تۆی سووك و ڕسوا کردووە، ئەوەتا تۆش لەگەڵیاندا ڕسوا بوویت.

سەسیل: چۆن دەیسەلمێنی خواکەی تۆ لە خواکەی من دەسەلاتدارترە؟ ئەوەتا هەزاران خەڵکی وەك ئێوە لەبەردەستی ئێمەدا کار دەکەن، کار بۆ پاشای گەورەی ئێمە دەکەن، بەندایەتی بۆ دەکەن.

ماکوان: زۆر بەسادەیی وەڵامەکەی ئەوەیە کە وەك تۆ وان، تۆ ئەگەر ئاقڵ بیت چۆن شتێك دەپەرستی لە جنسی خۆتە، هەر وەك خۆتە، پێداویستی هەیە، کاری بۆ ناکەیت سووك و ڕسوات دەکات، پاشان لەگەڵ تۆدا لە ژیانە. سەسیل یەك چارەك بیربکەرەوە لەو ژیان و ڕەوشەی تۆی تێدای، بڕۆ بۆلای شێخ بەرقان بزانە هاوکاریت بکات.

سەسیل: زۆر بێزار بووم لە خۆم و لە تۆ و لەم ژیانەش.

ماکوان: جا من بڵێم چی تۆ شەڕ بە من دەفرۆشی، ئەگەر مسوڵمان بوویت پەیمان ئەدەم گەردنت ئازاد دەکەم، بەڵام یەك کارت پێ دەسپرم بۆم بکە.

سەسیل: چییە؟

ماکوان: تۆ جارێ مسوڵمان بە، ئەوکات پێت دەڵێم.

ســەســیل: با بیرێکی لێبکەمەوە، بەڵام دڵنیابە ئەو نووســینەی شـێخ بەرقان مانای ئەوەیە هەرکات ویســـتت قســـە لەگەڵ جنۆکە بکەیت ئێمە بانگ دەکەیت.

سەسیلم لێ ون بوو ڕۆیشت، گەڕامەوە بەرەو ماڵ نووسینەکەم پێمابوو وتم تۆ بڵێی سەسیل ڕاست بکات؟

هاتمەوە دەرەوە جارێکی تر خوێندمەوە، سەسیل هاتەوە بۆ لام.

سەسیل: چیت دەوێت ماکوان؟

ماکوان: وەڵڵا ســـەســـیل ئەمە ڕێك لە دێوەکە و عەلائەدین دەچێت تۆ ئەو فیلمەت نەدیوە؟

سەسیل: نا باسەکە چییە؟

ماکوان: کەسێکە بەناوی عەلائەدین، قۆرییەکی شکاو ئەدۆزێتەوە دەستی لێ ئەدات و دێوێـك دێتە دەرەوە بە قەدەر تۆ نـاشرینە هەرچی بڵێـت بۆی دەکات، ئەڵێم ئەم قەشـــمەرییەی تۆش لەوە دەچێت ئەوە من دەبینیت و دەزانیت کە بەرقان ئەمەی داوە بۆ من، بۆیە تۆش دەردەکەویت!

ســەســیل: لەوانەیە ئەوە کرابیت بە چیرۆکێکی ئەفســانەیی و باس کرا بێت، بەڵام لەوانەیە کەسێکی تر وەك تۆ ئەو توانایەی هەبێت و کەسانی وەك شێخ بەرقان هاوکاری کردبێتن و هەروەك تۆش نووســـەر بووبێتن ئەو چیرۆکەیان نووسیبێتەوە.

ماکوان: ڕاستە چیرۆکە، دەڵێن خەیاڵییە لە بەغداد یان لە دەوروبەری سوریا و حەڵەب ڕوویداوە، گێڕاویانەتەوە دوایی موستەشریقێکی فەرەنسی کردیتیە چیرۆك و لە کتێبی ئەلف لەیلەو وەلەیلە دا نووسیویەتییەوە بەناوی (ئەنطۆنی جالان).

ئەشێت شتێکی ناو خەڵکی بیستبێت و ئەویش نووسیویەتییەوە، باشە من دەتوانم بەس تۆ بانگ بکەم یان جنۆکەی تریش؟

سەسیل: نا دەتوانیت هەرکەست بوێت بانگی بکەیت لە جنەکان، بەس ناوی بڵێ.

ماکوان: ئی خۆ ناوی تۆم نەوتووە تۆ چۆن هاتی؟

سەسیل: با شیخ بەرقان ناوی منی نووسیوە بە نمونە، کە بانگم دەکەیت یەکسەر دیمەلات.

ماکوان: دەی باشە ناوی تۆ لەم نووسینەدا کامەیە؟ من سەسیل نابینم.

سەسیل: ئەو ناوەی کە نوسراوە (ززارمان) ئەوە ناوی منە.

ماکوان: ئەمە نوێ بوو، باشە ئێستا ئەمە بخوێنم و لە جیاتی ناوی ززارمان ناوی ڕاقی یان حەزقیل یان بەرقان بهێنم دین بۆ لام؟

سەسیل: بەڵێ بەدڵنیاییەوە.

ماکوان: نەڕۆیت بزانم ڕاستدەکەیت کاکە حەزقیل-ی برام بانگ دەکەم.

سەسیل: بانگی كە.

ئەمجارەیان كە خوێندمەوە لەجیاتی ناوی ئەو وتم حەزقیل، چەند هەناسەیەكی نەبرد پەیدا بوو.

حەزقیل: شێخ ماكوان السلام علیكم!

ماكوان: وعلیكم السلام ورحمة الله بركاته، وەڵلاهی حەزەی برام یەكەم جارە سەسیل قسەیكی ڕاست بكات، بەڕاستی شێخ بەرقان دیارییەكی نازاداری بە من داوە.

حەزقیل: ڕووی كردە سەسیل بەزمانێك قسەیانكرد خوا ئاگادارە لە زمانی زەردەواڵە دەچوو، هەمووی ز و ب بوو هەر گیزەیان دەهات، ئەوندە زمانەكە ناخۆش بوو. وتم كاكە بیكەن بەخاتری خوا هیچ تێناگەم ئەم بزو بزو بزوەتان لەچییە؟

حەزقیل: وەڵلا پێم وت ببە موسوڵمان ئیتر بەسە خراپەكاری تۆ هەمووشتێكت بۆ ڕوون بۆتەوە، بۆ زانیاریت سەسیل بەهۆكاری ئەوەی نەیتوانیوە سەركەتوو بێت دەربەدەر كراوەو بۆی نییە بڕواتە زیدو جێگاو مەڵبەندی خۆی.

ماكوان: بۆی باس كردم، منیش عەرزم كرد عەبدوڕەحمان حەزقیل-ی برام، بەڵام نازانم لەچی دەترسێت؟

حەزقیل: لە ویستانە دەترسێت.

ماكوان: ویستانە كێیە حەزەی برام؟

سەسیل: خۆشەویست و هەموو کەسی منە هەر لەبەر ئەویشە دەربەدەر بووم بۆ ئەوەی ئەوم بدەنێ، هەرچیان بوێت بۆیان دەکەم، بەڵام تۆیان دایە دەستم لەرێگای ساحیرێکەوە کە تۆ تەنزیم بکەم، بەڵام خۆم ڕسوا بووم دەرکرام و ویستانە-شم لە دەست دەرچوو.

ماکوان: ئەویش تۆی خۆش دەوێت؟

سەسیل: بەڵێ زۆر.

ماکوان: دەی بیرفێنە و بیبە بۆ لای حەزقیل و شێخ بەرقان و جەماعەتەکەی.

حەزقیل: ئاخر ئەو کچی شاهی ئەوانە، باوکی ناوی شا (ڕەوخ)ە کار بۆ گروپی ساحیرانی دژی ئیسلامەتی دەکەن، ئەوەی خواناس و موسوڵمان و ویندار بێت کاریان لەسەر دەکەن بۆ شێواندنی خۆیان و ئایینەکەشیان.

ماکوان: جا ئەگەر کچێك بەم شێوەیە بێت و باوکیشی بەو شێوەیە بێت ئیتر بۆچییەتی، بیرم چوو سەسیل- خۆی هەر لەوانە. وتم ئاخۆ عاشقی چ شیرین و لەیلێك بووە.

حەزقیل: مارەیی لای ئێمە کارکردنە، بەڵکو پەلەبەندی زانست و کارکردن و ئازایەتییە. جوانی ڕوخسار لەناو ئێمەی جندا نییە، لای ئێمە جنۆکە عاشق بوونی هۆکارە نەك ڕوخسار.

ماکوان: وەڵاهی حەزەی برام لای ئێوە زۆر موهیمترە، بەداخەوە لای ئێمە تەنها ڕوخسارە!

حەزقیل و سـەسـیل دەسـتیان کرد بە قسـە کردن، وتم با شـێخ بەرقان بانگ بکەم بزانم دێت، بەڵکو قسەیەکی خێر بکات.

دەستم کرد بە خوێندنەوەی خەت و ختوتەکە و ئەوەندەم زانی شێخ بەرقان هات لەدڵی خۆمدا وتم قۆرییەکەی عەلائەدینی ناگاتێ!

## بەرقان، سەسیل و ویستانە

لەگەڵ خوێندنەوەی ئەو باسەی کە شێخ بەرقان بە دیاری دابوویمێ لەشێوەی نووسینی زمانی قەرەج دەچوو، دەمخوێند و یەك یەك سەسیل و حەزقیل و شێخ بەرقان ئامادە بوون.

شێخ بەرقان: ماکوان ئەوە خێرە وا بانگمان دەکەیت؟

ماکوان: شێخەی برام ئەم نووسینەی جەنابت بۆ من زۆر گرنگە کە دەیخوێنمەوە ئێوە دێن، بۆ من زۆر خۆشە. بۆیە حەزم کرد تەشریف بهێنیت ئەوە سەسیل-یشی لێیە، بەڵکو تۆزێك قسەی لەگەڵ بکەین.

شێخ بەرقان: جا پێش ئەوەی تۆ بانگمان بکەیت هەمووومان بەیەکەوە بووین ئەوە هاتینە لای تۆ.

ماکوان: بەڕاست! ئەی چییە بۆ من تێناگەیەنن؟

شێخ بەرقان: چیت تێ بگەیەنین، تۆ میحوەرێکی لە میحوەرە گرنگەکانی ژیانی سەسیل.

ماکوان: من تێناگەم باسی چی دەکەن، من چی بکەم میحوەری من چییە؟

سـەسـیل و حەزقیل نزیك بوونەوە لە من، شـێخ بەرقان بە سـەسـیل-ی وت هەوڵبدە لەدنیای سـیحرو جادو و شـەیتانەكان وەرە دەرەوە، لەگەڵ خۆماندا بە و و ماكوان-یش دوعای خێرت بۆ دەكات.

ماكوان: جا وەك ئەوەی كە دەفەرموون ئەگەر بێت و سـەسـیل موڵمان بێت ئیتر برامانەو چی بوێت و ئەوەی لە توانای مندا بێت بۆی دەكەم.

سەسیل: ئەتوانیت بەیەكەوە تەمسیلییەك بكەین و سیناریۆیەك دابڕێژن بۆ ئەوەی نەجاتم بێـت لەو كۆمەڵە خراپەكـارە و ڕزگـار بم و لەبیر بكرێم و كۆتایی بە نارەحەتی ژیانم بێت، ئەوەی تۆ بەسـەرت هێناوم كەس بەسـەر منی نەهێناوە ماكوان؟!

ماكوان: ئەگەر مسـوڵمان بیت هاوكاری تەواوەتیت دەكەم، بەڵام بە مەرجێك شێخ بەرقان ڕێنماییمان بكات، ئەگەر ناخۆشی تووشی خەڵكی بكەیت دڵنیابە خوای گەورە تووشـت دەكاتەوە، خوای پەروەردگار لە سـوڕەتی ئال عمران دا دەفەرمووێت:

﴿إِن يَمْسَسْكُمْ قَرْحٌ فَقَدْ مَسَّ ٱلْقَوْمَ قَرْحٌ مِّثْلُهُۥ ۚ وَتِلْكَ ٱلْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ ٱلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَيَتَّخِذَ مِنكُمْ شُهَدَآءَ ۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ١٤٠﴾ [آل عمران]

واتە: ئەگەر زام و سەختی و ناخۆشییەك دا توشی ئێوە هاتووە، ئەو خەڵكەش تووشـی هەمان زام و سـەختی و ناخۆشـی هاتوون، ئێمە ئەو ڕۆژە دەگێڕین بەناو خەڵكیدا (تا لە جیهانی واقیعیش دا) ئەوانەی باوەڕیان هێناوە خوا

دەریان بخات، وە هەندێك قوربانی و شـــەهیدیشـــیان لێ وەرگرێ، بێگومان خوا ستەمکارانی خۆش ناوێت.

کە ئایەتەکەم خوێند سـەسیل دەستی کرد بە گریان هەستم دەکرد دەلەرزی وتی باشـە من مسـولمان دەبم و مسـولمانیش بووم لەسـەر دەسـتی شـێخ بەرقان، با ماکوانیش بزانێت وتی: أَشْـــهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا الله و أَشْـــهَدُ ان محمد رسول الله.

کە ئەو شـایەتومانی هێنا خەریك بوو باوەشـی پێدا بکەم، شـێخ بەرقان وتی: نەکەیت ئەوە لە ئێمەیە نەك ئێوە ئەگەر باوەشی پێدا بکەیت ئەیکوژیت.

ماکوان: لە خۆشیدا ئەو سروودەم دەوت کە دەڵێت:

نحن الذين بايعوا محمدا
على الجهاد ما بقينا أبدا
نحن الذين بايعوه على الهدى
نحن دعاة الله أبطال الفدا...

هۆنراوەکە دوور درێژە بیلال و عەبـدوڵڵای کوڕی ڕەواحە و هـاوەڵاکـان ڕەزامەندی خوایان لێبێت بۆ پێغەمبەر (ﷺ)یان وتوە.

حەزقیل دەگریا و ئەوەندەم زانی حەنانە و ڕاقی ئامادە بوون. ڕاقی دەی وت بە شێخ بەرقان، هەر بۆیە ناومان ناوە ماکوان.

دوای چۆنی و چاکی لەگەڵ حەنانە و ڕاقی وتم چیتان ناوناوە ماکوان؟

ڕاقی: منداڵێكمان بووە ناومان ناوە ماكوان.

ماكوان: ئەوەندەی تر پێكەنینم دەهات، واتا لە ناو جنۆكەشـــدا ماكوان ناو دروست بوو و هەیە؟!

ڕاقی: بەڵێ، منداڵەكەی خۆمم بە ناوی تۆ ناو ناوە!

ماكوان: تەمەن درێژ بێت و خوای گەورە ساغ و سڵامەتی بكات برا ڕاقی.

سەسیل: ماكوان هاوكاریم دەكەیت؟

ماكوان: كوڕە لە خزمەتام سەلە گیان، نەك هاوكاری خۆم فیدای مسوڵمانان و دینەكەیان دەكەم، چیت دەوێت بیكەین؟

شێخ بەرقان: پێش ئەوەی هەرچییەك بكەن هەوڵبدەن موبارەك بن.

ماكوان: چی بین؟

شێخ بەرقان: موبارەك.

ماكوان: موبارەك بوون واتای چییە ؟

شـــێخ بەرقـان: خوای گەورە لە قورئـانـدا موبـارەكی نـاوبردووە بە واتـای خزمەتكردن و هاوكاری كردنی یەكتر، وشـەی موبارەك ئەگەر بەهەر كەسـەوە نرا پێویســـتە خزمەتی خەڵكی و چوار دەوری بكات. داوا كردنی موبارەكیش تەنهـا بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) جـائیزە كە وەك دوعـا بكرێـت و تەنهـا

پێغەمبەری خوا (ﷺ) پلەو پایەی پێبەرز دەبێتەوە، باقی موبارەك بوون بەدەست مرۆڤ خۆیەتی هەرچی هاوكاری خەڵكی بكات موبارەك دەبیت!

ماكوان: جا ئەم قسەی جەنابت یا شێخ لەسەر چ بنەماو بەڵگەیەك دادەمەزرێت؟

شێخ بەرقان: بەبەڵگەی ئایەت خوای پەروەردگار دەفەرموێت، بەرانبەر عیسای كوڕی مەریم سەلامی خوای لێبێت:

﴿وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا أَيْنَ مَا كُنتُ وَأَوْصَانِي بِالصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ مَا دُمْتُ حَيًّا﴿٣١﴾﴾ [مریم]

واته: وه منی موبارەک و پیرۆز کردووه لەهەرکوێدا بم لێرەدا بەواتای سوودی بەخەڵکی دەگەیەنم بەوەی کە فێریان دەکەم لە بەندایەتی، وە ئامۆژگاری کردووم کە نوێژەکانم ئەنجام بدەم و لە زەکاتدانیش درێغی نەکەم هەتا لە ژیاندا هەم. هەموو ئەمانەی باسمان کرد فێرکارییە و پێغەمبەران بۆیە موبارەکن، چونکە هاوکارو سوود بە خەڵکی دەگەیەنن.

خوای گەورە بە کەعبەش دەفەرموێت پیرۆزو موبارەکە..!

بۆ؟

﴿إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِّلْعَالَمِينَ﴿٩٦﴾﴾ [آل عمران]

واتە: بەڕاســـتی یەكەم خانەو ماڵ ومەنزڵگایەك كە بۆ خەڵكی دانرا لەســـەر زەوی (بۆ خوا پەرســـتی) ئەوەیە كە لە مەككەدایە كە هیدایەت و ڕێنمویی بەخشە بۆ هەموو خەڵكی جیهان.

كەواتە لە كەعبەشـــدا ســـوود هەیە كە تاوان و هەڵەی مرۆڤ پاك دەبێتەوە، مرۆڤ كە دەچێتە حەج و عومرە سوودە كە بە مرۆڤ دەگات.

هەر لەبەر ئەوەیە ئەگەر بێت و هاوكاری هەر كەس بكەیت ئیتر موبارەكیت و خوای گەورە هاوكاریت دەكات و سەسیل-یش لە ئێستادا پێوسیتی بە تۆیە.

ماكوان: باشـــە بە خۆشـــحاڵیەوە لە خزمەتیاین چی دەوێت و چی بۆ بكەم، چیم پێدەكرێت؟

سەسیل: ئەوەی من دەمەوێت تەنها ئەوەندەیە كە دەڵێم ماكوان-م هێناوەتە ناو گروپەكەی خۆمانەوە، جا ئەوكاتە دوو ئامانج دەپێكین، یەكەمیان ئەوەیە كە نەجاتت دەبێت لەشـــەڕی، (ویرســـان) كە برای (ویســـتانە) من خۆشـــم دەوێـت، ئەو زۆر بێـدین و توانایەكی بـاشـــی هەیە لە ئازاردانی خەڵكیـدا. نـامەوێـت بەهیچ شـــێوەیەك لێـت نزیـك ببێتەوە، دووەمیش ئەوەیە كە پەیوەندی بكەیتەوە بە شێخ شاهین- ەوە داوای لێبووردنی لێبكەیت و یەكتر ببینەوە و بۆ ئەوەی بچیتە ژێر ڕكێفی ئەو.

ماكوان: ئەی ڕێگا چارەی تر نییە بێجگە ئەم ڕێگا چارەیە؟

سەسیل: ئەوە لای من هەیە، ئەگەر تۆ فیكرەیەكی باشترت لایە بیڵێ.

ماکوان: ئەگەر دەزانن ئەو ویرســـانە ئەوەندە نالەبارو ئازاری خەڵکی ئەدات بیکوژن و لەناوی بەرن، ئەوە فیتنەیە با خەڵکیش لەشـــەڕی پارێزراو بێت، شێخ شاهین-یش دابنێن بۆ خۆم، بۆ حەوت پشتی ئاقڵی دەکەم.

شـێخ بەرقان: ئاخر کوشـتنی ویرسـان هەروا ئاسـان نییە، پێدەچێت هەوڵدرا بێت بۆ کوشتنی، بەڵام سەرکەوتو نەبووە ئەویش توانای هەیە.

ماکوان: واتا هیچ چارەیەکی تر نییە بێجگە لەوە؟ من ئەوسـەریم لا دیار نییە نازانم چی لێدێت؟

سـەسـیل: ئەوسـەری ئاسـانە، دوای ئەوەی کە تۆ هاتیتە ناوەوە و ئەوە بڵاو کرایەوە، خۆشـت ناسـاند بە شـاهین ئەوە دڵنیابە چاوت لەسـەر نامێنێت و منیش ڕایدەگەیەنم کە بەردەوامی لە کاری سیحرو جادوو.

ماکوان: ئەی کە دوای زانیان من وانیم، دیســانەوە ئازاردانی من دەســت پێدەکاتەوە، ئەوەی ئێوە باسی دەکەن شتێکی کاتیە. کێ ناڵێت هەر لە ئێستا ئێمە ئاشــکرا نەبووین لای ئەوان. بۆیە من دەڵێم بیر لە ڕێگاچارەیەکی تر بکەینەوە، ئاخر خۆ من ناتوانم سـیحر بکەم، خۆم ناتوانم کاری حەڕام بکەم، ئەوە کوفرە چۆن بە گاڵتەشــەوە بیکەم هەر جائیز نییە جالەبەر ئەوە پێم باشە شتەکان بە ئاشکرا بێت و من وەك خۆمم و سەسیل-یش ئیسلام بوونی خۆی ڕاگەیەنێت، ئیتر ئاگری جەرگ هەڵینەگرێت و ژنێکی تری بۆ بێنن.

ڕاقی: مامۆستا ماکوان ڕاست دەکات، ئەوە چارەسەر نییەو ترسناکیشە.

شێخ بەرقان: لەڕاستیدا لەسەرەتاوە منیش بڕوام بە پلانەکەی نەبووە، بەڵام ئەوەی منی ڕازی کردووە سووربوونی سەسیل خۆیەتی و عاشق بوونییەتی، دەنا من ناترسم لە ویرسان، هەرچی بکات ئێمەش ئاگامان لە ماکوان دەبێت، بەڵام دەمەوێت سەسیل-م لەدەست دەرنەچێت و قەناعەت بکات.

لەم قسانەدا بووین سەسیل نەما، سەیرێکی حەزقیل-م کرد وتم ئەوە کوا سەسیل-ی برامان، بۆ وا بێدەنگی؟

حەزقیل: وەڵڵا بڵێم چی برام گوێم بۆ ئێوە گرتوە، ئەوە تورە بوو بەجێی هیشتین. کێشەکە لەوەدایە سیستەمی ژیانەکان جیاوازە، بەزەییم بە سەسیل-دا دێتەوە و تۆش مافی خۆتە بترسیت.

ماکوان: ئەزانن چی برایان و حەنانەی خوشکم، هەرچی سەیری ژیانی ئێوە دەکەم ڕێك وەك ژیانی بەنی ئیسرائیل دێتە بەرچاوم لە قورئاندا کەباسکراوە، ئێوە ژیان و هەڵسوکەوتتان زۆر لە جولەکەو بەنی ئیسرائیلی سەردەمی موسا دەچیت، زۆریك لە کەسە باشەکانتان بەدەست خراپەکانتانەوە گیریان خواردوە.

شێخ بەرقان: ڕاستەکەیت، وایە ئەگەر ئیجازەمان بدەیت ئێمە دەڕۆین بەڵام ئەو نووسینەی بۆم نووسیت ئیتر ناتوانیت بانگمان بکەیت، ئەوە تەنها بۆ ماوەیەك ئەو کۆدەمان دایتێ. ببورە ئەمجارە ناتوانی بە ئارەزووی خۆت بانگمان بکەیت.

ماکوان: ئەوە بەس کاتیی بوو؟

شـێخ بەرقان: بەڵێ تەنها بۆ ئەم ماوە بوو کە تەنها تا سـەسـیل مسـوڵمان دەبێت ئێمە ناتوانین بە ئارەزووی دڵی تۆ بانگمان بکەیت و بێینە لات.

مـاکوان: وەڵڵا بەداخەوە نەمزانی ئەم نووسـینەش ئێکسـپایەر دەبێت و ماوەکەی بەسەر دەچێت.

لەم قسـانەدابووین سـەسـیل گەڕایەوە وتی: فریا کەون پێدەچێت هەرچیمان کردووە و وتوە زانیبێتیان، هەمووشـتەکانمان ئاشـکرا بووبێت بەڵام بەتەواوی دڵنیانیم، چونکە ویرسان وتی: ئاگاداری هەموو شتەکانی نێوان تۆ و ماکوان و هاوڕێکانی ماکوان-م. پێدەچیت لەم ماوەیەدا خۆی بۆ ماکوان ئاشـکرا بکات، چۆن خۆی ئاشکرا دەکات نازانم؟

لەپڕ کەسـیان لە لامدا نەمان و هەر خۆم مامەوە، هەرچی هاوارم کرد شـێخ بەرقان، حەزقیل، سـەسـیل، ڕاقی هیچ وەڵام نەبوو، بۆیەکەم جار لە ژیانمدا لەوکاتەدا بوو کە ترسم لێ نیشت، لەخۆوە ترسێك چووە دڵم.

بەڵام خۆم تێـک نەدا و هەر لەدەوروبەری مـاڵی خۆمـان بووم، خێزانم تەلەفونی بۆ کردم وتی: ئەوە چی دەکەیت لەوێدا وەسـتاویت، لەگەڵ خۆتدا قسە دەکەیت.

ماکوان: ئەوە خەریکی ئامادەکردنی موحازەڕەیەکم بۆ ئەم شەو لە فەیسبوك باسی بکەم.

هاتمەوە ماڵەوە دەستنوێژم گرتو دووڕکات نوێژی ترسم کرد، لە دڵی خۆمدا دەموت داخۆ ئەم هیچوپوچەی تر کتێیە بەناوی ویرســـان، دەبی چی لەژێر سەردا بێت؟

## كۆتایی سەرەتایەكی نوێ لەنێوانی ماكوان و ویرسان دا

سەسیل موسوڵمان بوو ئەوەندەی ئاگاداربووم شێخ بەرقان بردبوویە لای خۆیان و ئاگاداری و چاودێری دەكرد، لەهەمانكاتدا وانەی شـــەرعی پێدەوت، هەرچۆن بوو دەیوسیت بیپارێزێ لە دەستی گروپی ساحیرانی شەیتان و شەیتان بازەكان.

لەڕاســـتیدا ترســـێك لەدڵمادا پەیدا بوبوو لەوەی كەناوی ویرســـان یان هێنابوو، چاوەڕوانم دەكرد لە پڕ دەركەوێت، دەترسـام لە ئاوخواردنەوەم لە نان خواردنم، تەنانەت نەمدەوێرا بەبێ دەستنوێژیش بچمە دەرەوە.

ژیانێكی ناخۆش لەناو ناخ و دڵ و دەروونمدا دروســـت بوبوو، بەڵام بە هۆكاری ئەوەی نادیار بوو و ماوەیەكی پێچوو هیچ ڕووی نەدا، ئاســـایی بوومەوە بەڵام هەر ترسی ئەوەم هەبوو كە شتێكی نەخوازراو ڕووبدات.

ڕۆژێك سێرڤیسی ساڵانەی سەیارەكەم داگیرسابوو و بەدوای شەریكەیەكدا دەگەڕام كە بەهەرزان بۆم سێرڤیس بكەن.

زۆر گەڕام لە نەرویج دەســـتم نەكەوت، برایەك وتی: خاڵە ماكوان بۆ ناچیت بۆ ئەڵمانیا لەوێ هەرزانترە و بەلای كەمەوە ٥٠٠ بۆ ٦٠٠ دۆلار جیاوازییان هەیەو لەوێش ئیشت هەیە، تۆ هەر دەڕۆیت.

قسەكەی لام مەعقول بوو، بڕیارم دا بڕۆم بۆ ئەڵمانیا هەر خۆم بوو كەس نەبوو لەگەڵمدا بێت، خێزانم كاری دەكرد و منداڵانیش لە قوتابخانەو

باخچەی ســـاوایان بوون، بە تەنها كەوتمە ڕێ چوومە ســـوید لەوێوە بۆ دانمـارك. مـانـدوبووم لە دانمـارك لامـدایە بەنزینخـانەیەك و قـاوەیەكم خواردەوە سـەیارەم پڕكرد لە گاز بەرەو سـەیارەكەم ڕۆیشـتم، كوڕێكی زۆر بەڕێز لەتەمەنی خۆمدا، حاجی ماكوان سڵاوی خواتان لێبێت.

ماكوان: علیكم السلام برا.

كوڕەكە: من ناوم ســوركێوە خەڵكی سـلێمانیم، زۆر موتابەعەی جەنابت دەكەم، زۆر خۆشەویستی لامان.

مـاكوان: بەڕێزی كـاك ســـوركێو گیـان خوای گەورە خۆشـــی بوێـیـت و هەردووكمان لە ژێر عەڕشی خۆیدا كۆبكاتەوە، بڵێ ئامین.

سوركێو: ئامین، كاك ماكوان باتری سەیارەكەمان مردووە دابەزیبووم لایتی سـەیارەكەم كاری دەكرد، بیرم چووبوو بیكوژێنمەوە باترییەكەی مراندوە، ئەتوانین بە سەیارەكەی جەنابت شەحنی بكەینەوە؟

ماكوان: بەس من لێی نازانم خۆت دەیزانی؟

سوركێو: بەڵێ كیشەم نییە.

ماكوان: خوا شاهیدە بۆنیتی سەیارەم هەڵدایەوە بەدوای باتری سەیارەكەم دەگەڕام هەر نەمدەزانی لەكوێـدایە! لەدڵی خۆمـدا وتم تۆ بڵێی بـاتری نەبێت، چووم بۆلای ســوركێو وتم كاكە بەخوا نایدۆزمەوە ســـەیارەكەی من بڕواناكەم باتری هەبیت!

سورکێو: بە پێکەنینەوە ڕادەبوێری پێمان، کاك ماکوان سەیارە هەیە باتری تێدا نەبێت؟

ماکوان: دە ئەگەر ڕاست دەکەیت وەرە بیدۆزەرەوە.

ســورکێو: تەماشــای کرد، لەدوای ســەیارەکەتدایە، دواکەی کردەوە هەر نەبوو باتری نەدۆزییەوە بەو خوایە نازانم لەکوێدایە.

مـاکوان: پەلە مەکە بـا تەلەفونێـك بۆ کوڕێکی هـاوڕێم بکەم فیتەرە، تەلەفونم بۆ کرد، وتی لە لای چەپی کورسی دواوەیە.

ســوورکێو: بەخوا ئەمە ناکرێت ئەگەر زمانەکەت باشــە با تەکلیف بکەین لەو سەیارەی ئاودیە، بەڵکو هاوکاریمان بکات.

ماکوان: چووم بۆلایان بە زمانی نەرویجی قســـەم کرد لەگەڵ خاوەنی ســـەیـارەکە وامزانی دانمـارك-یە، چونکە هەردوو زمـانەکە نزیکن لەیەکەوە،بەڵام دیار بوو ئەڵمانی بوو، هەرچۆن بوو وبە ئینگلیزییە شـەق و شـــڕەکەی خۆم تێمگەیاند و ئەویش ررزی بوو لەماوەیەکی کەمدا سەیارەکەی سوورکێو-ی شەحن کردەوە، بە سوورکێو-م وت ئەگەر ئیشت نییە من دەڕۆم دەبێت بچمە ئەڵمانیا.

سوورکێو: منیش بۆ ئەوێ دەچم.

ماکوان: دە دوام کەوە، با بڕۆین.

سوورکێو: باشە.

کەوتینە ڕێ لە ڕێگادا من زۆر بە خێرایی دەڕۆشــتم ســەیارەکەی ئەویش ڤۆگزڤاگن بوو زۆر هێواش دەڕۆیشـــت، خۆم لێ نزیك کردەوە پرســـیم تەلەفونت پێیە؟ هەر تێنەدەگەیشـــت چوومە تەنیشـــتیەوە جامەکەم کردەوە وتم مۆبایلت پێیە؟

سوورکێو: پێمە شەحنی تێدا نەماوە.

ماکوان: ســـوورکێو زۆر خاو دەڕۆیت من ناتوانم وا بڕۆم تۆزێك پێی لێنی برا وانابێت تا دوو ڕۆژی تر ناگەین.

سوورکێو: جا خۆ من لەبەر تۆ خێرا ناڕۆم.

ماکوان: نا بەقوربانت بم لەبەر من لێخوڕە.

دەســتمان پێکرد کیلۆمەتر نەمهێشــت لە ٢٠٠بێتە خوارەوە، ٢٠٠ بۆ ٢٢٠ دەڕۆشتم، بەڕاستی ئەویش باش هات، مونافەسەی دەکردم.

من لە پێشیەوە دەڕۆیشتم لە پڕ سەیارەی ئەو دووکەڵی چوو بە ئاسماندا و سەیارەکەشی چوو بە ئاسماندا.

منیش بە پەلە هێواشم کردەوە هاتمەوە سایدی خۆم، بەڵام یەك سەیارەی تر نەوەستا بەتەنها من بووم. هەمووی هۆڕینی بۆ لێئەدام و جنێوی ئەدا گوێم بەوان نەداو هاوارم دەکرد خوایە بیپارێزە، ســـەیارەکەی هەلا هەلا بوو.

لەدڵی خۆمدا دەم وت بە خوا هیچو پوچی من بوو وامکرد لەو کەسە لەبەر حەزی خۆم ماڵ و گیانیم لەناو برد، زۆر بێتاقەت بووم سەیارەکەی کەوتە لاپاڵی جادەکەو منیش خێرا لامدایە سەرجادەکە. دانمارك زەوییەکەی هەمووی تەختە لاپاڵەکان زۆر نەبوو، بەڵام ویران بوو ئاگام لی بوو سەیارەکەی گڕی تێچوو بوو. هەرچۆن بوو سەیارەکەم وەستاندا بە پەلە بەڕاکردن چوومەلای سەیارەکە تەماشا دەکەم سوورکێو بەدیار سەیارەکەیەوە دانیشتتوە، بەڵام لام سەیر بوو هیچ کام لەسەیارەکان لایان نەدا بەلاماندا هاوکاریمان بکات و بە سوورکێو-م وت لە کوێ نیشتە جێیت؟

سوورکێو: سوید.

ماکوان: هەوڵبدە پەیوەندی بکە بە ئەو کۆمپانیایەی کە سەیارەکەت بیمە کردووە لایان.

سورکێو: سەیارەکەم لای کەس و هیچ شەریکەیەك بیمە نەکردووە.

ماکوان: ئەی کاکە ئەوە زۆر خەتەرە ئێستا پۆلیس بێت ئەتگرێت.

سورکێو: ئەی ئاساییە لەگەڵت سەرکەوم تا ئەڵمانیا؟

ماکوان: لە خزمەتام، بەڵام براکەم ئەو سەیارە بەناوی تۆیە هەر ئەدۆزرێیتەوە.

سوورکێو: ژمارەکەی بەناوی منەوە نییە، بەناوی دایکمەوەیە. ئەویش لە کوردستانە، نایەتەوە بۆ ئەوروپا.

ماکوان: باشـــە ئەی خۆ خوا ئاگای لێیە، بەهەرحاڵ ئەوە کێشـــەی خۆتە، بەڵام ئازارت نییە، ئەی نەتبەم بۆ خەستەخانە؟

سورکێو: نا پێویست ناکات تەنها پشتم ئازاری پێگەیشتوە.

ماکوان: بەخوا دەترسم گەرماوگەرم بیت، نەکو شوێنت شکابێت ئادەی با تەماشای پشت و سەرو قاچت بکەم بزانم خوێنی پێوە نییە، تەماشام کرد هەموو ساغ بوو. برۆ سەرکەوە با بڕۆین، چونکە ناشکرێت لێرە بە جێت بهێڵم، کارەکەشت زۆر نا تەندروستە زوو سەرکەوە بابڕۆین.

وردە وردە ڕۆیشـــتین بەرەو ســـەیارەکە دەســـتیم خســـتبووە ســـەرملم، لەدوورەوە بینیم ســـەسـیل هاوار دەکات، درۆ دەکات ئەوە ویرســـتان-ە، فێڵە لێت دەکات وریای خۆت بە ماکوان.

کە سەسیل-م بینی لای سەیارەکەی خۆمە، دەستی سوورکێو لەسەر شانم نەما، ئاوڕمداوە بۆلای ســـەیارەکەی نە ســـەیارە ماوە نە دوکەڵ نە هیچ ئاسەوارێك، هەموو ئەو سەیارانەی کە دەڕۆن لەسەر ئەو جادە تەماشای من دەکەن. حەپەســـام نەمدەزانی چی بکەم بەرەو لای ســـەسـیل چووم تاگەیشـــتمە لای ســـەیارەکەی خۆم ســـەسـیل-یش دیار نەما. ئەوەندەم نەزانی دوو سـەیارەی پۆلیس گەیشـتنە سـەرم لێیان پرسـیم کێشـەت چیە لەسەر جادەی خێرا (ئاوتۆبان) وەستاویت؟

ماکوان: واهەسـتم کردووە کەسێك لەبان جادەکەدا کەوتووە ویسـتم بچم هاوکاری بکەم، بەڵام دیارە هەڵە بووم.

پۆلیس: خۆ سەرخۆش نیت و نەتخواردۆتەوە؟

ماكوان: نەخێر، مەشروب ناخۆمەوە.

پۆلیس: ئەتوانین فەحسی كحولت بۆ بكەین؟

ماكوان: بەڵێ، بەخۆشحاڵیەوە بفەرموون.

یەكێكیان چوو جیهازێكی هێنا دەبوو فووی پێدا بكەم بزانن ڕێژەی كحول لە لاشـەمدا چەندەیە، دوای ئەوەی كە فووم پێدا كرد دەرچوو كەسـێكی ئاساییم وتیان ئەی و نەخۆشی و كێشە ی چاوت نییە؟

ماكوان: بە پێكەنینەوە، جارێ شـێت نەبووم، دڵنیابن هەر هەڵەی چاوم بووە، ئەشـێت ماندووبم لە ڕێگادا لە بەنزینخانەیەك لائەدەم هەندێك پشوو ئەدەم.

هەموو دەستمان كرد بە پێكەنین و یەكترمان بە جێهیشت و پۆلیسەكان وتیان ئەگەر هاوكاریت پێویسـت بوو ژمارەیەكیان دامێ كە پەیوەندییان پێوە بكەم، زۆر سوپاسم كردن داوای لێبووردنم كرد كە بەهۆكاری منەوە ماندوو بوون.

سـواری سـەیارەكەم بووم وردە وردە كەوتمە ڕێ، هەرچی قورئان لەناو سـەیارەكەمدا بوو خستەمە سـەری و دڵم بە پەلە پەل لێی ئەدا و ناچار جـارێكی تر لامـدایەوە لە بەنزینخـانەیەك و دەسـتم كرد بە دۆنـدرمە خواردن دنیاش ساردە، هەواڵی جێگای خەوم پرسی ناونیشانی موتێلێكیان

دامێ و بۆ پشــوودان چوومە ئەوێ، جارێ هەر لەناو خاکی دانیمارك-دام کاتژمێرێکم ماوە بچمە خاکی ئەڵمانیا، بەڵام ناچار بووم لابدەم.

کاتژمێر شەشی ئێوارەیە چوومە ناو موتێلەکەوە داوای ژوورێکم کرد، خێرا دەســتنوێژم گرت و نوێژی شــێوان و عیشــام بە قەسرو جەمع کرد و لێی خەوتم. ئەوەندە ماندوو بووم کاتژمێر شەشی بەیانی خەبەرم بوویەوە و چاوەڕوانی نوێژی بەیانی بووم تەماشــای کاتی نوێژەکانم کرد لە دانیمارك هێشــتا کاتی مابوو، ناچار خۆم شــۆرد و مامەوە تا چارەك بۆ ٧ی بەیانی نوێژم کردو هاتمە خوارەوە بۆ نان و چای بەیانی بخۆم وتیان چیشــتخانە کــاتژمێر هەشـــــت دەکرێتەوە، چــاوەڕێم کرد لە هۆڵی چــاوەڕوانی دانیشتبووم.

مۆتێــل، ئەو جێگــایەیە کەلە هوتێــل گەورەترە، لە ئەوروپــا زیــاتر بۆ ئیستراحەتی گەشتیاران لەسەر جادە گشتییەکان هەیە.

کچێکی ناسك و جوان هاتە لام وتی قاوە دەخۆیتەوە بۆت بهێنم؟

لەدڵی خۆمدا، ئەمیش لەجەماعەتی ویرســان نەبێت؟ لە ترســاندا، نەخێر، چاوەڕێی نان و چای بەیانیانم تا نان نەخۆم قاوە ناخۆمەوە، لە ڕاســـتیدا ڕێك پێچەوانەکەی ڕاســـتە، چونکە تا قاوەیەك نەخۆم نانوچای بەیانیم بۆ ناخورێت. ناچار تا کاتژمێر هەشت چاوەڕوان بووم.

چوومە ناو چێشـــتخانەکە و دەســـتمکرد بە نان خواردن، هەســـتم کرد مێشــکم ســافە هەســتام بکەومە ڕێ بۆ ئەڵمانیا لەدەرەوە لای ســەیارەکەم سەسیل چاوەڕێی دەکردم.

کە ئەوم بینی ئاوڕمداوە بەملاولای خۆمدا، نەکو کەسێك بڵێت شێت بووە قسە لەگەڵ کێ دەکات، چونکە دڵنیابووم لەوەی کە تەنها من دەیانبینم.

زۆر توڕە بووم؛ نەمدەزانی داخی دڵی خۆم بەکێ برێژم سـەسـیل-یش وەستاوە هاوارم کرد ئەرێ سەگبابینە بۆ وادەکەن بە من؟

سەسیل: خۆت بی ئەقڵ مەکە؛ ئەگەر من نەبوومایە لەوانەیە شتی خراپت بەسەردا بهاتایە.

ماکوان: ئەی بۆ ڕۆیشتی، لەوکاتەدا بۆ نەمایتەوە ڕاتکرد و منت جێهیشت؟

سـەسـیل: ئەزانی چ شـەڕێکمان تووش بوو لەوێدا لەگەڵ جەماعەتی ویرسان، ئەزانی چەندمان لەیەك بریندار کردو یەکێکیش لەوان تۆ خۆش. ئەزانی شێخ بەرقان بریندارە لەگەڵ حەزقیل، خۆی هاتە شەڕەکەوە شێخ بەرقان، خۆ تۆ ئاگات لەهیچ نییە.

ماکوان: نەوەڵڵا ئاگام لە هیچ نییە، خۆ جنۆکە نیم کاکە، چی بووە بۆم باس کە؟

سەسیل: ئەی ناچیت بۆ ئەڵمانیا؟

ماکوان: با بڕۆ سـەرکەوە، دەرگا نەکرایەوە تا من چوومە ناوەوە سـەسـیل دانیشتبوو. ئەوە چۆن هاتیتە ناوەوە؟

سەسیل: لەکونی ئەو جامەوە کراوەتەوە تۆزێکی.

ماکوان: بۆم باس بکە چی ڕوویداوە؟

سەسیل: ویرسان دەویەوێت دوو شت بکات، تۆڵە لە شێخ بەرقان و من بکاتەوە، ئەویش بە هۆکاری منەوە، دوایش تۆ بەرێتە ڕیزی خۆیان و ئیسپاتی بکات بۆ گروپەکە کە ئەو بەتوانایە و من نەمتوانی، بەڵام ئەو لە ئێستادا هیچ ئازارێك بە تۆ ناگەیەنێت، دەزانێت تۆ لەو جۆرە کەسانەی هەتا ڕقە بەرایەتت بکات تۆش ڕەقتر دەبیت، بەڵام ئەو دەیەوێت بە نەرمی لەگەڵتا بڕوات و نایەوێت توڕەت بکات.

ماکوان: جا تۆ ئەمە چوزانیت؟

سەسیل: لە ڕێگای ویستانەوە پێمدەگاتەوە.

ماکوان: بە پێکەنینەوە ئێ ئێ عیشقیش باشە بەس نییە ئەو عونصورە جاسوسەشت هەیە.

سەسیل: ئێ خۆ هەموو بۆ یارمەتی دانی تۆ کار دەکەین.

ماکوان: یارمەتی دانی چی، قوڕتان کردووە بەسەرما بەتایبەتی تۆ سەسیل ئەمە هەموو پەنی تۆیە پێمانەوە، ئەزانیت؟

سەسیل: ئەو دەتوانێت یەك کار بکات، لە ڕاستیدا دوو شتت لێ بکات، بیزانە. قەرزارت دەکات و پاشان لە خێزانت جیات دەکاتەوە.

ماکوان: حەددی چییە! قابیلە منیش ئەوەندە دەست و پێسووتاو نیم.

سەسیل: نەم وتوە کردوویەتی، دەڵێم هەوڵی بۆ ئەدات. بۆ ئەوەی پلانەکەی بزانیت.

ماکوان: ئەی حەزەی برام وەزعی چۆنە، شێخ بەرقان باشە؟

سەسیل: نەوەڵڵا حەزقیل باش نییە، بەڵام شێخ باشترە.

ماکوان: چۆن بڕۆم سەردانی بکەم؟

سەسیل: ئێ خۆ ئەمە کوردستان نییە، شەربەتی نادری بۆ بەریت بۆ خەستەخانە. تۆ دەزانیت شوێنی پشووی ئێمە لە کیشوەرێکی ترە!؟

ماکوان: باشە! تۆش فێر بوویت ڕابوێریت، شەربەتی نادر.

سەسیل: بڕوا بکە ماکوان کێشەی تۆ و خەڵکی تریش ئەوەیە کە وەك خۆتان تەماشای ئێمە دەکەن، کاکە ئێمە زۆر جیاوازین.

ماکوان: دەزانم قابیلە نەزانم ئێوە جنۆکەن و منیش مرۆڤم، بەس پرسیارێك سەسیل چۆن بێمە ناو ئەو شەڕەوە بەشدار بم؟ بەڵکو یەك دوانێك لە شەیتانەکان بکوژم و خێرەکەی ئەکەین بە دووکەرتەوە.

سەسیل: بەشێخ بەرقان بڵێ ئەو دەتوانێت بتخاتە ناو ژیان و کایەی ململانێی ئێمەوە.

ماکوان: سەسیل چیتان لەمن دەوێت؟

سەسیل: هەشت ساڵە نازانیت؟

ماکوان: با دەزانم دەتان ویسـت و دەتانەوێت بمکەنە شـەریکی شـەیتان، منیش حەز بە کارکردن دەکەم لەگەڵ ڕەحمان، بەڵام پرسـیارەکەی من ئەوەیە بۆ ماکوان بەتەنها؟ ناکرێت بچن بۆ لای کەسێکی تر؟

سەسیل: چەندجار ئەو پرسیارەی تۆم دەگەیاند، بەڵام شتێك لە تۆدا هەیە ئەوان ئەوەیان لامەبەسـتە کە لەزۆربەی خەڵکی تردا نییە. منیش نازانم ئەو شتە چیە؟

ماکوان: لەوانەیە خوێنەکەم بێت ئۆ جنۆکەیە. قسـەیەك بکە کە جێگای باوەڕ بێت.

سـەسـیل: باشـە بۆ نایەیت بڕۆین بۆ کەناری دەریای (دیتە) لەوەێ زۆر شت دەبینیت و لێی تێدەگەیت؟

ماکوان: ئەمە لەکوێیە؟

سەسیل: نزیك هیندستان و پاکستان و ئەفغانستان-ە.

ماکوان: هەر زۆر کەریت، من هیچ ناکەم دێم بۆ ئەوێ.

سـەسـیل: جاکەیفی خۆتە من بۆ خۆت دەڵێم، من دەبێت بڕۆم ئەوە کۆنترۆڵی ئەڵمانیایە. ئێستا داوای پاسپۆرتت لێدەکەن.

ماکوان: ئەی تۆ پێت نییە، خوای بکردایە بیانگرتیتایە باش بوو.

سـەسـیل: ئێ من ئێسـتا براتم، بۆ پێت خۆشـە نارەحەتم بکەن و بگیرێم ئەزانی چەندە شەرمکرد لەسەر تۆ؟

ماکوان: مسـولّمان سـەر سـەرو سـەرچاوم، بەڵام سـجن جێگای پیاوچاکانە دەمەوێت بگیرێیت بۆ ئەوەی ببیتە پیاوچاك.

سـەسـیل: ڕادەبوێریت دەزانم، بەڵام ئاگاداری خۆت بە. شـێخ بەرقان ناردمی بۆلات دەی وت ئەوەی کە پێم دابوو بیخوێنێت بەپشـتیوانی خوا یەکسەر دەگەینەوە لای.

ماکوان: وەرە نەڕۆیت، لام نەماوە لەکوێ بیهێنم لە نەرویجە؟

سەسیل: ئەوە کێشەی خۆتە بڕۆ خواتان لەگەڵ.

لە دوای ترسـێکی زۆر بەرەو ئەڵمانیا بەڕێکەوتم، نەمدەزانی چیتر ڕوو ئەدات، لە هەمووی نـاخۆشـتر ئەوە بوو کە تەنها بووم، دوای ئەوەی کۆنترۆڵی ئەڵمانیا دەرچووم هەرچۆن بوو بەپەلە لەناو خاکی ئەڵمانیا وردە وردە کەوتمە ڕێ بەرەو کۆڵن، نزیـك مزگەوتێـك بوومەوە لەوێ پشـووبدەم دوای ٧ کاتژمێر لێخوڕینی سـەیارە. پاشـان چووم بۆ شـاری نۆیس لەوێ هوتێلم گرتبوو، نزیك کاتژمێر دەی شەو گەیشتمە هوتێلەکە، ئەو ژوورەی کە بۆ من دابین کرابوو، دوای خۆشـۆردن هاتمە دەرەوە، تەماشام کرد شێخ بەرقان دانیشتبوو لە ژوورەکەدا.

شێخ بەرقان: ماکوان السلام علیکم

ماکوان: وعلیکم السلام دەنگوباستان؟ حاڵو گوزەرانی تۆو حەزقیل-ی برام چۆنە گوایە لەشـەڕدا بوون بە گوێرەی قسـەی سـەسـیل بێت، نەمزانی بڕوای پێبکەم یان نا.

شێخ بەرقان: ڕاستی کردووە لەگەڵت، من ناردم بۆ لات زۆر ماندوو بووین ئەم چەند ڕۆژە ئاگاداری خۆت بەو بەتایبەت ویرســـان زۆر خەتەرە، ئەو جنە لە جنســـێکی زۆر ترســـناکە و ماندوو بوون لەناویاندا زۆر درەنگ دەست پێدەکات.

ماکوان: جا شـــێخە گیان ئەی من چی بکەم، خۆی کردبوو بە ســـوورکێو ناوێك و ســـەیارەکەی هەلاهەلا بوو کەچی خۆی بریندار دیار بوو، کە ســـەســـیل-م بینی نەماو نەمزانی چی ڕوویداوە، ئینجا من چۆن خۆم لەو هیچوپوچە بپارێزم کە ئێوە دەڵێن تەنانەت خوێندنی قورئانیش کاری لێناکات.

شێخ بەرقان: ماکوان لە مردن دەترسی؟

ماکوان: ئەی هەر ئەو ڕۆحەم هەیە کە من خاوەنیم هیچی ترم نییە لێی بترســـم، ئەویش لەبەر خۆم لێی ناترســـم لەبەر ئەوەی دوومنداڵم هەیە، هەســـت دەکەم ئێســـتا پێیوســـتییان بە منە. دەنا لەڕاســـتیدا مردن لای من تەنها دەرگایەکە لە ئەم ژیانەوە بۆ ژیانێکی دیکە.

شێخ بەرقان: زۆر باشە سەرەتا فێر بە کە مردن دیاردەیەکی تەندروستییە بۆ ئێمەی جنۆکەو بۆ ئێوەی مرۆڤیش.

ماکوان: من دەمرم، دیاردەی تەندروستی چی؟

شـــێخ بەرقان: ڕاســـتە دەمریت، ئەوە دیاردە تەندروســـتییە گەڕاندنەوەی هێزو توانای لاشـــەیی بۆ تۆ لە ژیانێکی ئاســـایی بۆ ژیانێکی (خلود) و بێ

كۆتايی، واتا ســەرلەنوێ پرۆگرامی نوێ لە تۆدا بەرجەســتە دەبێتەوە واتا بەزمانی زانستی ئەبدەيت، ژيانێكی نوێ لە لاشەتدا دەست پێدەكاتەوە.

لە ئێستادا ژيانێكی دنيايی دەژين، نەك ژيانێكی بەردەوامی بەڵكو ژيانێك كە دەســت پێكی هەيە و ناوەندی هەيە و كۆتايشــی دەبێت. ئەوە ژيانی ئەم دونيايەيە كە دەژين!

ژيانی دونيا كە خوای پەروەردگار ناوي لێناوە لە قورئانەكەيدا بريتيە لە ڕابردوو ئێســـتا و هەروەها هەوڵدانە بۆ داهاتوو، ئەمە زۆر بەســـادەيی ژيانی ئەم دونيايەيە كە تێيدا دەژين. ئەم ژيانە سيستەمی وايە ناتوانرێت بگەڕێيتەوە سەری و ئەڕوات و لەسەر كەس ناوەستێت!

بەڵام كە مردن دەست پێدەكات تەواوی ئەو ژيانە كە تێيدا دەژين كۆتايی دێت بۆ ژيانی دنيايی، كۆتايی دێت بۆ زيندوويی هەميشـــەی ياخود (خلود) ژيانی دونيا لەگەڵ زيندووی جيهانی قيامەت ياخود لە بەهەشت دوو ژيانی زۆر جياوازە، ئەو دياردە تەندروســـتييە بۆ ئەوەی دەســـت پێدەكات.

ماكوان: ئەی خۆ هەموو كەس ناچێتە بەهەشــت، ئەی بۆ ئەوانەی دەچنە جەهەنەم ژيانيان چۆنە؟

شــێخ بەرقان: تۆ جارێ واز لە دۆزەخەكە بهێنە بگەڕێوە بۆ بەهەشــت بۆ ئەوەی جياوازييەكەت بۆ دەربكەوێت، ژيانی بەهەشت وەك ژيانی دونيا نييە، نە داهاتووی هەيە نە رابردوو وە نە ئێستا، بەڵكو خلودی هەيە واتا ژيان هەميشەييە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا)

ئەگەر جوان تەماشـای ئایەتەكە بكەیت لەگەڵ ژیانی (خلود)ا باسـی بێ پـایـانیش دەكـات كەواتە مردن بۆ ئەوكەسـانەی دەچنە بەهەشـت دیاردەیەكی تەندروستی٪۱۰۰، بەڵام لە جەهەنەمدا ژیان هەروەك ژیانی ئاسایی دنیایە خەفەت دەخۆیت خواردن دەخۆیت، خەوت دێت، تینووت دەبێت، وە هەروەها وەك ژیانی دنیا وایە. تەنانەت خوای گەورە دوو وشەی جیاوازی بەكار هێناوە، لەبەرانبەر ژیانی بەهەشـت و جەهەنەم و دنیـادا بۆ ژیـانی دونیـا و جەهەنەم (اعیش) بەكـارهێنـاوە، بەڵام بۆ بەهەشـت (یحیا) بەكار هێناوە، ئەگەر بتوانم بۆت وەرگێرمە سـەر زمانی كوردی واتا ژیانی دونیایی و زیندوو بوونەوەی هەتاهەتایی.

ماكوان: وەڵڵا شێخە گیان وات لێكردم مەرگ بە پارە بكڕم.

شـێخ بەرقان: نا، مەبەسـتم تەنها ئەوە بوو، كە بزانیت مردن ترسـناك نییە وەك ئەوەی كە هەندێك موسوڵمان لێی دەترسێت، چونكە مردن پێویستە موسوڵمان بۆی بژی، ئامۆژگاری پێغەمبەری ئازیزمانە (ﷺ)

ماكوان: باشـە شـێخە گیان، من چی بكەم لەم حاڵ و گوزەرانەی كە ئێسـتا تێیدا دەژیم؟

شـێخ بەرقان: هەوڵبدە چەند شـتێكت فێر دەكەم ئیتر دەڕۆم، كە هەرگیز نـاتوانێـت بێ بەلاتـدا، بڕوا نـاكەم بەزوویی بم بینیتەوە یـان بۆ ئەبەدی نامبینیتەوە.

مـاكوان: بۆ شــێخە گیـان بۆ وا بێ هیوام دەكەیـت، بەخوا حەز دەكەم هەمیشە لەخزمەتتاندا بم.

شـــێخ بەرقان: جوان گوێبگرە ماکوان گیان، کاتی موجامەلەی زۆرمان نییە، لەم حاڵتەدا پێویستە نوێژەکانت لەکاتی خۆیدا بێت و دەستنوێژی جوانی بۆ هەڵبگریت.

ماکوان: جا شـــێخە گیان، ئەوە تۆ بڵێیت و نەیڵێیت هەر دەیکەین نوێژو دەستنوێژ فەرزە، ئەمە گرنگییەکەی لە چیدایە.

شێخ بەرقان: پەلە مەکە بزانە چی دەڵێم.

ماکوان: ببورە یاشێخ بەسادە هاتە بەرچاوم چارەسەرەکە کە خۆم ڕۆژانە بیکەم.

شێخ بەرقان: ماکوان گیان سادە نییە زۆربەی مسوڵمان نایکات و تۆش لەو موسوڵمانانەی کە نایکەیت.

نوێژە فەرزەکانم مەبەستمە بەتایبەتی کە لەکاتی خۆیدا بکرێت، چونکە هەموو نوێژەکان لە بەرەبەیانی دەرکەوتنی تیشـــکی خۆرەوە دەســـت پێدەکات تا کۆتایی تیشـــك، کە هیچ شـــەیتان و جنۆکەیەك کاریگەری نامینێت، ئەگەر دەستنوێژو نوێژەکانت لە کاتی خۆیدا کرد بە جەماعەت، یاخود بە تەنهاش بێت گرنگە لە کاتی خۆیدا بێت زۆر نەڕوات بەسەریدا، چونکە مرۆڤ لەو کاتەدا بارگاوی دەبێت بە بارگەیەکی شـــێوە کارەبایی، کە هیچ جۆرە جنۆکەو شـــەیتانێك ناتوانێت لێ نزیك بێتەوە. ئەو پێنج فەرزە نوێژە و لەگەڵ شـــۆردنی ئەو پێنج جێگایەی لە کۆتایی لاشـــەی مرۆڤدایە، ئاگادار بە مەبەستم تەزووی کارەبای ئێوەی مرۆڤ نییە، بەڵکو هاوشـــێوەی تەزوویەکی کارەباییە، کە هیچ جۆرە شـــەیتان و تەنانەت

جنۆکە سـادەکانیش ناتوانن نزیکتان بکەونەوە، مەگەر ئەو کەسەی کە خۆی نوێژ دەکات لە جنەکان ئەو بارگە کارەباییە لە سەر لاشەی ئەویش پێچەوانە دەبێتەوە توانای دەبێت بێتە لاتان و قسەتان لەگەڵ بکات.

ماکوان: ئەمە زانیاریەکی نوێ بوو بۆ من شێخ بەرقان-ی بەڕێز.

شێخ بەرقان: بۆ ئەوەی بزانیت لەوە گرنگتر، ئەو وزەیەی کە دێتە لاشەی ئێوەی مرۆڤ لە ڕێگای نوێژو دەستنوێژەوەیە، سالانەش وزەیەکی بەهێزتر دێتە لاشەتان بە هۆکاری ڕەمەزان، کە لە شەوی لەیەلەتولقەدردا زیاتر لاشەی مرۆڤەکان پڕدەکات. مرۆڤ کە دەچێتە حەج زیاتر لەو وزەیە لەلاشەیدا جێگیر دەبێت، هەروەها بەخشینی سەروەت و سامانیش زیاد دەکات، جا تکا دەکەم بەردەوام ئەوەی پێم وتی بیکەو بە پشتیوانی خوا بەدوور دەبێت لە هەموو بەڵاو موصیبەتێکی شەیتان، بەردەوام بە لەسەر خوێندنی زیکرو قورئان خوێندنەکانت. دڵنیابە خوای گەورە پشتو پەنای هەمووانە و گەورەترە لە هەرچی ئەم بوونە هەیە و خۆی خالقە، تۆ تەرەفی خوای، بیرتە ئەم قسەت بۆ هەموومان دەکرد، تۆ تەرەفی خوایت، وە ئەوەی دوژمنتە تەرەفی شەیتانە، تەوەکولت بەو بێت.

ماکوان: بارك الله فیكم شێخە گیان خوای گەورە لە منتان نەسێنێت.

شێخ بەرقان: براکەم جارێ خوات لەگەڵ من دەڕۆم لێرەوە ماڵ ئاوایی دەکەم لە جیاتی هەموو هاوڕێکانمان لە جیهانی ئێمەی جنۆکە و سڵاوی منیش بەو خەڵکە دڵسۆزە بگەیەنە کە وەك تۆ ئێمەیان خۆش دەوێت و پێیان بڵێ ئێمە براو پشتیانین لەئێمە نەترسن، بەڵکو لە شەیتان و جنۆکە

بەد ئەخلاقەکان بترســـن کە خۆیان دەیانکەنە هـاوڕێی خۆیـان، خوات لەگەڵ.

ماکوان: کە تەماشـای خۆمم کرد لەو کاتەوە بە خاولی حەمامە وە قسـەی لەگەڵ دەکەم، بەڵام ناچار وتم خواتان لەگەڵ ســـەربەرزی دنیاو قیامەت بن، کە سەرم بەرز کردووە نەمابوو.

کۆتایی کتێبی دووەم
چاوەڕوانی سـەرەتایەکی نوێ بن لە کتێبی سـێیەم دا، بەپشـتیوانی خوای پەروەردگار.

بەکۆتا گەیشت کتێب،
بەڵام ڕووداوەکان بەردەوامن

# ناوەڕۆک



ئامانجی نووسەر لەنووسینی ئەم پەرتووکە ئەوەیە کە چەواشەکاریی و درۆو خورافیات لەسیحرو جادوبازی و کاری شەیتانەکان جیابکرێتەوە.
لەکتێبی یەکەمی مەملەکەتی شەیتاندا نووسەر زیاتر باسی ئەو رووداوانە دەکات کەچۆن ئاشنا بووە بەجیهانی جنەکان و چۆن پەیوەندیی دروست بووە لەنێوانیاندا.
لەبەشی یەکەمدا خوێنەر ئاشنابووە بەشێوازی چوونە ناوەوەی جنەکان بۆ لاشەی مرۆڤ و چۆنێتی دەرهێنانی، هەروەها باسێکی کورتی ئەو گروپ و رێکخراوو مەزهەبانەی کە لەپەرتووکەکەدا ناویان هاتووە روونبکاتەوەو فێرمان بکات ئەوانە کێن و خەریکی چین لەرابردوو ئێستاشیاندا.
لەوبەشەی کە باسی جنۆکەو چوونە ناو لاشەی مرۆڤ دەکات، نووسەر هەوڵیداوە زانستیانەو واقیعیانە لەڕووی مەیدانییەوە کەخۆی ئەزموونی هەبووە تێیداو راوبۆچوونی زانایان و پسپۆڕانی لەسەر وەرگیراوەو گونجاوە لەگەڵ قورئان و سوننەتدا، باس بکات.
لەکتێبی دووەمی مەملەکەتی شەیتاندا نووسەر هەوڵی ئەوەی داوە کەجۆری سیحرو جادوو روونبکاتەوەو شێوازی بەتاڵکردنەوەکەی باس بکات، تا خوێنەر سوودی لێ ببینێت و لەڕووبەڕووبوونەوەی هەر حاڵەتێکی لەو شێوەیەدا بزانێت چۆن چارەسەری بکات.
لەکتێبی سێیەمدا نووسەر هەوڵی تەواوی داوە کە ئەو کەموکوڕیانەی لەکتێبی یەکەم و دووەمدا هەبووە پڕبکاتەوەو واقیعیانەترو زیاتر لەڕووی مەیدانییەوە کەخۆی بەشێک بووە لەڕووداوەکان، نیشانەکان و شێوازی چوونە ناو لاشەی جنەکان و دەرهێنانیان و ئەو ئەزێت و ئازارەی کە مرۆڤەکان دەیبینن بەدەستی ئەوان روون بکاتەوە.

# مەملەکەتی شەیتان



حاجی قادری کۆیی





لقی یەکەم: بەرامبەر دەرگای قەڵا - بازاڕی ڕۆشنبیری
لقی دووەم: چوار ڕیانی شێخ مەحمود بەرامبەر مزگەوتی محمود عەلاف